# بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد

## لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە

بەرگی شەشەم


محەمەد عەلی قەرەداغی

ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کوردستان

# بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد

## لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە

بەرگی شەشەم

محەمەد عەلی قەرەداغی

ئەندامی کۆڕی زانیاری کوردستان

کتێب: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە - بەرگی شەشەم
دانانی: محەمەد عەلی قەرەداغی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣١٦
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣١٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

# پێشەکی

**حوجرە و مەدرەسە:**

لەم بەرگەیشدا، بەیارمەتیی خودا، وەک بەرگەکانی پێشوو، سەرێک لە حوجرە و مەدرەسەکانی کوردستان دەدەینەوە و، ناوی ئەو مەدرەسانە تۆمار دەکەین کە لە بەرگەکانی پێشوودا ناویان نەهاتووە و، پێشتر پەیمان پێ نەبردوون و دەستمان پێیان نەگەیشتبوو.

بەڵام دەبێ بەسەر ئەوەدا نەڕۆین کە لەم ماوەدا پاش گۆڕانی بارودۆخی وڵات و گۆڕ بەگۆڕبوونی ڕژێمی دیکتاتۆریی، گۆڕانێک بەسەر کەشوهەوای نووسینیشدا هات کە سووچێکی ئەم پرۆژەی منیشی گرتەوە.

پێش ئەم گۆڕانکارییانە ناوی (کەرکووک) لە شتە (بڤە)کان بوو و، ناوهێنانی لەڕووی کوردایەتیی شار و ناوچەکەوە مایەی ئەوە بوو سەری ئەو کەسە تێدا بچێت کە شتی وا بەدەست و قەڵەمیدا بێت. منیش لەبەر ئەو ترس و چارەنووسەدا هەرچەند ناوی کەرکووکم لە سەرچاوەکاندا دیبێت و، ناوی مەدرەسەکانی شاری کەرکووک و مامۆستاکانیم بەسەردا تێپەڕی بێت، چاوم نووقاندووە و -بەناچاریی- ئەو ناوانەم بواردووە، بەڵام خۆشبەختانە ورەم بەرنەدابوو و، هەر ناوێکم لەو ناوانە دیبایەت بەیەکجاریی پشتگوێم نەدەخست و، هیوا بڕاوی ئەوە نەبووم کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بتوانم سوودێک لەو بابەتانە ببینم[1].

سوپاس بۆ خودا ئەو ڕۆژەم بەچاوی خۆم بینی بەئازادیی باسی کەرکووک و حوجرە و مەدرەسە و مەلای کوردی کەرکووک بکەم.

لەم بەرگەدا ڕەنگدانەوەی تایبەتیی حوجرە و مەدرەسەی کەرکووک بۆ ئەم باسە دەگەڕێتەوە و، قەرەبووی ناونەبرانی کەرکووک لە بەرگەکانی دیدا لێرەدا دەکرێتەوە.

لەم بەرگەدا لەبەر کەرکووک و بۆ دەرخستنی پێناسەی تایبەتیی کەرکووک و خستنە بەرچاوی قەوارەی مەدرەسە و فەقێ و مەلای کوردی کەرکووکی وام بەباش زانی کەرکووک بکەم بەسەرباسێکی تایبەتی و، بەپێچەوانەی بەرگەکانی دییەوە پەیڕەوی وردی زنجیرەی

---

(١) لەتەک ئەمەیشدا خۆشبەختانە خودا یارمەتی دام لەو ناو و سەرچاوانە کتێبێکی خنجیلانە پێک بهێنم لە ڕۆژنامەی (التآخي)دا بەزمانی عەرەبی بەزنجیرە لە مانگی ٢٠٠٣/٨دا لەژێر ناونیشانی (هوية كركوك الثقافية)دا ٢٢ ئەڵقەی لێ بڵاوبووەوە و دوایی بوو بەکتێب بەناونیشانی (هوية كركوك الثقافية والادارية) لە دەزگای ئاراس بڵاوبووەوە.

پیتەکانی هیجا نەکەم و، هەموو مەدرەسەکانی کەرکووک لەژێر ناونیشانی کەرکووکدا جێ بکەمەوە. واتە ئەگەر سەرەتای ناوی مەدرەسەکە پیتی (س) بێت یان پیتی (ز) یان هەر پیتێکی دی بێت هەر لە باسی کەرکووکدا دەینووسم.

بەڵام بۆ ناوی مەدرەسەکانی دی پەیڕەوی هەمان ڕێبازی پێشوو دەکەم و، ئەوانم چۆن نووسیوە لەم بەرگەیشدا وا دەڕۆم.

ئەوەندەیش بۆ خوێنەری ئازیز ڕوون دەکەمەوە: لە ئەنجامی هەوڵی گەرم و سەرومڕمدا بۆ دۆزینەوە و دەستخستنی زانیاریی نوێ بۆ کارەکەم لە دوای دەرچوونی بەرگی پێنجەمەوە چەند زانیاریی نوێم لە چەند سەرچاوەی جیاجیادا، جگە لە (د.ع) و شوێنەکانی پێشوو دەستکەوتووە، وام بەپێویست زانی خوێنەری ئازیزیان بۆ لا ڕێنومایی بکەم، تا ئەگەر نیشانەیەکی نوێی هاتە بەرچاو بزانێت مەبەست چییە.

یەکەم: ٤٤ یان هەر ژمارەیەک کە ٤٤ی بەسەرەوە بوو مەبەست کتێبخانەیەکی تایبەتیی کوردستانە.

دووەم: ١/ح یان هەر ژمارەیەک (ح)ی لەتەکدا بوو مەبەستم ئەو دەستخەتانەیە لای برای ئازیزم مامۆستا حیسامەدینی کوڕی مامۆستای مەلا عەبدوڵڵای قەڵاتێ لە هەولێر دیومن و زانیاریم لێ وەرگرتوون.

سێیەم: ١/ع یان هەر ژمارەیەک یەک (ع)ی بەدواوە بوو مەبەست ئەو دەستخەتانەیە لەلای مامۆستا مەلا عوسمانی (مفتش) لە ئەوقافی سلێمانیی دیومن و، ڕێگەی داوم سوودم لێ وەرگرتوون.

چوارەم: ١/عع یان هەر ژمارەیەک دوو (ع)ی بەشوێندا هات ئەوە مەبەست ئەو دەستخەتانەیە لای بەڕێز مامۆستا عەبدوڵڵای عەوینە لە هەولێر دیومن و ماوەی ئەوەی داوم سوودم لێ وەرگرتوون.

لە باسی کەرکووکدا دەبێ ئەوە نەبوێرم کە چەند کەسێک دەستخەتیان کۆکردووەتەوە و پاراستوویانە و، دوایی گەییوونەتە (د.ع) لە سەرووی ئەو کەسانەوە مەلا سابیری کوڕی حافیز مەلا محەممەدی کەرکوکی ناوی زۆر دیارە و، بەشێکی دەستخەتەکانی کە لە ٤٠٠ چوارسەد دەستخەت زیاترن بەژمارەکانی ٢٣٦٤-٢٧٦٩ لە (د.ع)دا لەنگەریان گرتووە.

لە ڕێگەی (سەلاحەدین ساقی وەلی)شەوە کۆمەڵێک دەستخەت هاتنە (د.ع). مەلا سابیر دانراوێکی هەیە بەزمانی تورکیی بەناوی (درویشلک) بەژمارە ٧١٥٥ پارێزراوە.

# مەدرەسەکانی کەرکووک

## مەدرەسەی حاجی ئەحمەد ئاغا

٥١٨٠ فرائض المنهج

محەممەدی ناسراو بەفائیز کوڕی سولەیمانی کوڕی محەممەد ڕۆژی دووشەممەی مانگی ذیلقەعدەی ساڵی ١٢٨٧ لە شاری کەرکووک لە مەدرەسەی حاجی ئەحمەد ئاغا کەمامۆستاکەی تاقانەی چەرخی خۆی مامۆستا مەلا ئەحمەدی ناسراو بە (ناجی) بوو نووسیویەتیەوە. شتێک لە نووسینەکە شێوێنراوە، لەدواییدا نووسراوە: چوار مانگە لە بەغدایە، خودایە بیگەیەنە بەئاواتی و بەخۆشی و بەسەلامەتی بۆمانی بگێڕەوە.

٤٣٩٣٩ عەبدوڵلا یەزدی

مەحموودی دارەشمانەیی کوڕی محەممەد بەگ ساڵی ١٣١٤ لە شاری کەرکووک لە مزگەوتی ئەحمەد ئاغا نووسیویەتیەوە.

٩/ع ع سێ دانراوی تێدایە:

١- شەرحی (مسألة العلم)ی عەبدولحەکیم، دانراوی شێخ عەبدولقادری سنەیی.

٢- رسالة خلق الافعال. دانراوی جەلالەدینی دەووانیی.

٣- حاشیەی شێخ عەبدولقادری موهاجیر بەسەر نامیلکەی (خلق الافعال)ی دەووانیەوە.

ئەحمەدی ناوبڕکەیی ساڵی ١٣٢٧ لە مزگەوتی ئەحمەد ئاغا لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

## مەدرەسەی خضری

٤٣٨٨٤ المطول

عەبدوڵلای کوڕی مەلا سولەیمانی کوڕی مەلا مستەفای (خضری) ساڵی ١٢٥١ لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٢٠٥٩٠ قاضی!

حەسەنی کوڕی سولەیمانی شەڵماشیی ساڵی ١٢٧٥ لە شاری کەرکووک لە مەدرەسەی

مـەلا عـەبدوڵڵای (خـضـری) لە گـەڕەکی قـۆریە لە ٢٧ی ڕەمـەزانی سـاڵی ١٢٧٥دا نووسیویەتیەوە.

شایانی باسە دەسـتخەتـی ٢٠٥٩١یش هەمان مامۆسـتا -حەسەنی کـوڕی سـولەیمان- سـاڵی ١٢٦٨ لە کـۆیە لە خزمـەتی گـەورەی چەرخی خـۆی مـەلا مـحـەممەدی کـوڕی مـەلا یونسدا نووسیویەتیەوە.

١٨٥٣٥ عەبدوڵڵای جەلەمۆردیی

ساڵی ١٣٢٠ لە خانەقای شێخ خدر لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٨٥٣٢ شەرحی تەفتازانی

عەبدوڵڵای کوڕی مەلا مستەفای جەلەمۆردیی ساڵی ١٣٢٥ لە خانەقای شێخ خدر لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٨٥٣٤ تەصریفی مەلا عەلی

عەبدوڵڵای کوڕی مەلا مستەفای ناسراو بەجەلەمۆردیی ساڵی ١٣٢٦ لە خانەقای شێخ خدر نووسیویەتیەوە.

هەروەها دەستخەتی ژمارە ١٨٥٣٢یش.

١٦٧٩٢ العقد الجوهری فی الفرق بین قدره العبد وکسبه دانراوی مەولانا خالید

عەلی کوڕی حەسەنی ناسراو بە (شوی) ساڵی ١٣٢٧ لە مزگەوتی مەیدان لە خزمەتی بەڕێز مەلا خدری هەورامید نووسیویەتیەوە.

١٦٨٤٧ حاشیة علی الخیالي

عـەلی کوڕی حـەسـەن سـاڵی ١٣٣٢ لە خزمـەتی مـامـۆسـتـا مـەلا خـدری هەورامـیـدا لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٢٠١٦٠ الاجرومیة

حـاجی قـەرەداغــیی لە مــەدرەســەی مـەلا عـەبدوڵڵای (خـضـری)دا لە کـەرکـووک نووسیویەتیەوە.

## مەدرەسەی جەبارییەکان

٣٦٣٤٩ رسالة في المنطق

سەید محیّدینی کوڕی سەیید عەبدوڕەحمانی جەباریی ساڵی ١٢٥٩ لە مەدرەسەی (مسلّم) لە کەرکوک لە خزمەتی مەولانا مەلا محەممەدی کەرکووکیدا نووسیویەتیەوە.

١٤٣٣٧ شرح المغني

دانراوی مامۆستا مەلا محەممەدی کوڕی عەبدوڕەحیمی میلانیی، ئەحمەدی کوڕی سەید محەممەدی جەباریی ساڵی ١٢٦٧ لەبەر خاتری مامۆستا مەلا مەحموودی کوڕی وەلی لە مەدرەسەی سەید محەممەد لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٨٤٣٧ سەعدوڵلای گەورە

ساڵی ١٢٧٠ مەدرەسەی سەیید محەممەدی جەباریی لە کەرکووک نووسراوەتەوە، دەستێکی چەپەڵ ناوی نووسەرەوەکەی شێواندووە.

٥٨٤٧ حاشیه المسعودی

مەحموودی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەحموودی کوڕی ئیبراهیم -لە شەودا- لە شاری کەرکووک ساڵی ١٢٧١ لە خزمەتی سەید محیّدینی -جەباریی-دا لە مەدرەسەی قازیی عەبدولغەنی نووسیویەتیەوە.

٢٠٥٠٨ کۆمەڵێک دانراوە

محەممەدی کوڕی مەحموودی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ڕەسووڵی ناسراو بە (ئاکوکویلی) لە شاری کەرکووک لە مەدرەسەی قازیی عەبدولغەنی ساڵی ١٢٧٢ لە خزمەتی سەید محیدینی جەبارییدا نووسیویەتیەوە.

٦٨٨٩ سراج القلوب

عەبدولعەزیزی کوڕی جیهانگیر ساڵی ١٣٠٠ لە مزگەوتی (مسلم) لەبەر خاتری مەلا محەممەدی جەباریی نووسیویەتیەوە.

٣٣٣٦٥ حاشیەی پێنجوینی بەسەر عەبدوڵلا یەزدییەوە:
محەمەد صاڵحی جەباریی ساڵی ١٣٣٢ لە شاری کەرکووک لای مامۆستا مەلا سولەیمان سالم نووسیویەتیەوە.

**مەدرەسەی نەبی دانیال**

٣٠٦٦ عیسامەدینی وضع
محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی مستەفای کانی هەنجیریی ساڵی ١١٥٩ ڕۆژی پێنج شەممەی ڕەبیعولئەوەلی پیرۆز لە مزگەوتی (الانبیاء) -لەوانەیە مەبەستی مزگەوتی نەبی دانیال بێ- لە شارۆچکەی کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٢٤١٥
ئەم دەستخەتە دەروێش محەممەدی کوڕی مەحموودی سابوونچیی ساڵی ١٢٤١ لە مزگەوتی نەبی دانیال نووسیویەتیەوە.

١٣٩٤٧ عبداللطیف علی أولوغ بیگ
لەوانەیە عەبدولەتیفی قەرەداغیی بێت.
حسێنی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی یوسفی کوڕی ئیبراهیمی دەشتیی ساڵی ١٢٧٥ لە مەدرەسەی حەزرەتی دانیال لە خزمەتی مامۆستا مەلا ئوەیسی عەسکەریدا لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٥١٦٠ عیصامەدینی وەضع
پاش نوێژی عەسری ڕۆژی ١٦ی مانگی ڕەبیعەلئەوەلی ساڵی ١٢٣٦ بەدەستی عومەری کوڕی حەیدەر -مامۆستا مەلا عومەر عەسکەری-ی کوڕی میرزا عەلی لە خانەقای ناسراو بە (دار العلم) لە کەرکووک نووسینەوەی تەواوبوو.

٥٠٦٤ شرح کمال علي الشافیة
عومەری کوڕی حەیدەری کوڕی میرزا عەلی کوڕی محەمەدی -عەسکەریی- لە کۆتایی مانگی سەفەری ساڵی ١٢٣٨دا دوای چاکبوونەوەی لە نەخۆشیی و لە سەردەمی ڕۆیشتنی مەحموود پاشادا بۆ لای شازادەی تەبریز، لە شاری کەرکووک نووسیوبەتیەوە.

ئەم دەستخەتە ٥٤٤ لاپەڕەیە هەمووی بەخەتی خۆیەتی لەسەری نووسیوە: «وقفت جميع كتابي علي جميع الطلاب قبل موتي بعشرة أيام».

١٣٨٧٢ المحرر

ساڵی ١٢٧٤ لە مزگەوتی مەولانا عومەری عەسکەریی لە شاری کەرکووک نووسراوەتەوە.

٣/ع تەصریفی مەلا عەلی

سەیید محەممەدی کوڕی سەیید ڕەسووڵی کوڕی سەیید ئەحمەدی ئیمامی تەکیەیی[١] ساڵی ١٣١٢ لە کەرکووک لە گەڕەکی شاترلو لە خزمەتی مامۆستا مەلا محەممەد نووریی عەسکەرییدا نووسیویەتیەوە، لە هەندێ شوێنیدا دەڵێ: لە مزگەوتی بابا عەلی لە سلێمانیی نووسیویەتیەوە.

٤٢٤١٥ ربع العبادات

ساڵحی کوڕی ئەبوبەکری قەیتوولیی ساڵی ١٢٧٤ لە مەدرەسەی مەولانا عومەری عەسکەریی لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

**مەدرەسەی مەلا عەلی حیکمەت**

٧٧٢٤ قول أحمد

ئەحمەد عیزەتی کەرکووکی کوڕی محەممەدی کوڕی شەمسەدین دوای عەسری ڕۆژی جومعە لە مانگی موحەڕەم لە ساڵی ١٣٠١دا لە مزگەوتی ئەحمەد ئاغا لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەلی سیامەنسوورییدا نووسیویەتیەوە.

١٥٩٢٠ شرح تشريح الافلاك دانراوی مامۆستا مەلا حسەینی پشدەریی

مامۆستا مەلا عەبدوڵلای کوڕی شێخ ئەحمەدی سەڵەنی ساڵی ١٣٢٦ لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەلی سیامەنسووریی -مەلا عەلی حیکمەت-دا نووسیویەتیەوە.

(١) ئەم مامۆستا باپیرەمە لە سەری دایکمەوە.

٤٣١٨١ (رسالة الحساب)ی بەهادینی عامیلیی
ئەحمەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی باداوایی لە شاری کەرکووک لەلای مامۆستا عەلی حیکمەت ئەفەندیی نووسیویەتیەوە.

**مەدرەسەی مەزناویی**

٥٤٠٦ کۆمەڵێک دانراوە، لەوانە: هۆنراوەی عەوامیلی جورجانیی مامۆستای نۆدێیی و، هۆنراوەی قزڵجیی. محەممەد سەدیقی کوڕی مەلا عەبدولقادری پیریادیی ساڵی ١٣١٢ لە مەدرەسەی مەلا محەممەدی مەزناویی لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٩١٢٢ الکفایة، دانراوی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای بێتووشی.
خدری کوڕی خەلیفە مەلا ئەحمەدی ناسراو بە بەشیر لە مزگەوتی نائیب ئۆغلیی لە خزمەتی مەلا محەممەدی مەزناواییدا لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

**ئەو مەدرەسانەی یەک جار ناویان هاتووە**

٢٦٣٨ ق تنبیه الغافلین من احادیث النبوي
زەینەلعابیدینی کوڕی مەلا حاجی کوڕی تاجەدین کوڕی محەممەدی ئەردەڵانیی ڕۆژی ٢٥ی مانگی زیلقەعدەی ساڵی ١١١٧ لە شاری کەرکووک نووسیویەتییەوە.

٢٨٨٣٨ د.ع الاعلام بقواطع الاسلام
دانراوی ئیبنو حەجەر، ئەحمەدی کوڕی سەید عەبدولجەباری، کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەرکەیی لەبەر خاتری مام و مامۆستای شێخ محێدینی کوڕی شێخ حەسەنی گڵەزەدەیی ساڵی ١١٨٨ لە شارۆچکەی کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٦٨٦٠ کنز الدقائق
عومەری کوڕی حەسەنی کوڕی ئەحمەد ساڵی ١١٢٥ لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٥٨٢١ میر ابو الفتح
عیسای کوڕی حەمزە ساڵی ١١٣٤ لە مەدرەسەی مەولانا بەکر لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

۲۰۶۲۹ نامیلکەیەکی ناتەواوە لە زانیاریی نەحودا

محەممەدی کوڕی خدری کوڕی ئەحمەدی ناسراو بەقەهرابادیی موکریی لە گوندی کەرکووک ساڵی ۱۱۳۵ لە مەدرەسەی حەمزە ئەفەندیی نووسیویەتیەوە.

٤۲۲۱۹ عەبدولغەفوور بەسەر جامییەوە

یوسفی کوڕی مەلا شەریفی کوڕی مەلا ئەحمەد ساڵی ۱۱٦۲ لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

۱۷٥٦۹کۆمەڵێک دانراوە:

محەممەد ئەمینی کوڕی سولەیمان ساڵی ۱۱۷۰ لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

۲/۱۳۷۷۹ لە کۆتایی کتێبی الصواعق المحرقەوە کە ساڵی ۱۱۹٥ لە شاری کەرکووک نووسراوەتەوە پارچەیەک شیعری فارسیی نووسراوە، ناوی شاعیرەکە دڕاوە. دەڵێ:

... فرماید ... قصیده فارسیرا در تاریخ مدح و ثنایی سلالهء پاشای بابان

محمد پاشا سلالهء خالد پاشا
بحمدالله کەبر رغم زمانه
فگنده پرتو از برج شهانه
فروزان اختری چون ماه تابان
پی بوس رکابش شد شتابان

کۆتاییەکەی:

پی تأریخ آن فرزانه فرزند
ضمیرم بادقایق گشت پیوند
ز تأریخش ید ناظم شود پر
زد و گوهر شها شاهانه این در
۱۱۸۱

٢٧٢٩٩ شرح الحكمه وطب الرحمه

دانراوی ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەد. ئیبراهیمی کوڕی سەید قاسمی بەرزنجی لەبەر خاتری ئیسماعیل ئاغا لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

دانەرەکەی سالّی ١٢٠٣ دایناوە.

٧٢١٢ د.ع النهجة المرضية

عەبدولغەفووری کوڕی مەلا مستەفای کوڕی مەلا عەبدوڵلای واعیز لە کەرکووک کوڕی محەممەد کوڕی مەنسووری کوڕی خوداداد لە ١٨ی ڕەمەزانی سالّی ١٢٠٤ [دەڵێ]: لەبەر سەرقاڵیی و ناجۆریی ژیان سالّێک یان زیاتر لەوەوپێش نیوەیم لە گوندی هەزارمێرد نووسیبووەوە، دوای ئەوە بەیارمەتیی خودا نیوەکەی دیم لە شاری کۆیە لە خزمەتی زانای پایەبەرز و تاقانەی بێ وێنە و پیاوچاک و لە خوداترس و پەنای هاوەڵان و دۆستان و شارەزای بابەتە ئاشکرا و شاراوەکان مەلا عەبدوڕەحمانی جەلیدا نووسیەوە.

٢١٨٣٢ شرعة الاسلام

ئیبراهیمی کوڕی خەلیل سالّی ١٢١٤ لە مزگەوتی (عیاباد) لە کاتی بڵاوبوونەوەی چاوەقووڵەدا لە کەرکووک نووسیویەتیەوە. لەو کاتەدا کە مەلا ئیبراهیمی عەبدولکەریم زادە لەلای بووە.

مامۆستا دەفەرموێ: کە دەرسی سوورەتی (البقرة)ی تەفسیری (ابو الليث)ی بەمەلا عەبدولقادرە کۆستە گوتووە.

١٨١٨٣ فرائض

ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحموودی سالّی ١٢٥٠ لە مەدرەسەی مەلا عەبدولفەتاحی کەرکووکی نووسیویەتیەوە.

١١/أ ٤٤ (الكفاية)ی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای بێتووشی

ئەحمەدی ئەڵەبجەیی سالّی ١٢٢٧ لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٧٦٦٤ حدائق الدقائق

خدری کوڕی مورتەزای کوڕی ئیلیاس سالّی ١٢٣٠ لە خزمەتی مامۆستا مەلا مەحموودی ناسراو بەشێخ پاڵەوانیدا نووسیویەتیەوە.

١٦٠٥٦ اعلال التصريف

دانراوی مامۆستا مەلا یوسفجانی کوڕی مەلا ئەبوبەکری موسەنیف عوسمانی کوڕی مەحموودی کوڕی مستەفای قاقا لە هۆزی (سکید) عەلەمدار ساڵی ١٢٣٦ لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٩٤٥٢ کۆمەڵێک دانراوی تێدایە

محەممەد ئەمینی کوڕی نەبی ئاکۆ ساڵی ١٢٧٧ لە سەردەمی زیندانیکردنی مەحموود ئاغای کۆیی و کوڕانیدا لە کەرکووک - لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٤٣٧٤٠ شرح المغني

دانراوی محەممەدی کوڕی عەبدوڕەحیمی میلانیی.

عەلی کوڕی محەممەد ساڵی ١٢٦٥ لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٦٦٣٨ فرائض

فەیزوڵلای کوڕی خودا موڕادی کوڕی حەیدەر ساڵی ١٢٧١ لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٦٩/ع حاشیەی قەرەباغیی

مەحموود لە مەدرەسەی... لە شاری کەرکووک ساڵی ١٢٧١ نووسیویەتیەوە.

١١٩٥٢ شرح المغني

دانراوی محەممەدی کوڕی عەبدوڕەحیمی میلانیی.

عەبدوڵلای کوڕی دەروێش ساڵی ١٢٧٢ لە مەدرەسەی مەلا ئەمین لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٥٩٧٩ حاشیه عبدالغفور

فەیزوڵلای کوڕی خودا موڕادی کوڕی پیر وەیس کوڕی عەلی کوڕی محەممەد ساڵی ١٢٧٣ لە مەدرەسەی عەبدولغەنی ئەفەندیی نووسیویەتیەوە.

١٥٣٤١ هۆنراوەی (ذات الشفا)ی ئیبنولحاج
حسەینی کوڕی حەمزە ساڵی ١٢٨٤ لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٢١٥١ق کتێبێکی صەرف
سەدیقی کوڕی مستەفای کوڕی محەممەدی عوسمانیی شافیعیی ساڵی ١٢٩٨ لە مزگەوتی گەورەی کەرکووک نووسیوبەتیەوە.

١١٨٤٠ زواهر اللغة
دانراوی مامۆستا مەلا مەحموودی جوانڕۆیی.
شێخ مەحموودی کوڕی شێخ عەبدوڕەحمانی شۆڕیجە ساڵی ١٢٩٨ لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٦٤٣٤ و ١٦٤٣٥
هەردووکیان - ناوی کتێبەکانم نەنووسی بوو- محەممەد صاڵحی کوڕی فەقێ عەبدولقادری کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا یوسفی ئێلْجاخیی ٢٠ی موحەڕەمی ساڵی ١٣٠٠ لە خانەقای شێخ عەبدولقادر لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٥٧٦٠ شەرحی (تشریح الافلاک)ی مامۆستا مەلا حسەینی پشدەری
عەبدوڵلای کوڕی حەسەنی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەد ٢٩ی ڕەمەزانی ساڵی ١٣١٨ لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٢٠٦ س/١
چەند دانراوی تێدایە، لەوانە ئیظهاری بەرکێویی، ئەحمەدی کوڕی وەستا خدری دارتاش بێژۆیی ساڵی ١٣١٩ لە شاری کەرکووک (دی کرکوک) نووسیویەتیەوە.
نامیلکەی وضع هەمان نووسەرەوە لە شاری سلێمانیی لە مزگەوتی شێخ محەممەدی بەرزنجیی لە کاتی مەلا عەلی تائیدا.

١٣٨٨٣شەرحی ریسالەی وەضع
دانراوی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای شێخ مەحموودیی.

عومەری کوڕی عوثمان لە شاری کەرکووک لە خزمەتی مامۆستا مەلا محەممەد تاهیری کەرکووکیدا ساڵی ١٣٢٠ نووسیویەتیەوە.

٣٦٣١٣ مختصر المعانی

مەلا ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی لەدایکبووی شاری کەرکووک و لە بنەچەدا خەڵکی شێخ بزەینی ساڵی ١٣٢١ لە مزگەوتی (اولی جامعة) نووسیویەتیەوە.

ع،ع/ ٥ سێ دانراوی تێدایە:

١- رسالة العروض: دانراوی شێخ مەعرووفی نۆدێیی.

محەممەد ساڵح ساڵی ١٣٢٠ لەبەر خاتری مەلا عوثمانی خورمڵەیی نووسیویەتیەوە.

٢- رسالة الحساب: دانراوی بەهادینی عامیلی.

محەممەد عەلی کەپنەک ڕەش لەبەر خاتری مەلا عوسمانی خورمڵەیی ساڵی ١٣٢٦ لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

٣- بیان نسب القضایا: دانراوی عەبدوڵلای کوڕی حەیدەر.

١٨٥٣٨ تەصریفی مەلا عەلی

عومەری کوڕی ئەبوبەکری کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مام شین ساڵی ١٣٢٢ لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٧٧٠٩ الماردینیه فی العمل بالربع المجیب

عەبدولکەریمی کوڕی محەممەد ساڵی ١٣٤٢ لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٨٦٠٥ شرح المغنی

دانراوی محەممەدی کوڕی عەبدوڕەحیمی میلانی.

فەقێ محەممەدی شوکری کوڕی دەروێش مەحموود ساڵی ١٣٧٩ لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

١٧١٣٤ شەرحی تەشریحی ئەفلاکی مامۆستا مەلا حسەینی پشدەریی

لە کەرکووک نووسراوەتەوە.

٣٦٣٨٣ نامیلکەی وەضعی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری میر ڕۆستەمی
مووسای کوڕی عیسا لەبەر خاتری مەلا عەبدولکەریم لە شاری کەرکووک نووسیویەتیەوە، لە خواریەوە نووسیویە:

یا حەق بەحاجەت ئەحمەد موختار

ببەخشی مووسا عاصیی عیصیان بار

١/١٩٢٤٦ قەرەباغیی:
ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم لە قەڵای کەرکووک لای مامۆستا مەلا عەبدورەحمان نووسیویەتیەوە.

(لەوانەیە مامۆستا مەلا عەبدوڕەحمانی ڕۆژبەیانیی بێت).

٢٥٥٦ شەرحی عەقائید
عەبدوڵڵای کۆیی ساڵی ١٩٣١ لە مزگەوتی موفتیی ئەفەندیی نووسیویەتیەوە.

٢٩٠٣ مقدمة في علم الحساب
مستەفای کوڕی ئەحمەی گۆرانیی لە مەدرەسەی مەلا عەلی زادە لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.

# حوجره و مەدرەسەکانی دی

## پیتی ئەلف

٦٨/٢/ع گەلەنبەویی شەرح
حسەینی کاژاویی ساڵی ١٣٠٣ لە شاری ئەربیل لە مەدرەسەی حاجی عومەر ئەفەندیی لە خزمەتی مامۆستا مەلا حەسەنی بانەییدا نووسیویەتیەوە.

٨/ع، ع تەصریفی مەلا عەلی
مامۆستا مەلا عوسمانی خورمڵەیی ساڵی ١٣١٢ لە شاری ئەربیل نووسیویەتیەوە.

٢٥/ع کۆمەڵێک دانراوی تێدایە بەم شێوە:
١- شافیەی ئیبنولحاجیب.
٢- الرسالة العضدية و شەرحی عیصامی بەسەرەوە.
ئەدیب و نووسەری ناسراوی کورد ئەمین یومنی ساڵی ١٣٢٣ لە مزگەوتی مەلا ئەمینی مام رۆستەم لە سلێمانیی نووسیویەتیەوە.
٣- قزڵجیی بەسەر جامییەوە، هەمان مامۆستا نووسیویەتیەوە.
٤- قزڵجیی بەسەر تەصریفی مەلا عەلییەوە.

ع/١ گەلەنبەویی ئاداب
عوبەیدوڵڵای کوڕی سەید یەحیای کاژاویی لە خزمەت بابا شێخدا ساڵی ١٣٤٧ لە گوندی (ئەڵمانە) نووسیویەتیەوە.

١١/٦/ع شیرین و فەرهاد بەهۆنراوەی گۆرانی
محەممەدی نۆتشیی ساڵی ١٣٤٩ لە حوجرەی ئەبوعەبەیدە -عەبابەیلێ- نووسیویەتیەوە.

١١/٢/ع عەقیدەی مەولەویی
محەممەدی نۆتشیی ساڵی ١٣٤٩ لە مانگی زیلحەجەدا لە گوندی ئەباعوبەیدە نووسیویەتیەوە.

## پیتی بێ

١٦/ع شەرحی تەصریفی مەلا عەلی

دانراوی مەلا پیرۆت، محەممەد ئەمینی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەدی هەنجیرەیی بەردەشانیی لە شارۆچکەی کۆیە لە مزگەوتی پلکە لە خزمەتی مامۆستا مەلا محەممەد تۆفیقدا ساڵی ١٣٣٠ نووسیویەتیەوە.

٣/٣٠/ع شەرحی قەوشەجیی لە نامیلکەی عەضودی

عوبەیدوڵلای کەمانتۆیی کوڕی میرزا عەبدوڵلای کوڕی حاجی عەبدولکەریمی کوڕی محەممەدی بانەیی ساڵی ١٣٣٥ لە گوندی بزورگ قەڵعە لەسەر شیوی سەقز نووسیویەتیەوە.

٦/٣٠/ع شیعری عەرەبی سەعدیی شیرازیی

عوبەیدوڵلای کەمانتۆیی ساڵی ١٣٣٥ لە گوندی بزورگ قەڵعەی سەر شیوی سەقز نووسیویەتیەوە.

١/٥٣/ع الرساله الحنفیه

ئەحمەدی کوڕی محەممەدی فەقێ عەلی مەشهوور بەنێوچەوانیی لە گوندی بیشاسب لە خزمەتی مامۆستا مەلا محەممەد سەعیدا ساڵی ١٣٥١ نووسیویەتیەوە.

١/٥٥/ع عصام الدین

محەممەدی دەرگا شێخانیی ساڵی ١٣٥٣ لە گوندی بناوە سووتە لە خزمەتی مامۆستایان مەلا محەممەد و مەلا ئەحمەددا نووسیویەتیەوە.

لەدوای ئەم کتێبەوە دوو پارچە شیعر و پارچەیەک شیعری عەبدوڕەحمانی تێدایە.

١/ح قورئانێکی دەستخەتی جوانە مامۆستا حسامەدین لە بنەماڵەی مەلا ئەحمەدی حەدادی وەرگرتبوو پیشانی دام. قورئانەکە لە گوندی بالیسان لە خزمەتی مامۆستا مەلا عیسادا نووسراوەتەوە. مێژووی نووسینەوەکەی دڕاوە، زەخرەفەکەی عەبدولکەریمی کوڕی (محلان) کردوویەتی.

نووسەرەوەکەی... کوڕی عومەر بووە.

## پیتی تێ

بەشێک لە (الانوار)

حەسەنی کوڕی شێخ عیسا ساڵی ١٢٢٧ لە مەدرەسەی تەوەکەڵ نووسیویەتیەوە، لە کتێبخانەی شێخ فاتیح قەرەداغییدا دیم.

٣/١/ح تەرکیبی عەوامیل، دانراوی سەیید، ساڵی ١٣٢٢ لە گوندی ترپەسپیان نووسیویەتیەوە.

ناوی نووسەرەوەکەی کووژێنراوەتەوە.

٥/ح وێنەی دەستخەتێکی بچکۆلەی کەشکۆڵ ئامێزە لای مامۆستا حیسامەدینە ساڵی ١٣٤٧ و ١٣٤٩ عەبدولکەریمی ترپە سپیانیی لە گوندی سسان! نووسیویەتیەوە.

بەرهەمی کۆمەڵێک شاعیر و دانەر و مامۆستای کوردی تێدایە لەوانە: نالی، کوردی، شێخ ڕەزا، ئەمین، هەوایی، وەهبی، راغیب، وەفایی.

- فەرائیضی قزڵجی.
- قەسیدەی طەنطەرانی.
- قەسیدەی وانی.
- قەسیدەی غەزالیی.
- نامیلکەیەکی مەلا عوسمانی (خورمڵی).
- شەرحی قەسیدەی نوونیـیەی شێخ نوورەدینی بریفکانی کە محەممەد نووریی قادری شەرحی کردووە. هەروەها قەسیدەی (بحر الحقائق).

٦/ع سەعدوڵلا - فیعلی سەعدوڵلا

یونس ساڵی ١٣٧٣ لە گوندی تۆپزاوە نووسیویەتیەوە.

## پیتی جیم

٣/٢/ح شەرحی عەوامیل

محەممەد ئەمین کوڕی عوسمان ساڵی ١٣٧٥ لە گوندی (جدیدة لك) نووسیویەتیەوە.

(وێنەکەی لای مامۆستا حیسامەدینە).

## پیتی حێ

کتێبخانەی ئەوقافی قادریە شەرحی قەسیدەی بوردییە
دانراوی محەممەدی کوڕی سەعدی کوڕی یوسفی ئالانیی.
زەینەدینی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شای ناسراو بەکەڵهوڕ لە مەدرەسەی مەولانا حەسەنی کوڕی ئیلیاس لە گوندی چناران ساڵی ١١٨٨ نووسیویەتیەوە.

## پیتی دال

١/٢/ح فەرائیضی شەرح مەنهەج
ساڵی ١٢٥٢ لە گوندی دەرگەڵە لە کاتێکدا کە سوپای ڕەشید پاشای وەزیری بەغدا هاتووەتە سەر محەممەد پاشای ڕەواندز نووسراوەتەوە.
(وێنەی دەستخەتەکە لەلای مامۆستا حیسامەدینە).

٦٠/١/ع (الکفایة)ی بێتووشی
قازیی زادە محەممەد لە گوندی دۆڵپەموو لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەزیزدا نووسیویەتیەوە.

## پیتی سین

٤١/ع هۆنراوەیەکی فیقهی عەرەبییە
دانەرەکەی نەزانراوە، ساڵی ١٨٧٧ دایناوە.
ساڵی ١٣٢٤ لە دەوروبەری سەردەشت کاتێ ناوچەکە کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیی نووسراوەتەوە.

١٠/ع، ع حاشیەی قزڵجی بەسەر تەصریفی مەلا عەلییەوە
خدری کوڕی ڕەسووڵی کوڕی محەممەد لە مەدرەسەی مەلا محەممەدی ڕەش لە گوندی (سی دلان) ساڵی ١٣٢٨ نووسیویەتیەوە.
لەپێش ئەمەیشەوە هۆنراوەی (شامل العوامل)ی شێخ مەعرووفی نۆدێییە هەمان نووسەرەوە لە شاری سابڵاخ نووسیویەتیەوە.

لەدوای ئەمەیشەوە چەند دانراو هەیە لەوانە (اجزاء القضیة) عەبدولعەزیزی سابڵاخی لە مەدرەسەی ڕۆستەم بەگ لەبەر خاتری مەلا عەبدوڵڵا ساڵی ١٣٢٨ نووسیویەتیەوە.

٢٣/ع دەستخەتێکە ئەم دانراوانەی تێدایە:

١- کشف الغوامض لقطر العارض.

لە شوێنێکدا دەڵێ: کاتێ نووسیمەوە کە (سالار الدولة) هاتبوو بۆ کوردستان.

٢- تەصریفی مەلا عەلی

محەممەد سەرنجماریی ساڵی ١٣٢١ لە فەرمانڕەوایی (سلطان الملک)دا نووسیویەتیەوە.

٣- نامیلکەی وەضع. ناتەواوە.

٤- نامیلکەی ئیستیعارە.

محەممەد سەرنجماریی لە شاری سنە ساڵی ١٣٢٤ نووسیویەتیەوە.

٥- عیسامەدینی ئیستیعارە.

محەممەدی سەرنجماریی لە گوندی (کلین) لە دەوروبەری شاری سنە نووسیویەتیەوە.

٦- سەمەدییە. لە کۆتاییەوە ناتەواوە.

لە سەرەتاوە هەندێک شیعری مەولەویی تێدایە.

٥٥/٤/ع حاشیەی مەلا ئەحمەدی گەرەویی

ئەحمەدی کوڕی سەیید محەممەد ئەمین کوڕی سەیید بابا شێخی کوڕی سەیید ئەحمەد ساڵی ١٣٢٩ لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پێنجەمی عەبدولڕەحمان پاشادا لە شاری سلێمانیی نووسیویەتیەوە. دوای ئەمەیش چەند پارچەیەکی دی شیعری مەولەویی دێن.

٦٠/٣/ع قەوشەجیی

عەلی کوڕی مەلا قادری کوڕی گەپلەیی ساڵی ١٣٣٣ لە گوندی سەردۆش بۆ خۆی نووسیوەتەوە.

٨٣/ع تەصریفی مەلا عەلی

محەممەد وەهبیی عوسمانیی ساڵی ١٣٤٢ لە شاری سلێمانیی نووسیویەتیەوە.

٥/ع سەعدوڵلای بچووک

ساڵی ١٣٤٥ ئەحمەدی کوڕی ئاوگرتەیی لە گوندی سەرگەڵوو نووسیویەتیەوە.

١١/٤/ع خورشید و خاوەر بەهۆنراوەی گۆرانیی

دانەرەکەی دیاریی نەکراوە. محەمەد نۆتشیی ساڵی ١٣٤٨ لە حوجرەی سۆڵەی چرچەقەڵا نووسیویەتیەوە.

١١/٥/ع سەما و زەمین بەهۆنراوەی هەورامی -گۆرانی-

محەمەدی نۆتشیی لە حوجرەی سۆڵەی چرچەقەڵا لە مانگی شەعبانی ساڵی ١٣٤٨دا نووسیویەتیەوە.

١/٧٤/ع چەغمینی

محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی خدری ناسراو بە (السکر) لە کاتی کوژرانی سەرۆکی مەنگوڕدا لە شاری سابلاخی ناحیەی موکرییدا نووسیویەتیەوە.

ع/٢ حاشیە بەسەر نامیلکەی وەضعەوە

ئەحمەدی مەریوانیی لە شاری سلێمانیی نووسیویەتیەوە.

٣/٤٦/ع محمدامین علیٰ جهه الوحده

حەیدەری کوڕی ئوستاد سە... کوڕی ئوستاد حسەینی کوردیی شافیعی قەرەداغیی ساڵی ١٢١٥ لە مەدرەسەی (الصیاغة) یان (الصاغة) لە خزمەتی مامۆستا مەلا ڕەسووڵی شەوەکیی حەریریدا نووسیویەتیەوە.

پیتی شین

٩٢/ع

دوو سێ پەڕە پەڕە و کۆتایی دەستخەتە ئەحمەدی (القصبي) لە گوندی (شختان) لای حەسەنی کوڕی محەمەد خدر نووسیویەتیەوە.

هەر ئەم مامۆستا لە کۆتایی حاشیەیەکی دییەوە دەنووسێ: لە گوندی شێخ مەنسوور نووسیویەتیەوە.

۲۰/ع کافیه

سولەیمانی شیوەیی کوڕی مەلا حەیدەری کوڕی مەلا سولەیمانی کوڕی مەلا محەممەد لە گوندی شیوە نووسیویەتیەوە.

پیتی عەین

۲/٤٦/ع قول أحمد

حەیدەری کوڕی... بوخاریی کوردیی قەرەداغیی ساڵی ۱۲۱٥ لە مەدرەسەی عادلیە لە بەغدا نووسیویەتیەوە.

٥١٨٥ تەصریفی مەلا عەلی

عومەری کوڕی حەیدەری (مکری) کوڕی میرزا عەلی لە حوجرەی گوندی عەسکەر لای مەلا مستەفای مامی ساڵی ۱۲۲۸ نووسیویەتیەوە.

٤٧/ع حسامکاتی

عومەری کوڕی عەلی تەوێڵەیی ساڵی ۱۲۸۲ لە مەدرەسەی مامۆستا مەلا عەلی قزڵجیدا نووسیویەتیەوە.

۲/٥٥/ع (الشامل للعوامل)ی شێخ مەعرووفی نۆدێ

ئەحمەدی کوڕی سەیید محەممەد ئەمینی کوڕی سەیید بابا شێخی عازەبانیی لە گوندی...[1] ساڵی ۱۳۲٦ نووسیویەتیەوە.

۳۳/ع منیحة الاحباب علي صفیحه الاسطرلاب.

دانراوی مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغی.

جەلالەدینی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ساڵحی کوڕی مەلا عوسمان لە خانەقای مەلا عوسمان لە شاری سلێمانی ساڵی ۱۳٥۹ نووسیویەتیەوە.

۳/۳٤/ع المسائل المختلف فیها بین الشافعی والحنفی

مەحموود نووسیویەتیەوە.

---

(۱) ناوی گوندەکە کووژێنراوەتەوە.

لە کۆتایی پەراوێزێکیشەوە نووسیویە: عەلی لە شاری بانە لە مەدرەسەی مەلا عەبدولکەریم نووسیویەتیەوە.

## پیتی قاف

۲۸/۷/ع حاشیەی محێدینی تالشیی بەناوبانگ بەحسامکاتی

محەممەدی کوڕی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدولەتیف ساڵی ۱۳۳۲ لە شاری قەرەداغ نووسیویەتیەوە.

۶۰/۲/ع شیعری تاهیر بەگ و بایەزید

محەممەدی کوڕی مەلا عەبدوڵلای نائیب لە ناحیەی قزلجە ساڵی ۱۳۳۲ نووسیویەتیەوە.

۵۳/۳/ع فەنناریی

ئەحمەدی کوڕی محەممەدی فەقێ عەلی ناسراو بەنەوچەوانی لە ناوچەی سۆسنێ ساڵی ۱۳۵۰ لە خزمەت مامۆستا مەلا سولەیمانی کاژیدا لە گوندی قوڕوچاوی سەر بەمامش نووسیویەتیەوە.

## پیتی کاف

ع، ع/۶

۱- عیسامەدین

مەلا عوسمانی خورمڵەیی ساڵی ۱۳۱۷ لە گوندی کۆزەپانکە نووسیویەتیەوە.

۲- سەید شەریف، عوسمانی خورمڵەیی ساڵی ۱۳۱۷ لە گوندی کۆزەپانکە.

۳- رسالة الوضع عەبدوڵلای کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانی کۆیی لەبەر خاتری مەلا عوسمانی خورمڵەیی نووسیویەتیەوە ۱۳۰۵.

٤- الاستعارة مەلا عوسمانی خورمڵەیی لە گوندی خورمڵە ساڵی ۱۳۱۶ نووسیویەتیەوە.

۵- شەرحی ئیستعارەی شێخ مەموودیی مەلا عوسمانی خورمڵەیی ساڵی ۱۳۱۶ لە گوندی خورمڵە نووسیویەتیەوە.

١٤/ع مەکتووباتی کاکە حمەدی شێخ

کۆمەڵێکی زۆر مەکتووباتی تێدایە محەممەدی کوڕی مەلا سولەیمانی زەنگیدەریی لە گوندی (کلبە) ساڵی ١٣١٦ و دوای ئەو نووسیویەتیەوە.

١٢/ع کتێبێکی فارسیی گەورە لە دوو بەشدا:

بەشی یەکەم: (کتاب البیع).

بەشی دووەم: (کتاب النکاح).

ساڵی ١٣١٧ لە گوندی (کانی دریلە) نووسراوەتەوە، نووسەرەوەکەی دیاریی نەکراوە.

## پیتی میم

٥٠/ع حاشیەی قزڵجی

محەممەد ئەسعەدی کوڕی مەلا محەممەدئەمینی هەواییی ساڵی ١٣٤٣ لە مزگەوتی مەولانا شێخ محەممەد نووسیویەتیەوە.

ع، ع/١ حاشیەی میرزاجان

عەبدوڵڵای سۆسنی زورانی کوڕی مەلا حسەینی... لە گوندی ماوەران نووسیویەتیەوە.

## پیتی نوون

٩/ح حاشیەی حەسەنی زێباریی بەسەر عیسامەدینەوە

محەممەد ساڵحی کوڕی مەلا سولەیمان ساڵی ١١١٧ لە گوندی نەمەشێر نووسیویەتیەوە.

١٥/ع ئەم کتێبانەی تێدایە:

١- تەرجەمەی (ذات الشفا) بەهۆنراوەی فارسیی.

٢- تەجویدی قورئان بەفارسیی.

دانراوی مامۆستا مەلا عەلی قزڵجی.

٣- فاڵنامە.

ڕەسووڵی کوڕی ڕۆستەمی کوڕی ئیسماعیلی بانەیی ساڵی ١٢٩٧ لە گوندی (نەیزەرۆ) نووسیویەتیەوە.

٢/٥٣/ع الدره المنجيه على العرائض القزلجيه
دانراوی مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغییە.
ئەحمەدی کوڕی محەممەدی فەقێ عەلی مەشهوور بەنێوچەوانیی ساڵی ١٣٥٢ لە گوندی نێوچەوان لە خزمەتی مامۆستا مەلا عومەری باساوییدا نووسیویەتیەوە.

٥٨/ع نامیلکەی وەضعی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری میر ڕۆستەمی
مستەفای بێتووشیی ساڵی ١٣٥٦ لە گوندی نوورەدین نووسیویەتیەوە.

پیتی واو

٩٣/ع حاشیەیەکە ئەحمەدی (القصبي) لە کوێستانی (وزنە) یان (عرزنە) لای عەبدوڵلای (رمک) نووسیویەتیەوە.
ئەم (القصبي)یە (قامیشی)یە و لە شوێنێکی دیدا دەڵێ: ئەحمەدی کوڕی عەباسی قامیشی شینکی نووسیویەتیەوە.

٤/ح شەرحی نامیلکەی وەضعی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری میر ڕۆستەمی،
شێخ نەبیی ماویلیی لە گوندی وەڵزو، بەشێکیشی لە گوندی چۆمان لەلای مامۆستا مەلا فەتحوڵلای باڵەکیی نووسیوەتەوە. ساڵی نووسینەوەی دیاریی نەکردووە.

پیتی هێ

١/٦٨/ع حاشیەی پێنجوینیی
سەیید سەعیدی کوڕی سەیید عەبدوڵلا لە گوندی هەرمند ساڵی ١٣٣٢ نووسیویەتیەوە.

٥٩/ع (نظم محاسن الغرر)ی ئیبنولحاج
محەممەدی حسەینی نێرگسەجاڕی ساڵی ١٣٧٢ لە شاری هەڵەبجە نووسیویەتیەوە.

# دەستپاکیی و ئەمانەت مەرجێکی سەرەکیی بڵاوکردنەوەی دەقە کۆنەکانە[١]

٣١٤

مەرجێکی سەرەکیی بڵاوکردنەوەی دانراو و دەقی کۆن پاراستنی مافی دانەرەکە و بەفیڕۆنەدانی ڕەنجیەتی. یان ڕوونتر بڵێین خیانەت نەکردن و خەمساردی نەکردنە لەوەدا کە هەوڵ بدرێت بۆ ئەوەی بەدروستیی ناوی دەقەکە بزانرێت و، بزانرێ کێ دایناوە و، کەی دانراوە و، لە کوێ دانراوە و، هەوڵ بدرێت دەقی پوخت و ڕاستی دانراوەکە بخرێتە بەر دەستی خوێنەران و ناو کتێبخانەوە. ئەگەر ئەم مەرجە -پێش هەموو مەرجێکی دی- پەیڕەویی نەکرێت ئەوا ڕەنجی گەلێ کەس بەزایە دەچێت و، سەردەرگومیی و ئاڵۆزییش لە هەوڵ و کۆششی گەلێ کەسدا ڕوو دەدات.

لەم ماوەدا کتێبێکی خنجیلانەم دی لەسەری نووسراوە:

(شرح تصریف الزنجاني للعلامة السید پیر خضر المعروف بالشاهوي)

ئەم ناونیشانەم بەلاوە سەیر بوو؛ چونکە نەمبیستووە ئەم زاتە -پیر خضری شاهۆ- مەلا چاک بووبێت و دانراوی هەبووبێت، ئەوەی دەربارەی زانراوە ئەوەیە پیاوچاکێکی سەردەمی خۆی بووە و، گەلێک کەرامەتی لێ گێڕراوەتەوە، ئیتر لە مێژووی ژیانیدا باسی دانراوی نەکراوە[١]. کە تۆزێک بەوردیی سەرنجی پێشەکی کتێبەکەم دا بینیم سەرەتاکەیم لە لا غەریب نییە و، وەک پێشتر دیبێتم وایە. کە زیاتر سەرنجی سەرەتای ئەم کتێبەم دا بۆم دەرکەوت ئەم کتێبە کتێبی مامۆستایەکی دییە و، سا بەهەڵە و نەزانیی، یان بەئارەزوو و بۆ بازرگانی کردن بەناوی (پیر خدری شاهۆ)وە سەرەتاکەی شێوێندراوە و، لەباتیی ناوی دانەری کتێبەکە ئەو ناوەی خراوەتە سەر.

دوای ئەمە گەڕامەوە بۆ لای ئەو بابەتانەی دەربارەی ئەم کتێبانە نووسیومن دەبینم لە بەرگی یەکەمی (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی

---

(*) ئاسۆی فۆلکلۆر - کاروان (١٤٧)، ٢٠٠٠.

(١) ئەم زاتە ناوی محەمەد زاهیدە و، نازناوی (ظهیرالدین) و بە (پیرخدری شاهۆ) ناسراوە. یەکێک بووە لە پیاوچاکە ناودارەکانی کوردستان و، لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا زیندەگانیی کردووە. باسی مەلایەتیی و دانراوی نەکراوە. (بڕوانە: مشاهیر کرد، بابا مردوخ روحانی شیوا، جلد اول، ل: ٦١، چاپ اول، ١٣٦٤، تهران خیابان استاد مطهری، نبش خیابان دکتر مفتح، ساختمان جام جم).

دەستخەتەکانیانەوە)دا[٢] باسی ئەم کتێبەم کردووە. دوای ئەو باسکردنەیش بەشێنەیی لە (د.ع)دا نوسخەگەلی جیاجیای ئەم دانراوەم دەسنیشان کردووە، تا ئەو نوسخانەی لای خۆم یاداشتم کردوون و لە لاپەڕە (٢١١)ی بەرگی دووەمی سەرچاوەی ناوبراودا هەندێ لە ژمارەکانیانم نووسیوە لە (٢٠) نوسخە زیاترن، لێرەدا بەکورتیی باسی هەندێکیان دەنووسین. لە کۆتایی دەستخەتی (١٥٦٥٥ د.ع)ەوە کە نوسخەیەکی ئەم کتێبەیە ئەمە دەخوێنینەوە:

«قد وقع الفراغ من تسويد هذه النسخة الشريفة المسماة باعلال التصريف في ليلة الأثنين في بلد كركوك على يد أضعف العباد خضر بن عمر المنسوب بقبيلة (سكير!) لأجل نفسه. تمت شد در شب دو شنبه من شهر جمادي الأولى در وقت حكومة داود پاشا ادام الله أيام دولته وسلطته كما يحبه ويرضاه ويشاء آمين بجاه سيد المرسلين. والحمدلله رب العالمين ٣٣... [سووچێکی دڕاوە]»

لە کۆتایی دەستخەتی ژمارە (١٦٠٥٦ د.ع)وە ئەمە نووسراوە:

«تمت الكتاب المسمى بالاعلال من مصنفات مولانا يوسف خان، من أولاد مولانا ابي... المصنف المشهور، ربيع الاول ١٢٣٦.» دوایی دەقی ئەوەی لەسەرەوە نووسیمان لەپاڵ ئەم نووسراوەدا نووسراوە، واتە وەک ئەوە وایە ئەم دەستخەتە لەبەر ئەوەی پێشوو نووسرابێتەوە.

لە کۆتایی دەستخەتی (١٦٥٠٩ د.ع)وە نووسراوە:

«تمت الرسالة المسماة باعلال التصريف من مصنفات مولانا يوسف جان[٤] من أولاد مولانا ابو مصنف المشهور بالپير خضراني.»

دەسێکی چەپەڵ ناوەکەی کوژاندوەتەوە.

---

(٢) بڕوانە: محەمەد عەلی قەرەداغی، بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، چاپخانەی (وميض) بەغدا، ١٤١٨ک - ١٩٩٨ز، بەرگی یەکەم، ل:٣٤١.
هەروەها بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، بەرگی دووەم، چاپخانەی (السالمي) بەغدا، ١٩٩٩، ل: ٢١١.

(٣) لەم دەقانەدا نووسەرەوەکانیان چۆنیان نووسیون وایان دەنووسین و، هەڵەکانیان چاک ناکەینەوە، چونکە کاری ئێمە -لێرەدا- لێکۆڵینەوە و ڕاستکردنەوەی دەقەکان نییە و تەنها نموونە دەهێنینەوە.

(٤) ئەوەی دەربارەی ئەم مامۆستا -تا ئێستە- زانراوە، ئەوەیە کە کوڕی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری موصەننیفی چۆڕییە، ئیتر سەردەمی ژیانی و لە دایکبوون و کۆچی دوایی هیچ نەزانراوە.

دەستخەتی ژمارە (٢٢٤٩٢ د.ع)ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەی مامۆستا یوسف جانە و، لە کۆتاییەوە نووسراوە:

«تمت الرسالة المسماة بإعلال التصريف من مصنفات مولانا يوسف جان من الاولاد مولانا ابوبكر المصنف[5] المشهور بالپير خضراني»

دەستێکی چەپەڵ ناوی نووسەرەوەکەی شێواندووە.

کۆتایی نوسخەی (٢٦٧١٦ د.ع) ئاوایە:

«تمت الرسالة المسماة بإعلال التصريف، من مصنفات مولانا يوسف جان، من يد أضعف العباد المحتاج الى رحمة ملك الوهاب ابراهيم المشهور بالكلاس من ناحية مكرى لأجل أخ العزيز محمو؛ المشهور بالبهديني في بلدة موصل».

دەستخەتی (٢٤٩٥٦ د.ع)ش نوسخەیەکی تەواوی ئەم کتێبەیە، بەڵام دەستی تەماع بۆ شوێنەونیی پەڕەی دوایی دڕاندووە.

دەستخەتی (٣٦٦٩٤ د.ع)ش نوسخەیەکی تەواوە،ساڵی ١٣٢٩ک نووسراوەتەوە...

دەستخەتی ژمارە (٥٠٥٤ د.ع) باشترین و کۆنترین نوسخەی ئەم کتێبەیە، ساڵی (١١٣٣) مەحموودی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەد لە شاری موسڵ نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ژمارە (٢/١٧٣٨٧ د.ع)ش نوسخەیەکی چاکی تەواوی ئەم کتێبەیە ساڵی ١٢٦٦ نووسراوەتەوە. ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدولغەفاری کوڕی شێخ فاضیلی کوڕی شێخ نیظامەدین ساڵی ١٢٧٥ نووسیویەتیەوە. حاجی مەلا محەمەد شەریفی کوڕی حاجی عەبدولقادر وەقفی کردووە.

تا ئێستە کۆتایی نوسخەکانی ئەم کتێبەمان نووسیی، سەرەتاکانیان بەزۆریی وەک یەک وان جگە لە هەندێ جیاوازیی وشە و. کەمە کەمە هەڵەی نووسەرەوەکان، بۆ ئەوەی -ئەگەر یەکێک بیەوێت بەراورد لە نێوان چەند نوسخەدا بکات- نوسخەی لەبەردەستدا

---

(٥) ئەم مامۆستا یەکێکە لە زانا گەورە و ناودارەکانی کورد و سەرڕشتەی زنجیرەیەکی زێڕینی زانایان و بنەماڵەیەکی گەورەی زانیاریی کوردە، گەلێک دانراوی بەبایەخی بابەتی خۆیی هەیە. بەداخەوە تا ئێستە -وەک پێویست- لا لە خۆی و بەرهەمەکانی نەکراوەتەوە. لە لاپەڕە (٢٠٩)ی بەرگی یەکەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی...دا شتێکم دەربارەی نووسیوە و، شتێکی دیکەیشی دەربارە لە لاپەڕە ٢٠٤ی بەرگی سێیەمدا بلاوبووتەوە.

بێت، لێرەدا سەرەتای ئەم نوسخە وەک خۆی دەخەینە بەردەستی خوێنەرانی ئازیز؛ دوای (الحمدلله) و (صەلات و سەلام) دەڵێ:

«اما بعد: فما زال التماس المشتغلين علی، المحصلين بعلم الصرف لأن أشرح لمختصر التصريف الذي من مصنفات الامام الهمام، قدوة الانام، وحيد العصر والأيام، فخر الملة والدين الزنجاني -رحمة الله عليه وعلينا الى يوم الدوام- مع انكدار الضمير في الشتاء الزمهريرية، وتعلق الزمر الكثير، وتطرق الاكناف والأكناف، لتحصيل الكفاف، وليس بكاف، ما هو بخراف، شرح اعلال كسبية، من عبارة استادي العلامة الأخ السيد حسن[٦] ابن السيد عباس البير خضري الشاهويي الحسيني، استفادها من كلام قدوة الائمتين، وامام السالكين، شيخ المسلمين شيخ ابراهيم الشيخ بالمدينة المنورة...»[٧].

دەستخەتی (٢٥٣٥١ د.ع)ش نوسخەیەکی تەواوی دیی ئەم کتێبەیە، ساڵی ١٣٠٩ نووسراوەتەوە.

ژمارەکانی ١٧٨٨١ و١٥٩٤١ و١٩٩٧٢ و١٧٥٦٠... نوسخەگەلێکی دیکەی ئەم کتێبەن. بەم ئەندازە دەست لە ناونووسکردن و باسکردنی نوسخەکانی ئەم کتێبە هەڵدەگرین و، ئاماژە بۆ چەند نوسخەیەکی دانراوێکی دیکەی مامۆستا یوسف جان دەکەین، کە ناوی (مختصر التكملة)یە و بەڵگەیەکی ڕوونی ئەوەیشمانە -وەک باسی دەکەین- کە دانراوی جێگەی باسەکەمان ناوی (اعلال التصريف)ە:

دەستخەتی (٣/١٧٣٨٧ د.ع) نوسخەیەکی ئەم کتێبەیە و ئەحمەدی کوڕی شێخ فاضیلی کوڕی شێخ نیظامەدین ساڵی ١٢٧٥ک نووسیویەتیەوە نوسخەیەکی پوخت و باشە.

---

(٦) ئەم مامۆستایش کە پێگەیشتووی بەردەستی مامۆستا مەلا ئیبراهیمی شارانیی بووە و مامۆستا مەلا یوسف جان لەلای ئەو خوێندوویەتی... دیارە مامۆستایەکی پایەبەرزی سەردەمی خۆی بووە، بەڵام بەداخەوە لە سەرچاوەکاندا شتێکی ئەوتۆمان دەربارەی دەست نەکەوتووە.

(٧) ئەم مامۆستا بەبۆنەی ئەوەوە لە کوردستان دەرچووە و، لە شوێنێکی وەک مەدینەی پیرۆزدا گیرساوەتەوە، بەزۆریی دانراوەکانی ناسراو و پارێزراون و، ژیانی خۆیشی زانراوە و، منیش لای خۆمەوە لە لاپەڕە (٢١٥)ی بەرگی دووەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی...دا شتێکم دەربارەی دانراوەکانی نووسیوە.

دەستخەتی (٢/٣٩٨١٨ د.ع) نوسخەیەکی دیکەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«تمت الكتاب المسمى بتكملة الشريفة في وقت الظهر، بيد أقل العباد عقلاً، وأحمقهم نفساً، لأجل مولانا الأعظم ملا كچك أفندي، ادام الله عمره. قد بالغنا في مقابلته وتصحيحه متناً فقط. وظني انه صحيح غاية الصحة. وإن كان الانسان جائز السهو والنسيان، والمرجو من الإخوان أن يدعوا الله بالرحمة والغفران...»

دەستخەتی ژمارە (١٨٣٦٤ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و، لێرەدا سەرەتاکەی دەنووسین تا بەڵگە بدەین بەدەست کەسانێکەوە دەیانەوێ لە ناوەرۆکی باسەکە بێگومان بن:

«أما بعد: لما أطلع المبتدئون على (اعلال التصريف) الذي شرحته... وترددوا في أن أختصر أبواب تكملة التصريف الذي جمعها الجامع الشيخ ابراهيم الشهراني، أدام الله بركة أنفاسه بطول بقائه، مع توضيح ما هو المقصود منه... بدأت به مستعيناً بالله على إتمامه وان يغفر لي بغفرانه، إنه هو الغفور الودود. إبواب الصحيح...»

کۆتایی ئەم نوسخەیەش ئاوایە:

«قد تمت الكتاب، بعون ملك الوهاب، واليه المرجع والمآب، على يد الحقير الفقير، أضعف العباد، أعني به رسول بن شيخ محمد بن شيخ ابوبكر بن شيخ عثمان، غفرالله... في سنة ١٢٠٧هـ».

وەک دەبینی نوسخەگەلی جیاجیای ئەم دانراوانە زۆرن و، لەوانەیە گەلێ نوسخەی دیکەیش مابن، بەڵام بەم ئەندازە دەسبەردار دەبین و، جێگەی مەبەستی ئێمە و روونکردنەوەی رووی راستیی بۆچونەکەیشمان لەمە زیاتری ناوێت.

### دوو هەڵە لەسەر بەرگی کتێبەکە:

دوای سەرنجدانێکی سەرەتا و کۆتایی چەند نوسخەیەکی ئەم کتێبە دوو هەڵەی زەقی بێ جێ کە نەدەبوو روویان بدایەت دەبینرێن.

هەڵەی یەکەم:

ناوی کتێبەکە کە نووسراوە (شرح تصريف الزنجاني) ئەم ناوە لەناو دەقی کتێبەکە

وەرناگیرێت و هیچ کەس لەوانەی دەستخەتەکانیان نووسیوەتەوە ئەم ناوەیان نەنووسیوە و، هەرکەس باسی ناوی کتێبەکەی کردبێت وتوویەتی ناوی (اعلال التصریف)ە. هەروەها لە ناوەڕۆکی کتێبەکەیشەوە ئەمە دەرناکەوێ؛ چونکە شێوەی شەرحکردن شێوازێکی تایبەتیی هەیە و، بەزۆریی بریتییە لە لێکدانەوەی وشە و ڕستەکانی ئەو دەقەی شەرح دەکرێت و، یەکە یەکە مانا و مەبەستیان ورد دەکرێتەوە، بەڵام ناوەڕۆکی ئەم کتێبە وا نییە و، بەزۆریی بەلای ئیعلال و داڕشتنی وشەکان و ڕەگوڕیشەی فیعلەکاندا دەشکێتەوە و، بەزۆریی لایەنی شەرحکردنی تێدا پشتگوێ خراوە.

هەڵەی دووەم:

ناوی دانەری کتێبەکە کە (پیرخدری شاهۆ)ی بۆ دانراوە زۆر دوورە لە ڕاستییەوە؛ چونکە وەک گوتم نەبیستراوە و، نەماندیوە لە سەرچاوەیەکدا نووسرابێت کە پیرخدری شاهۆ دانراوی بووبێت.

جگە لەمەیش بۆمان هەیە بپرسین ئەم هەڵە چۆن کراوە؟ بەخوێندنەوەیەکی سەرپێی سەرەتای کتێبەکە و بەراوردکردنی لەگەڵ ناوی سەر بەرگەکەدا ئەم هەڵە زوو ئاشکرا دەبێت و، نەدەبوو ڕووی بدایەت؛ چونکە پیرخدری شاهۆ لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا ژیاوە، کەچیی لە پێشەکیی کتێبەکەدا باسی ئەوە کراوە کە دانەری کتێبەکە سوودی لە عیبارەت و وتەی مامۆستا سەید حەسەنی کوڕی سەید عەباسی پیرخضریی شاهۆیی وەرگرتووە، کە ئەویش -بەدەوری خۆی- لە مامۆستا مەلا ئیبراهیمی شارانیی شاهۆیی مەدەنیی وەرگرتووە و، ئەم مامۆستایش لە سەدەی یازدەی کۆچیدا لە ژیاندا بووە.

بەڵێ مامۆستا (یوسف جان) کە کوڕی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری موصەننیفە و دانەری ئەم کتێبەیە لە سەرەتای کتێبەکەدا نە ناوی خۆی و نە ناوی کتێبەکەی نەنووسیوە. بەڵام لە دانراوێکی دیدا، کە دوای ئەم دایناوە، ناوی ئەم کتێبەی بردووە. ئەو کتێبەی ناوی (التکمیل) و لە سەرەتای ئەو کتێبەیدا دەڵێ: (لما أطلع المبتدئون علی اعلال التصریف...) بەمە لە دەمی خۆی و لە قەڵەمییەوە ناوی ئەم کتێبەمان زانی، دیارە ئەم کتێبە لە کاتی خۆیدا بووە بەکتێبێکی مەنهەجیی و فەقێ بەدەرس خوێندوویانە و، نوسخەی زۆریان لەبەر نووسیوەتەوە و، ئەو نووسەرەوانەیش بەزوویی چەردەیەکیان لە ژیانی مامۆستا و بارودۆخی دانانی کتێبەکە زانیوە و، لەخۆیانەوە نەیانوتووە ناوی (اعلال التصریف)ە، هەروەک لەخۆیانەوە نەیانداوەتە پاڵ مامۆستا یوسف جان.

**دوا وتە:**

وەک گەلێ کەس نازانن کێ ئەم کتێبەی چاپ و بڵاوکردۆتەوە منیش هەروەها ، بۆیە گومان بۆ ئەوە ناچێت -خوانەخواستە- مەبەستم لە نووسینی ئەم وتارەدا شکان و ڕسواکردنی، یان پووچکردنەوە و بەفیرۆدانی ڕەنجی، کەس بێت.

ئەم کتێبە لە گیانی خۆیدا کتێبێکی باشە و، بەشێواز و شێوەیەکی ئاسان و بێ قۆرت و گرێ دانراوە و، دەکرێ جارێکی دی ببێتەوە بەمەنهەجی خوێندنی ئەو بەشە فەقێیەی کە لە حوجرەکانی بەتایبەتیی کوردستاندا ماون و، دەکرێ سوودێکی باش بەوانە بگەیەنێت کە دەیانەوێ صەرفی زمانی عەرەبی بخوێنن و فێری ببن. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکیشەوە ئەو مامۆستا بەرێزە لەوکاتەدا ئەو ڕەنجەی داوە و ئەو کارە پیرۆزەی کردووە، بەدینی کەس ڕەوا نییە -بەنووکە قەڵەمێک- ئەو ڕەنجە بدرێ بەزەلامێک کە دوور و نزیک مافی پێیەوە نییە و ئاگای لێی نییە.

لەوانەیش زیاتر مەبەستی سەرەکیم ئەوەیە کە ئەم کتێبە لە بەرانبەری یەک نوسخەی تازەدا بڵاوکراوەتەوە و، گەلێ هەڵە لە چاپەکەیدا ڕوویداوە، بەدەسنیشانکردنی ئەم سەرچاوانەی لێرەدا ناومان هێنان یارمەتیی کەسانێک دەدەین دەیانەوێ لەمەولا لەم کتێبە بکۆڵنەوە و، بەچاپێکی پوختی تازە و لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەوە، لەتەک ئەوەدا کە مافی دانەری ئەسڵیی بدرێتەوە... ئەم کتێبە بخەنە بەردەستی خوێنەران و ئەو کەسانەی دەیانەوێ سوودی لێ وەربگرن.

جا تا ئەو کاتە داوا لەو کەسانە دەکەین نوسخەی چاپی ئەم کتێبەیان لایە لەسەر بەرگەکەی بنووسن:

اعلال التصریف

یوسف جان بن ابی بکر المصنف

# مەلای باتەیی

۳۱۵

مامۆستا مەلا حسەینی باتەیی کە دەمێکە ناوی کەوتۆتە ناو ناوان و، وەک شاعیرێکی کورد ناسراوە، بێگومان پێش ئەوەی شاعیر بێ -یان وەک شاعیر بووە- مەلا بووە و، مەلای باشیش بووە، بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ئەوەدا لە چەند سەرچاوەدا ناوی هاتووە و، بەڕێزەوە لەسەری نووسراوە، هێشتا درن بەتاریکیی دۆزینەوەی ڕێگەی ژیانی نەدراوە و، ئەوەی بۆی کراوە و دەربارەی نووسراوە نەتینویتیی دەشکێنێ و نە لە قەدر و شکۆیشیەتی.

منیش کە لێرەدا ناوی دێنمەوە ناو باس وەنەبێ شتێکی گەورەم بەدەستەوە بێت، ئەوەندە هەیە لە ئەنجامی گەڕانم بەناو دەستخەتان و کەشکۆڵاندا گەلێ شیعری ئەم مامۆستام دیوە و، هەرچیشم دیوە لەگەڵ شیعرە بڵاوکراوەکانی ناو (دیوانا کرمانجی) مامۆستا (عبدالرقیب یوسف) و (هۆزانڤانیت کورد)ی خوالێخۆشبوو مامۆستا سادق بەهادیندا ڕووبەڕووم کردوونەتەوە، جا ئەگەر بڵاوکرابنەوە -با نوسخەکەی لای من دروستتر و ڕاستتریش بووبێت- وازم لێ هێناون و، هەندێ جار ئاماژەم بۆ شوێنەکانیان کردووە، ئەگەر لەناو بڵاوکراوەکاندا نەمدیبن ئەوا لای خۆم بەڕێنووسەکەی دەستخەتەکە -چۆنم بۆ خوێنرابێتەوە- ڕوونووسم کردوون. ئەوەی لەم دەرفەتەدا دەیکەم بەدیاریی ئەم جارە ئەنجامی ئەو گەشت و گێڵەمە و، هیوادارم ئەمانە کەرەستەی لێکۆڵینەوەیەکی خەست و چڕی دیوان و بەرهەمی ئەم شاعیرەبن کە لەمەولا لەسەر بەرهەم و دیوانی بکرێت.

باتی فرماید -١-

مست شپالی [فتیش!] کو ژ مە کودی بزان
صد مثل آینە پیش صهتمە از الامان
گوتمە یا خوب رو، تشتکی منی مثل مو
چابک جست همچو، دوا چیە چی دی بزان؟
من کوتە یادیم ملک. ڤیکتم از بی فلک
قامت بژنا چلک، صهتمە از الامان

گـــوتمه شـــاه چكل، تشـــتكى من ســـر لمل
بيـــڤـه كـرن دوصـد دل، او چيـه چى دى بزان؟
مـن گـــــوتى بـاور بـكه، فـكرى ژ داور بـكه
زلفـان تو ســاتر بكه، صــهـتـمـه از الامــان
گـــوتمه يادیم بخـــوم، لوحكى من بى رقـــوم
لى هيــه دوازده علوم، او چيــه چى دى بزان؟
صــدق ژ وى [كـاغـتى!] تيـدا علم وحـدتى
داغ وكـوان جـبـهـتى، صــهـتـمـه از الامــان
بشكفت همچو فردوس، كو تشتكم هيه سوس
پيكڤه چوگـان قـوس، أو چيـه چى دى بزان؟
من گـوته يا [براذعـان!]، ابرو انف چوگـان
انفى باڤى فـاكـڤـان، صــهـتـمـه از الامــان
گـوتمه يا سـر خوشـه، تشـتكى من مـهـوشـه
لش سـپى و دل رشـه، او چيـه چى دى بزان؟
من گـوته يا هــمـچـومـه، ڤـيكتم از بى كنه
نيـرگـز و چاڤين سيـه، صــهـتـمـه از الامــان
گـــوتمه يا تجـــمـل، باغـكى من آڤـــه مل
هرچهار فصلان تژ و كل، او چيه چى دى بزان؟
كم كو بلى كل كشن، هر چار فصلان بهن خوشن
هردو رويت آتشن، صـــهـــتـــمـــه از الامـــان
كـو تشـتكم هيـه [هى!] غنچـه ناڤـيـان شكر
طيـركى زرين لســر، او چيـه چى دى بزان؟
من گـوته يا زنج سـيڤ، مـهـر وفـا هاته نيڤ
شـيـرينه او دڤ ليڤ، صــهـتـمـه از الامــان
كنى وكــوته (باتيى)، جـامكى من تژى مى
من نخـوشـان دكت حى، أو چيـه چى دى بزان؟

من كـو طوطى لاردان، درمـان جـملە دردان
لعل و جبـهى زنخـدان، صـهـتمـه از الامـان(١)

-٢-

قـسـمت ژ ديوانا ازل مى دامـه سـاقى يك عـدد
تاسك ز خـمـرا بى خلل، از كـرمـه مـخـمـورى ابد
تاسك ژ خمـرا مـحـبتى، دا من د گـوشـا صـحـبـتى
آنيـمـه چرخـا داوتى، عـشـقى لمن صـوتن كـبـد
عـشـقى لمن صـوتى، جكر، قط كس نزانيتن ژ بر
من تينه سينه(!) صد تقر، خون وى لجرحان بو جمد(!)
سـوندى دخـوم از ڤى دمى، بآياتُ حـرفين قـد سـمى
تـيلـك اطاى برچـمى، نـادم ببـابى از ولـد
زلفـا كـوتيـتـه سر مـلان، چنگا لە تاڤـيـژى دلان
قـركـر تـه اهل برچلان، داد مـدد داد مـدد
داده ژ درد عـشـقى، چبكم ژ وى سـيف بهى
ناداته كس طاڤـاسـهى، من بانگ بر شـاهى احـد
هون ببـيـژنه منزليـران، اى [مـجل!] يار و بران
(باتى) كسا چيت لشكران، (في جيد حبل من مسد)

---

(١) ئەم پارچە لە کەشکۆڵی جزیریی وەرگیراوە کە لە (دار العراق للمخطوطات)دا بە ژمارە (٢٢٠٣٢) پارێزراوە و، لە کتێبی (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە) - بەرگی یەکەم-دا باسیم کردووە.

(١) ئەم پارچەیەش لە کەشکۆڵی جزیری وەرگیراوە و، باشیش بۆم نەخوێنرایەوە، بۆیە یەک دوو جێگەییم بەگومانەوە ڕوونووس کرد و، ئەوانی دیشی لە گومان بەدەر نین، بەڵام چونکە هەریەک نوسخەمان لە دەستدایە لەوە زیاترمان پێ نەکرا.

## دەبێ ئەمە شیعری باتەیی بێت؟

ئەم پارچە شیعرەی خوارەوەم لە دەستخەتەکانی (٢٢٤١٧) و (٢٣٣٧٧)دا لەژێر ناوی (مولانا حسین) و (حسین)دا بینی. لەبەرئەوەی کە هیچ دەربارەی ئەم مەولانا حسەینە نازانین و، مەلای باتەییش ناوی حسەینە گومانمان بۆ ئەوە دەچێت کە شیعری مەلا حسەینی باتەیی بێ، بۆیە لەم شوێنەدا و لەپاڵ شیعرەکانی باتەییدا دەینووسین تا ساغ دەبێتەوە کە شیعری کێیە.

دەستخەتەکان کۆنن، بەڵام شیعرەکانی ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەیان بەسەرەوە نییە.

خەتی نوسخەی (٢٢٤١٧) خەتێکی شێوە فارسی شکستەی خۆشە، خەتی نوسخەکەی دی وا نییە بەهەردووکیان توانیم شتێکی لێ بەدەست بهێنم و، نوسخەی یەکەمم لە سەرەوە نووسی و جیاوازییە سەرەکییەکانی نوسخەی دووەمیشم لە خوارەوە بۆ زیادە ڕوونکردنەوە نووسیی.

دەستخەتی (٢٢٤١٧) دەستخەتێکی کۆنە و شیعرەکانی لەسەر لاپەڕەی یەکەمی حاشیەیەک لەسەر (عصام الدین) نووسراون، بەخەتێکی تازە لەسەر دوا لاپەڕەی کتێبەکە مێژووی ڕووداوی شکانی سوپای (طهماسپ) لە لایەنی وەزیری بەڕێز حسەین پاشاوە نووسراوە کە لە ساڵی ١٢٥٧دا بووە.

نوسخەی (٢٢٣٧٧) لە نوسخەی یەکەم زۆر کۆنترە و نووسەرەوەکەی ناوی (ادهم بن مولانا شجی به مولانا المعظم مولانا سید احمد)ە.

لە دوا لاپەڕەدا خاوەنی دەستخەتەکە کە ناوی (عەزیز کوڕی کراوی...)ە ئەمەی نووسیوە:

«من ممتلكات عزيز بن كراوي بن درويش بن زاهد بن شيخ سعدي بن نورالدين بن پير درويش بن پير شامي بن پير علي الارگوشي عشيرة ومولدا، الموصلي موطناً، الشافعي مذهباً، القادري طريقة. تلميذ جرجيس أفندي الرشادي، تلميذ صبغة الله أفندي، تلميذ حيدر أفندي، تلميذ أحمد أفندي، تلميذ حيدر أفندي، تلميذ زين الدين الكردي البلاتي، تلميذ نصرالله الخلخالي، تلميذ محمود الشيرازي، تلميذ جلال الدين الصديقي الدواني.

وكان أحمد أفندي المذكور تلميذاً لمولانا محمد شروين، تلميذ مولانا أحمد المجلي، تلميذ ميرزاجان، تلميذ محمود الشيرازي، تلميذ المحقق الدواني.

وقد أخذ أحمد المذكور الإذن في التفسير، بل في مطلق التدريس، من أفضل معاصري زمانه الملا الشيخ الكردي الأشنوي، تلميذ مولانا ميرزاجان الشيرازي، تلميذ جمال الدين محمود الشيرازي، تلميذ المحقق الدواني، تلميذ محي الدين الكشكناري، تلميذ السيد شريف الجرجاني، تلميذ مباركشاه البخاري، تلميذ القطب الرازي، تلميذ العلامة الشيرازي، تلميذ نصيرالدين الطوسي. وأيضاً تلميذ الكاتب القزويني، تلميذ فخرالدين الرازي، تلميذ حجة الاسلام محمد بن محمد بن الشيخ محمد الغزالي تلميذ امام الحرمين عبدالملك يوسف الجويني، تلميذ الشيخ أبي طالب المكي، مريد أبي عثمان المغربي، مريد أبي عمرو الزجاجي، مريد جنيد البغدادي، مريد أبي الحسن السري بن مغلس السقطي، مريد المعروف الكرخي، مريد أبي سليم داود الطائي، مريد حبيب العجمي، مريد الحسن البصري، مريد حضرة الإمام والخليفة علي بن أبي طالب القرشي الهاشمي، المريد وأخاذ العلوم من حضرة المصطفى (صلى الله عليه وسلم) المشرف بأمر ذي النور المبين بواسطة الروح الأمين الممتاز بين الملائكة المقربين، برسالة رب العالمين، الى الأنبياء والمرسلين.

وقد قرأ أحمد المذكور مشكاة المصابيح الى باب الإعتصام... على الشيخ عبدالملك العصامي، وأخذ الإذن منه، وهو من والده تلميذ الشيخ أحمد بن محمد بن حجر الملكي الهيثمي، تلميذ القاضي زكريا الأنصاري، تلميذ الجلال البلقيني، تلميذ الحافظ [شاس!] البخاري ابن حجر العسقلاني. رحمهم الله ونفعنا الله بهم آمين».

له خوێندنەوەیەکی خێرای ئەم دەقەوە یەک دوو سەرنجی جێگەی بایەخ دەبینین کە لەوانەیە لە شوێنی دیکەدا نەبن. لەوانە ناوی سێ (پیر) کە ئەمە ناونیشانی (کاکەیی)یەکانە و پیرشالیار و پیرداود و پیر کێ و کێ کە لە بەرگی یەکەمی مێژووی وێژەی کوردی مامۆستا سدیق بۆرەکەییدا ناویان هاتووە. جگە لە ناوەکانیشیان ئەوە دەخوێنینەوە کە ئەم پیرانە خەڵکی ناوچەی (ارگوش = ئەرگۆش)ن و، ئەم شوێنەیش لە ڕووی جوغرافیەوە دوورە لە ناوچەی (پیر)ەکانی دیبەوە.

هەروەها لەناو زنجیرەی پشتی مامۆستا عوزەیردا ناوی (شێخ سەعدی)یەک هاتووە، کە لە کەشکۆڵی غەریبیدا (٨١٥٥ د.ع) چەند پارچە شیعرێکی هەیە، هەروەها لەو کەشکۆڵەدا پارچەیەک شیعر لە شێوەنی (شێخی سەعدی)دا گوتراوە وساڵی (١٢٤٢ھ)یش بۆ مردنەکەی دانراوە لەوانەیە ئەم شێخ سەعدییە بێت.

ئەمەیش دەقی شیعرەکانە:

مولانا حسين فرمايد:

ژ درد فرقت رندان دكم افغان آوات[١]

من ژ ويرا بو محبت هر ژ روژا أولين[٢]

چند ژ دست فرقت من تى ژ چاوان آب خوين[٣]

اى غلامت جمله عالم از غلام كمترين[٤]

گفتم اورا ما دعاگوى توام اى حور عين

أعرضت عنى وقالت: ما دعاء الكافرين؟

***

اى شه عالى جناب از بندهء افكندام

من ژ دست ناى چه خدمت، از لوى شرمندان[٥]

گر اميرو پادشام از هر غلام بندام

گر بخوانى ور برانى[٦] بندام تا زيندام

واجب لى امتثال الامر، ماذا تأمرين؟

***

آستانى دلبرى هستن گلو (دار الشفا)

هر كس درديک هبى هر تى زوى بيستن دوا[٧]

را مثال جنتى او چيمن و آب و هوا

حبذا روضات نجد[٨] زرتها عهد الصبا

ربوه تجرى على أرجائها ماء معين

***

از فقیر و بی نوا و او خسرو و خسرو نژاد
من کودیت آو پادشاه یکجار ژ دستم چو فؤاد
(شکر لک یا ربنا) ایر و چه حاصل بون مراد
بر در باغ وصالش هاتف آواز داد:
(هذه جنات عدن فادخلوها خالدین)

***

یا (حسین)نامراد ایدی ردو[٩] عشقی مچو
وی کرن دیوانه چندین نکتەدان و نکته گو
نابرین وصف ده عەشقی کر به بیژن هر درو[١٠]
قصهء عشقی جلال و داستان حسن او[١١]
(تلك أنباء یقول الناس منا بعد حین)

جیاوازییەکانی دەستخەتی (٢٣٣٧٧)

(١) ئەم دێڕە وا دیارە زیادە و تەنها لە نوسخەی یەکەمدا هەیە.
(٢) من... (٢) من و ویرا بو محبت هر...
(٣) چند... (٢) چند ژ دستی فرقتی... آو خون.
(٤) ای... (٢) وی غلامن جمله عالم از غلامی کمترین.
(٥) من ژ... (٢) من ژ دست ناییت چو خدمت او ازی شرمنده ام.
(٦) سووچێکی نوسخەی یەکەم دڕاوە و ئەم بەشەمان لەبەر نوسخەی دووەم تەواو کرد.
(٧) هبی... (٢) هی دی هر لوی بیتن دوا.
(٨) حبذا... (٢) حب ذات ذات بحری...
(٩) ردو (٢) لدو.
(١٠) نابرین... (٢) نابرین وصفی تعشقی کر ببیژم از هرو.
(١١) قصه...(٢) قصها عشقی جلالش استان حسن تو

## چەند مامۆستا مەلا ئیلیاسمان هەیە؟ ئەم مامۆستا مەلا ئیلیاسەیش کێیە؟

### ٣١٦

گەلێ جار باسی سەردەرگومیی و ئاڵۆزییم لە مێژووی زانایان و شاعیران و ناودارانماندا کردووە و، باسی چەند ناو و نازناوم کردووە کە بەڵگەی ڕوون بۆ جیاکردنەوەیان و ناساندنی هەریەکێکیان بەپێناسە و کەسایەتی خۆی نییە، ئەمەیش ئاشکرایە بەهۆی نەبوونی مێژوویەکی ورد و دروستی زانا و ناودارانمانەوەیە و، گەلێ زانا و ناودارمان هەیە کە لە سەردەمی خۆیدا کەڵە زانا و گەورە مەلا و تاقانەی چەرخی خۆی بووە و، دەوری کاریگەری لە بڵاوکردنەوەی زانیاریی و وریاکردنەوەی خەڵک و گەشەپێدانی ڕۆشنبیریدا بووە، بەڵام کە خۆی سەری ناوەتەوە و، ئەم جیهانەی بەجێهێشتووە بەهۆی ئەوەوە خەمخۆری نەبووە و، کەسێکی وا نەبووە بەمێژووی ژیانی و بەرهەم و شوێنەوارەکانیدا بگات، وردە وردە ئەستێرەی دەرەوشاوەی خۆی بەرەو کزیی چووە تا بەیەکجاری خامۆش بووە و، شوێنەوارەکانیشی بەر چەپۆکی زەمانە کەوتوون و سەریان تێدا چووە و، گەلێ جار وا بووە هیچ هەواڵێک لە ژیان و بەرهەمیشیان نەماوەتەوە. جاری وایش هەبووە لابەلا و لاوەکیی شتێکی کەم کە تروسکاییەک بدا بەڕێگەی تاریکی ژیانی تاق و تەرایەکیان لە سووچ و قوشبن و حاشیە و کۆتایی کتێبە دەستخەتەکاندا ماوەتەوە.

ئەم مامۆستای لێرەدا ناوی دەخەینە ناوناوان و سووچێکی بچکۆلەی لە مێژووی زانایانی کورد پێ دەڕازێنینەوە، یەکێکە لەو مامۆستایانەی بەختی یار بووە و، تروسکەیەکمان لە ژیانی دەستکەوتووە.

بەڵام پێش ئەوەی بێینە سەر ئەم کورتە باسە لا لە لایەنێکی پێوەندیدار بەم باسەوە دەکەینەوە.

مامۆستای ئەم باسەمان ناوی مامۆستا مەلا ئیلیاسە، پێش ئەوەی قەڵەم بخەمە سەر کاغەز و هیچ حوکمێک بکەم بەسەرچاوەکانی مێژووی ناودار و زانایانی کورددا گەڕام، مەبادا باسێکی کرابێت و بەسەرمدا بڕوات و، زانیارییەک هەبێت من پێم نەزانیبێت. بەڵام دوای گەڕانێکی باش بەو سەرچاوانەی لە دەستمدان بەدەستی خاڵییەوە گەڕامەوە و، سۆراخێکم لە ژیانی بۆ نەکرا. بەڵام لە سەرچاوەکاندا ناوی چەند مامۆستا مەلا ئیلیاسێکم دی و، لە ئەرشیفی تایبەتیی خۆیشمدا چەند مامۆستا مەلا ئیلیاسێکی دیم دی کە باسیان لە سەرچاوەکاندا نییە، بۆ ئەوەی باسەکەم بەگوێرەی توانا بێکەلێن بێت،

بەکورتیی ئەو ناوانە لێرەدا دەخەمە ڕوو:

١- مەولانا ئیلیاسی گەورە کە قوتابیی ئیبنوحەجەری عەسقەلانیی بووە و ئیجازەی حەدیثی لێ وەرگرتووە. ئەم مامۆستا لە نیوەی یەکەمی سەدەی دەی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە.

٢-ئیلیاسی ئەییوبی ساڵی ١٢٩١ لە دایکبووە، ساڵی ١٣٤٦ لە میسر کۆچی دوایی کردووە.

٣- ئیلیاسی کوڕی ئیبراهیمی کوردی، ساڵی ١٠٤٧ لە دایک بووە و، ساڵی ١١٣٨ لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە.

٤- ئیلیاسی ئەربیلیی. ساڵی ٥٥١ لە دایک بووە و لە بەغدا خوێندنی تەواوکردووە و، دوایی گەڕاوەتەوە بۆ ئەربیل و لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

٥- مەلا ئیلیاسی بەرۆژەیی -بانەیی- قوتابیی مەولانا ئیلیاسی گەورە بووە.

٦- مەلا ئیلیاسێک لە دیمەشق[١].

ئەمانە ئەوانەن لە سەرچاوە چاپەکاندا ناویان هاتووە.

ئەوانەیش کە ناویانم لە دەستخەتەکاندا دیوە و لە شوێنی دیدا باسیان نییە ئەمانەن:

١- مەولانا ئیلیاسی کەلاتیی:

ئەم مامۆستا لە سەرچاوەکاندا ناوی نەبراوە، ئەوەیش کە دەست من کەوتووە ئەوەیە کتێبێکی لە زانیاریی نەحودا هەیە، خۆی لە پێشەکیەکەیدا ناوی خۆی نابات، تەنها دەڵێ زۆریان داوا لێ کردم دەربارەی نووسینی هەندێ شت لە نەحودا، منیش لەوەی لە مامۆستایانم وەرگرتووە و تێیگەیشتووم ئەم کتێبەم پێکهێنا. بەڵام مامۆستای نووسەرەوەی دەستخەتەکە -خودا پاداشی خێری بداتەوە- دەڵێ:

«من مصنفات مولى الامام الهمام، مرشد الراشد، ائمة المتأخرين والمتورعين مولانا الياس الكلاتي».

بەداخەوە ئەم نووسەرەوە کە ناوی صەدرەدینی کوڕی ڕۆستەمی [یابونیری!]یە دەربارەی ساڵ و شوێنی نووسینەوەکەی هیچی بۆ دیاریی نەکردووین.

---

(١) بروانە: علماؤنا في خدمة العلم والدين، دانراوی عبدالكريم محمد المدرس، ل: ٩٧-١٠٠. هەروەها بروانە: مشاهير كرد، بابا مردوخ روحانی شیوا، بەرگی یەکەم، ل: ١٤٤ و٢٢٤.

دانراوێکی مامۆستا مەلا ئیلیاسی کەلاتیی

مامۆستای دانەر ناوی نەناوە و شتێکی ئەوتۆی دەربارەی نەنووسیوە. سەرەتاکەی ئاوا دەست پێکردووە:

أما بعد: فهذه كلمات ومفهومات فهمناها من كلام الشراح لمتون النحو، ومن أستادينا رحمهم الله، وما استنبطنا واستخرجنا من مقالتهم الشريفة، ذكرناها وألفناها تذكرة لاخوان الصفا يذكروننا بها، لعلهم عند ذكرهم ايانا يحصل بهم شفقة ورحمة بصالح دعواتهم يغفرالله لنا زلاتنا وعثرتنا، وتسهيلاً للمتعلمين ولمن ابتدأ بهذا العلم، وطلبهم مراراً كثيراً داعياً الى تأليفنا هذه، وان كان تأليفنا [لائق!] وغير مستقيم كل استقامة، والزمان الذي ركبنا فيها زمان خوف وعدم قرار «يوماً بجزوى ويوماً بالعقيق» لعل الله تعالى وفقنا لاتمامه وهو ولي الاصابة والتوفيق.

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

ولاتجعلنا من الأسفلين من المنازل. تمت بالخير والظفر. من مصنفات مولى الامام الهمام مرشد الراشد، ائمة المتأخرين والمتورعين مولانا الياس الكلاتي وحمه الله زاده شرفاً في الدارين على يد الحقير الفقير أقل العباد صدرالدين رستم [اليابريزي] اللهم أغفر لي وله ولوالدين آمين يا معين،

پێش هەموو شتێک نووسەرەوەی ئەم دەستخەتە لە خوێندەواریدا پێشکەوتوو شارەزا نەبووە و هەڵەی نووسینەوەی زۆرە.

لە شوێنی دیدا دیومە کە ئەم مامۆستا مامەی مامۆستای ناودارمان مەلا ئەبوبەکری موصەنیفە. بەگوێرەی قسەی نووسەرەوەکە دەبێ مامۆستا مەلا ئیلیاس دانراوی دیکەیشی بووبێت، بەڵام هیچیان دەربارەی نازانین.

ئەم دەستخەتە لە (د.ع)دا بە ژمارە (٢/٥٩١٦) پارێزراوە.

١٦٦٦٤

مەلا ئیلیاسی کوڕی ئیبراهیمی کوردیمان هەیە، کە لە (سلک الدرر ١/٢٧٢) و هدیە العارفین (١/٢٦٦)دا دەڵێن:

ساڵی ١١٣٨ کۆچی دوایی کردووە و حاشیەی بەسەر حاشیەی عیصامەدین بەسەر جامیەوە هەیە.

لە دەستخەتی ١٦٦٣٤دا دەڵی: مەحموودی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی داودی کوڕی ئیسماعیل ساڵی ١١١٨ لە مەدرەسەی (قاضي القضاه) قاضی ئیلیاسدا نووسیویەتیەوە.

دواییش ئەم دەستخەتە لەلایەنی خەزنەدار محەمەدی کوڕی ئەحمەد ئاغاوە وەقف کراوە لەژێر چاودێریی محەمەدی کوڕی مەلا بەهرامدا.

هەروەها مەلا ئیلیاس، یان قازی ئیلیاسی کەلاتیمان هەیە.

ئەم دەستخەتە لە (دار العراق للمخطوطات)دا بەژمارە (٥٩١٦/٢) پارێزراوە.

لە دەستخەتێکی دیدا دەڵێ: ئەم ماموستا مەلا ئیلیاسە مامی ماموستا مەلا ئەبوبەکری موصەننیفە. بەم پێیە دوور نییە ئەم ماموستا - ماموستا مەلا ئیلیاسی گەورە بێت؛ چونکە ماموستا مەلا ئەبوبەکری برازای لە ١٠١٤ی کۆچیدا کۆچی دوایی کردووە، جا ئەگەر مامی لە نیوەی سەدەی پێشوودا لە جیهان دەرچووبێت زۆر گونجاو و لەبارە.

٢- ماموستا مەلا ئیلیاسی گۆرانیی:

دەربارەی ژیانی ئەم ماموستایش لە سەرچاوەکاندا شتێکمان دەستگیر نەبوو، خۆشبەختانە لە دەستخەتی ژمارە (١٥/٢٠٣٤٤)ی (دار العراق للمخطوطات)دا ماموستای نووسەرەوەی دەستخەتەکە کە ماموستایەکی ورد و کارامە بووە ئیجازەیەکی ئەم ماموستای بۆ نووسیوین کە داویەتی بەماموستا مەلا محەمەدی کوڕی داودی (گەرەویی) ماموستا مەلا ئیلیاسیش ئیجازەی لە ماموستا مەلا ئیبراهیمی کوڕی حەسەنی شارانیی گۆرانیی و چەند کەسی دیکە وەرگرتووە.

ماموستا مەلا ئیلیاس خۆیشی لە کۆتایی ئیجازەکەوە دەفەرموێ: ساڵی ١١٣٥ ئیجازەی داوە بەما موستا مەلا محەمەد.

ماموستای نووسەرەوەیش کە ناوی عەبدورەحمانی کوڕی خضری کوڕی حەسەنی گەناوی ڕازانیی پشدەرییە و ساڵی ١١٥١ کتێبەکەی لە گوندی تەلەی حەریر نووسیوەتەوە دەڵێ:

منیش ئیجازەم لەم مامۆستا -واتە مامۆستا مەلا محەمەدی کوڕی داودی (کرووی)- وەرگرت، ئیجازە وەرگرتنەکەیش لە ساڵی نووسینەوەی کتێبەکەدا بووە، واتە دەبێ مامۆستا مەلا محەمەدیش لە زانایانی گەورەی کورد بێت.

ئەو ئیجازەنامە وەک دەقێکی مێژوویی بەسوود لێرەدا تۆمار دەکەین.

دەقی ئیجازەی مامۆستا مەلا ئیلیاسی گۆرانیی:

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين.

أما بعد: لما كان علم الإسناد مختصاً بهذه الأمة، وكان ممن سعى في طلبه الشيخ الكامل الفاضل المخلص الخالص الاعتقاد صاحب الفهم الراجح الشيخ محمد بن داود، فقد التمس من خادم الفقراء أن يجيزه بما أجازني به مشايخ الأعلام الشيخ المحقق المدقق الشيخ ابراهيم بن حسن الگوراني، والشيخ الفاضل الشيخ أحمد بن محمد النخلي، ثم المكي ولي الله بلا نزاع، والشيخ يونس الفقيه المحدث المصري ممن صعب استيعابهم، فبادرت الى إجابة التماسه، فقلت وبالله التوفيق: قد أجزت سيدنا ومولانا الشيخ المذكور بجميع مقروآتي ومسموعاتي ومروياتي، إجازة عامة كما أجازني به مشايخي. وقد ذكروا في الصناعة الحديثية: لاينال الرجل حتى يأخذ ممن فوقه، وممن دونه، ومن يساويه، وأرجو من سيدنا المذكور أن لاينساني من صالح دعائه، سيما في أوقات الإجابة، قال المجيز: حرره خادم الفقرا إلياس الگوراني عفى الله عنه بمنه وكرمه سنة ١١٣٥... وأخذت الإجازة من الشيخ محمد المذكور سنة ١١٥١ يوم الرابع من شهر شعبان[١].

٣- ئیلیاسی غەزائیی کوڕی پیر دانیاڵ، لە دەوروبەری ساڵی ٩٥٠دا ژیاوە. (کاروان ژمارە ٣٦ ل: ١٤٤).

٤- ئیلیاسی بانەیی ساڵی ١٠٨٩ کتێبی (منطق الطير)ی عەطاری لەبەر خاتری حەسەن ئاغای چەلیی نووسیوەتەوە.

(١) دەبێ ئەمە مامۆستای نووسەرەوەی دەستخەتەکە بێت کە ناوی عەبدوڕەحمانی کوڕی خضری کوڕی حەسەنی گەناوی ڕازانیی پشدەرییە کە ساڵی ١١٥١ دەستخەتەکەی لە گوندی تەڵەی حەریر نووسیوەتەوە.

بەژمارە (٢٩٧٢٩) لە (دار العراق للمخطوطات)دا پارێزراوە.

٥- شێخ ئیلیاسی (کلکوری)مان هەیە کە باوکی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای دانەری (اعلال التصریف) -شەرحی عیزیی-یە، (٤٣١٤٣ د.ع).

٦- (قاضي القضاة) قازیی ئیلیاسیشمان هەیە کە ساڵی ١١١٨ لە ژیاندا بووە (١٦٦٣٤ د.ع).

٧- شێخ ئیلیاسی (کرابادی) ناسراو بەشێخەسوور:

ناو و باسی ئەم مامۆستایش لە سەرچاوەکانی بەردەستماندا نییە، لەم ماوەدا لای مامۆستایەک بەرگی یەکەمی تەفسیری (منقول التفاسیر)م بینی کە یەکێک لە نەوەکانی ئەم شێخ ئیلیاسە نووسیویەتیەوە، مامۆستای نووسەرەوە ناو بەناو دەستخەتەکەی بەزانیاریی جۆراوجۆر ڕازاندوەتەوە و، لە کۆتاییشیدا گەلێ زانیاریی لەسەر مامۆستا مەلا ئیلیاس نووسیوە، کە زیاتر باسی تەمەن و کۆچی دوایی دەکەن، بەڵام بەوپێی ئەو بایەخە زۆرە بەژیانی دراوە دەبێ لە چەرخی خۆیدا زانایەکی گەورە بووبێت، بەڵام باسی هیچ دانراو و شوێنەوارێکی نەکراوە.

مامۆستای نووسەرەوە، کە زنجیرەی پشتی ئاوا دەنووسێت:

محەمەدی کوڕی شێخ عەبدوڵلای، کوڕی شێخ محەمەدی، کوڕی شێخ عەبدوڵلای، کوڕی شێح ئیلیاسی (کرابادی) ناسراو بەشێخە سووری، کوڕی شێخ محەمەد، کوڕی شێخ ئەحمەدی، کوڕی شێخ عومەری، کوڕی شێخ عوثمانی، کوڕی شێخ حسەین... تا دوا پشتیان دەباتەوە سەر بیلالی حەبەشیی بانگدەری پێغەمبەر (د.خ)... چەند زانیارییەکی لەسەر مامۆستا مەلا ئیلیاسی باپیرە گەورەی نووسیوە، لەوانە:

ایها السائل عني عام فوت شیخ سور
عمره (الیاس)[٢] راح عام (الف) بالسرور

یەکێکی دی نووسیویە:

ربي اني مسني (ضر) بفوت الألمعي
عمره (آمین) فابکوا یا أخلائي معي

(٢) ئەم مامۆستایانەی ئەم بەیتانەیان نووسیوە تێکڕا ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە مامۆستا مەلا ئیلیاس (١٠٠٢) ساڵ ژیاوە و، لە ساڵی (١٠٠٠) ی کۆچیدا ماڵئاوایی لە جیهان کردووە.

یەکێکی دیش بەکوردی ئاوای نووسیوە:

ئەی تەمەن(ئیلیاس)و چوونت(غەینە) بۆ خزمەت غەفوور
ڕەوشەنی بەخشی دڵانی ذاتی پاک و بێ قوصوور
کێوی طووری، بەحری نووری، جانفیداتم شێخە سوور
تۆ نەوەی پاکی بیلالی بانگی ئەو بو نەفخی صوور
ئەو بیلاڵەی سوورەتی (لیل)ی لە شەئنا بوو ظوهوور
عاشقی ڕێبازی تۆیین دژ بەشەیتان و شەروور
سینە برژاوین (قلیل من عبادي الشکور)
جا نیگاهێکی کەرەمکە ئێمە هاتووین لە دوور

ئەم شیعرانە بەخەتێکی تازە و بەڕێنووسی کوردی نووسراوەتەوە و ناوی کەسیان بەسەرەوە نییە. ئێستە لەمە زیاتر دەربارەی ئەم مامۆستا مەلا ئیلیاسەیش نازانین -وەک هەموو جارێک- دەڵێین: بەڵکو!

مامۆستای نووسەرەوەی دەستخەتەکە گەلێ زانیاریی و ڕووداوی لە دەستخەتەکەدا تۆمار کردووە، لەم هەلەدا بەسەردا ڕۆیشتنیان بەباش نازانم، نەوەک جارێکی دی هەلی وا نەڕەخسێتەوە و، ئەوانەیان جێگەی سوودن تۆماریان دەکەین:

١- حاشیەی محەمەدی بانەیی، محەمەدی (کرابادی) سەرلەبەیانیی ڕۆژی دەهەمی مانگی (ربیع الآخر) ڕۆژی هەینی کاتی هاتنی پایەبڵند فەتحعەلی سولطان لەلای بێتووشەوە، بۆ سەر پایەبڵند ئەحمەد سوڵتانی فەرمانداری بانە و کوشتنی و تاڵانکردنی خۆی و هەموو نۆکەرانی. ئەمە لە ساڵی ١٢٣٥دا.

٢- محەمەدی کوڕی شێخ عەبدوڵلای... ساڵی ١٢٣٤ لە مزگەوتی ئیبراهیم ئاغا نووسیبیەوە، کاتی چێشتەنگاوی دووەم ڕۆژی (ایام التشریق).

٣- محەمەدی (کرابادی) لە گوندی بنەخوێ ساڵی ١٢٣٦ کاتی هاتنی هەواڵی کوژرانی فەتحعەلی سوڵتان لە شاری سنە نووسیبیەوە.

٤- محەمەد (کرابادی) لە مانگی مەولوودا پێش نیوەڕۆ لە کاتی خوێندن لە خزمەتی مەولانا محەمەدی مودەڕیسدا لە شارۆچکەی بانە نووسیبیەوە.

٥- محەمەدی (کرابادی) ساڵی ١٢٣٦ لە گوندی بنەخوێ نووسیبیەوە.

جێگەی باسە مێژووی تەواوبوونی نووسینەوەی دەستخەتەکە ڕۆژی ٢٦ی مانگی (ربیع الاول)ی ساڵی (١٢٣٨)ە، واتە بەلای کەمییەوە مامۆستا مەلا محەمەد چوار ساڵ لەگەڵ نووسینەوە و حاشیە لەسەر نووسینی ئەم دەستخەتەدا خەریک بووە.

**شەرحی حاجی مەلا عومەر ئەفەندیی ئەربیلیی بەسەر (جداول شرح الشمسیة)وە**

٣١٧

سەرەتاکەی:

«وبعد فقد سألني من المشتغلين عندي الأخ العزيز اسماعيل أفندي أن أشرح له جداويل؛ المختلطات لشرح الرسالة الشمسية شرحاً شافياً وأمثل لكل اختلاط منها مثالاً وافياً بحيث لايبقى للمستفيدين خفاء، وينكشف لأصحاب البلادة والاغبياء، فأجبته مستعيناً بالله ومستمداً من ارواح الانبياء وأولياء الله».

کۆتاییەکەی:

«فلا شيء من المنخسف بمضيئ وبالضرورة بالتوقيت أو وقتاً ما لا دائماً. تمت شد ـــ حاشيةء شيخنا ومولانا حاجي ملا عمر أفندي الأربيلي. جعل الله الجنة مثواه».

١٨ لاپەڕەیە، مێژووی نووسینەوە و ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە. بەڵام دانراوەکە لەناو کۆمەڵێ دانراوی دیدایە، وا دیارە بۆ مەلا ئیسماعیل نووسراونەتەوە، جا ئایا ئەو مەلا ئیسماعیلەیە کە مامۆستای ئەربیلیی شەرحەکەی لەبەر خاتری ئەو کردووە یان نا؟ ڕەنگە. لە شوێنێکدا دەڵێ: ڕەسووڵی سکتانیی لەبەر خاتری مامۆستا مەلا ئیسماعیل نووسیویە. لە شوێنێکی دیدا دەڵێ لەبەر خاتری مەولانا مامۆستا مەلا ئیسماعیلی ماویلی لە گوندی (کاموسک) نووسیویەتیەوە.

## غاية الامكان في معرفة الزمان والمكان

٣١٨

ئەم کتێبە دانراوی مامۆستای نەناسراو و نەناسێنراوی کورد مامۆستا مەلا مەحموودی ئەشنەویی (شنۆیی)یە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

الحمدلله الذي لا آخر لاوليته، ولا أول لآخريته، ولا بطون لظاهريته، ولا ظهور لباطنيته...

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

نفعنا الله كما يحب ويرضى، وعصمنا عن الزيغ والردا. قد استراحت أقدام الأقدام عن السير في ميادين صفحات هاتيك الارقام المسماة بغاية الامكان في معرفة الزمان والمكان من مصنفات قطب العارفين شيخ محمود الأشنوي.

ئەم دانراوە محەمەدی کوڕی ئیسماعیل پاشای عەبباسیی ساڵی ١٢٣٠نووسیویەتیەوە. ٨٦ لاپەڕەیە بەپێوانەی ٢٠×١٦.

ئەم کتێبە لە عەقائید و باسی ئایاتی صیفاتدایە، بەزۆریی لەسەر شێوەی پرسیار و وەڵامە، بەزمانی فارسی.

بەژمارە (١/٤٢٩٣٥ د.ع) پارێزراوە.

## مەنظوومەی (اسماء الحسنی)

٣١٩

بسم الله الرحمن الرحيم وبه نستعين

يقول احمد الفقير الافقر ... احمد ربي دائما واشكر

ثم اصلي مع سلام عال ... على النبي المصطفى والآل

وبعد فاسماء الاله الحسنى ... من عدها حفظا يفوز بالجنة

وهذه الاسماء هو الله الذي ... ليس اله غيره من منقذ

ثم هو الرحمن والرحيم ... الملك القدوس والعليم

وهو العزيز البارئ المهيمن ... الخالق العدل السلام المؤمن

وهو الحفيظ القادر العظيم ... وهو الرقيب الحق والكريم

الحكم القهار والخبير ... الواحد المتكبر الكبير

الصمد المصور الغفور ... وهو اللطيف الحي والشكور

وهو المقتدر القوي والحكيم ... وهو المؤخر المتين والحليم

المحصي الفتاح والوهاب ... المبدئ الرزاق والتواب

فهو المعز والمذل الرافع ... فهو السميع والودود الواسع

وهو البصير والعلي والمجيد ... وهو المميت والوكيل والشهيد

وهو الجليل والولي والحسيب ... وهو المقيت والغني والمجيب

هۆنراوەی (اسماء الحسنى)

دانراوی ئەحمەدی ئەربیلیی

سەرەتاکەی:

يقـول احـمـد الفـقـيـر الافـقـر
احـــمـــد ربي دائـمـــاً وأشكر
ثم أصلي مع ســلام عـــال
عـلـى النبي المصطفى والآل
وبعـد: فـأسـمـا ء الاله الحسنى
من عدها حفظا يفوز الحسنى
وهذه الأسـمـا ء هو الله الذي
ليـس اله غــيـره مـن منقــذ

***

ئەم هۆنراوەیە ٢١ بەیتە، کۆتاییەکەی ئاوایە:

فــمـــالـك الملك وذاك النـافـع
الضـــار والرشـــيـــد وهو المانع

الجامع الهادي الصبور المنتقم
بعد هو الباقي بهذا قد ختم
تمت المنظومة يوم الجمعة بعد صلاتها عجالة ١٢٨٤

هیـچی دیم دەربارەی ئەم کـتـێـبـە و خـاوەنەکـەی نەزانی. لەوانەیە ئەمـە دەسـتـخـەتی دانەرەکەی بێت. ئەمە لە یەک پەڕەدایە، دیارە لە دەستـخەتێک هەڵپرووکێنراوە و، کراوە بەشتێکی جیاواز بۆ تەمای پارەی زیاد.

بەژمارە (٢٣٦١٩ د.ع) پارێزراوە.

## چەند حاشیەیەک بەسەر تەفسیری (عبدالله الاصم)ەوە

### ٣٢٠.

دانراوی: ئەبوبەکری کوڕی یوسفی شێخان -یان شەیبانیی- ئەم دانراوە ١٨ لاپەڕەیە و وا دیارە دەستخەتی دانەرەکەیەتی.

سەرەتاکەی ئاوایە:

«اما بعد: فيقول العبد المفتقر الى رحمة ربه الكريم الغفران، ابوبكر بن يوسف الشيـخـان -دوایی چاک کـراوە کـراوە بە الشـيبـانی- الذي ان كـان غـائبـاً في النسيـان، وان كـان حـاضـراً لم يلتـفت اليـه الا الصبيـان، الطف علينا نظراً ياذا الاحسان: لما طولت أقدامي عن فراشي المضيفة القصيرة لذنوبي الكثيرة...»

لە کۆتاییشدا جگە لە:

«انتهى بعون الملك العلام والصلاة والسلام على محمد خير الأنام وآله الكرام، وأصحابه نجوم الظلام...» هیچی تر ناڵێت.

ئەم مـامـۆسـتـا سـاڵی ١١٤٤ لە ژیاندا بووە و چەند دەسـتـخـەتێک لە شـوێـنەواری گەیشـتـوونەتە (دار العـراق للمـخطوطات) و هەر لەم دەسـتـخەتەدا لە پێش ئەم دانراوەوە نووسیویە:

(قد وقع الفـراغ من تنميق الحـاشيـة المنسوبـة الى مـولانا حيـدر المرحوم من يد أضعف العباد وأقربهم وأكثرهم ذنباً الى رحمة الرحيم الرحمن اللطيف الديان ابوبكر بن يوسف شيخان الغريب في الماوران في اليوم المبارك يوم الأربعاء في

شهر الله المبارك المحرم في سنة أربع وأربعين بعد المائة والألف من هجرة النبوية على صاحبها أفضل الصلاة والسلام.) تمت.

دەستخەتی ١٧١٨٨ش بەخەتی ئەمەو ساڵی ١١٤٢ نووسیویەتیەوە دەستخەتی ١٧١٨١ش بەشێکە لە دەستخەتی سەرەوە و سولەیمان عەزیز سولەیمان لەبەر پارە لە هاوەڵەکەی دابڕیوە. ئەمیش ساڵی ١١٤٣ نووسراوەتەوە.

دەربارەی مامۆستا (مەلا عبدالله الاصم) لە بەرگی سێیەمی ئەم کتێبەدا شتێک نووسراوە.

بەژمارە (٣/١٧١٤٩ و ١٧٥٧٢ د.ع) پارێزراوە.

## شێخ عەبدولعەزیزی ئەکبەر ئابادی

### ٣٢١

ئەم مامۆستایە ئەوەی ئێمە زانیبێتمان دانراوێکی هەیە بەناوی (رد الروافض) کە لە دەستخەتی ژمارە ٣٣٩٨٩ی (دار العراق للمخطوطات)دا دەستخەتی ژمارە دووە و دەستخەتی یەکەم کتێبێکە لە (تصوف)دا بەناوی (مصباح الهداية ومفتاح الكفاية) هەردووکیان بۆ حەمزە ناوێک نووسراونەتەوە، کە تا ئێستە بۆم ڕوون نەبووەتەوە کێیە.

دەربارەی کتێبەکەی مامۆستای ئەکبەر ئابادیی و مێژووی ژیانی شتێکی ئەوتۆمان لە دەستدا نییە، بەڵام خۆشبەختانە لە سەرەتای کتێبەکەیەوە نووسراوە کە ساڵی ١٠٨٩ک کۆچی دوایی کردووە.

لە کۆتایی ئەم دانراوەوە نووسراوە:

«تمت الرسالة الشريفة المسماة بالرد الروافض للعالم النحرير الشيخ عبدالعزيز في وقت الضحوة الكبرى يوم الخميس حادي عشر من شهر شوال في سنة الف ومائة واثنين وسبعين من الهجرة النبوية (صلى الله عليه وسلم) في القصبة (الهارهره!) في الخانقاه العاكية المتبركة. كاتبها العبد المذنب تراب أقدام الفقراء مفتي جلال الدين التوكلي (كولوي!) حسب الامر مخدومنا مولانا مرشدنا ملاذ الصلحاء تاج العرفاء... شاه حمزه اوليا قطب الزمان، ابدال الله، صاحب... والبركات ادام الله فيوض انواره علينا فينا».

دەستخەتەکە شڕ و مۆرانە خواردووە.

## حقائق دقائق الدرر فى شرح نظم محاسن الغرر

٣٢٢

دانراوی: ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕێ ئەحمەد.

سەرەتاکەی:

«وبعد: فيقول الفقير الى الله الغني الصمد، خادم طلبة العلم احمد بن محمد بن احمد: لما أطلعت على منظومة الامام المفتن المحقق البليغ الاريب الاديب المدقق أشعر الشعراء وأعلم العلماء، أبلغ البلغاء وأفصح الفصحاء. محمد الشهير بابن الحاج، يسر الله لي ولهما من الخيرات كل حاج، وجدتها وافية للمقصود، شافية للمفئود؛ اذ حوت جماهير مشاهير أوصافه -صلى الله عليه وسلم- ما تنصُّ الركائب اليه. وزوت من خصائصه وخصائص أمته ما لامزيد عليه... تا دەڵێ: ناويا أن أسميه بعد ختمه حقائق دقائق الدرر في شرح نظم محاسن الغرر...»

کۆتاییەکەی نەماوە و مێژووی دانان و نووسینەوەی دیار نییە و، هیچیش دەربارەی دانەرەکەی نازانم.

دەستی چەپەڵی تەماع لە هاوڕێکانی دابڕیوە.

عەبدوڕەحمان مەلا ئەحمەد ناوێ لەتەک دەیان دەستخەتدا هێناونی، شتی زۆر نایاب و شوێنەواری بنەماڵەیان تێدایە.

## نور الفؤاد لطالب المراد

٣٢٣

٢/٣٦٣١٩ و ٢٣٣٥٦ د.ع

دوو نوسخەی ئەم کتێبە بەو ژمارانەی سەرەوە لە (د.ع)دا پارێزراون، سەرەتای دانراوەکە ئاوایە:

وبعد: فهذه فوائد لطيفة وفرايد شريفة جمعتها للمحصلين ليزدادوا بإمعان النظر فيها علماً وكمالا.

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«فلنكتف بهذه القدر فان الزيادة عليه مما يفضى الى السآمة والكدرة للناظرين. لاسيما لطلبة هذا الزمان لان لتحصيلهم موانع جمة، وأفئدتهم مشحونة بأنواع الغمة. ثبتنا الله وإياهم على الحق بجاه النبي الاكرم -صلى الله عليه وسلم- تمت الرسالة المسمى (!) بنور الفؤاد لطالب المراد في العلم ومنشأ الخلاف للفاضل المحقق العلامة محمد أفندي أربيلي رحمه.

وەک دەبینی ئەم نوسخە -کە نوسخەی ٢٣٣٥٦-ە مێژوو و ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە. ئەوەندەی تێدایە دەڵێ دانراوی مامۆستا مەلا محەمەدی ئەربیلییە، نوسخەکەی دی ئەمەیشی تێدا نییە و، خەتی نوسخەکەی دی خۆشترە بەڵام ئەمەیان هەڵەی کەمترە.

چەند مامۆستامان هەیە کە ناویان محەمەدی ئەربیلییە، بەڵام کە ناوی باوکی ئەم مامۆستا نەزانین و مێژووی سەردەمی ژیانیشی نەزانین دەبێ جارێ هەروا چاوەڕوان بین بەڵکو لەمەولا شتێ بەشتێ بکەین.

## ئەحمەدی کوڕی عوثمان

### ٣٢٤

ئەم مامۆستایش مامۆستایەکی مەزنی کوردە، کە بەداخەوە لە مێژووی زانا و ناودارانی کورددا ناوی نییە، لەوانە بووە بەیەکجاریی ناوی پشتگوێ بخرێت و وەک زۆری دیکە ئەمیش لەبیر بکرێت. تەنانەت خەریک بووە ئەو تاکە شوێنەوارەیشی کە ئێستە باسی دەکەین بدرێت بەزانایانی دیکە؛ چونکە ئەم مامۆستا لە سەرەتای دانراوەکەیدا هیچی نەوتووە. بۆیە یەکێک هاتووە لەسەری نووسیوە:

«هذه حاشية لمولانا أحمد الأول بن حيدر الأول لعصام الدين الوضع».

بەڵام مامۆستایەکی دی -کاری ڕاست بێت- هاتووە خەتێکی بەسەر (الأول ابن حيدر الأول)دا هێناوە و لە خوارییەوە نووسیویە: (ابن عثمان) خۆشبەختانە نوسخەیەکی دی هەمان کتێبم لەناو کۆمەڵێک حاشیەدا -کە هەموویان بەسەر عصام الدين وەضعەوەن- دۆزیەوە لەوێیشدا هەر بۆ مامۆستا مەلا ئەحمەدی کوڕی عوثمان دانراوە. بەڵام جارێکی دیش بەداخەوە -ئێستە- لەمە زیاتر دەربارەی ئەم مامۆستا نازانین و، تەنها سەرەتا و کۆتایی دانراوەکەی دەخەینە ڕوو.

دەستخەتی ژمارە (٥١٠٧)ی (دار العراق للمخطوطات) کۆمەڵێک دانراوی تێدایە یەکێکیان ئەم دانراوەیە کە سەرەتاکەی ئاوایە:

«قوله: هذا ما استفدته: الأولى ما حصلته. لئلا يتوهم الدور، لأن الاستفادة طلب الفائدة فيلزم التعريف بنفسه...»

کۆتاییەکەی:

«والفعل والحرف اذا استعملا في انفسهما لايكونان فعلاً وحرفاً، فلا يحتاج الى التقييد لتصحيح الحكم. تمت النسخة الشريفة المنسوبة الى مولانا أحمد بن عثمان».

بەداخەوە نووسەرەوەکەی نە ناوی خۆی و نە مێژووی نووسینەوەی نەنووسیوە.

نوسخەی دووەم لە (دار العراق للمخطوطات)دا بە ژمارە (٤٣٤٤) پارێزراوە و لەسەری نووسراوە:

الحاشية الأولى أحمد بن حيدر الأول

الحاشية الثانية أحمد بن عثمان

الحاشية الثالثة ابراهيم بن حيدر الثاني

الحاشية الرابعة حيدر بن أحمد الأول

على الشرح المسمى باسم شارحه مولانا عصام الملة والدين، على الرسالة المسماة بـ(عضدية) في علم الوضع.

خۆشبەختانە نووسەرەوەی ئەم نوسخە لە کۆتایی ئەم حاشیەوە نووسیویە:

«تمت الحاشية المنسوبة الى السلطان المدققين وبرهان المحققين مولانا أحمد بن عثمان عفاه الملك المنان وأسكنه بحبوحة الجنان. سنة ١٢٠٦».

لەمەوە -هیچ نەبێ- بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم مامۆستا پێشساڵی ١٢٠٦ کۆچی دوایی کردووە.

## البحر الجمان في بيان معضلات القرآن

٣٢٥

٣٧١٩٠ د.ع

ئەم کتێبە دانراوی ئەحمەدی کوڕی محەمەدی ناسراو بە (ئیبنو ئادەم)ە.

سەرەتاکەی:

الحمد الوصف بالجميل جعل خلق الظلمات والنور... وقيل أريد بهما الليل والنهار...

بەداخەوە دەستخەتەکە تەڕبووە و کووژاوەتەوە و زۆری باش ناخوێنرێتەوە.

حاشیەی زۆری دانەرەکەی بەسەرەوەیە.

کتێبێکی گەورەیە (٣٥٠) لاپەڕە دەبێت، بەخەتێکی ورد نووسراوەتەوە، لاپەڕەی ٢٠ دێڕی تێدایە بێجگە لە حاشیەی زۆر. وەک وتمان.

کۆتاییەکەی:

«والحمدلله على اتمام هذه القدر من كتاب بحر الجمان في بيان معضلات لغات القرآن، وأكمل الصلاة وأمثل السلام على من أنزل اليه خير الكلام، وعلى آله وأصحابه نجوم الاقتداء وأزمة الاسلام.

نجز تحريره بمرقم مؤلفه أحقر العباد الى رب العالم أحمد بن محمد بن آدم بين العصرين [عيام الاهـ هود!] لتسع خلون من سنة ١٢٤٦ بقرب قرية سنجاغ من قرى قصبة ساوغبلاغ.

بەگوێرەی ئەوەی دەڵێ (هذا القدر)[1] دەبێ ئەم کتێبە، لە بنەڕەتدا، لەمە زۆرتر بێت و، تا ئێستە هەر ئەمەی لە دەستدایە.

وەک دەبینی ئەم بەشە بەخەتی دانەرەکەیەتی.

---

(١) بەڵام تەعلیقاتەکانی تا کۆتایی قورئان دەڕۆن.

## مامۆستا مەلا مەحموودی بازیانیی

### ٣٢٦

لە دەستخەتی ژمارە (٧٨٩٠ د.ع)دا دوو پەڕە بەهەڵە کەوتوونەتە ناو دەستخەتەکە، دوو پەڕەکە پاشماوەی کتێبێکی مامۆستایەکن کە ناوی خۆی و مەدرەسەکەیم لەناو مەدرەسەکاندا نەدیوە، بەڵام پێشتر ناوی دانراویم نەدیوە.

کۆتایی دوو پەڕەکە ئاوایە:

«قد تم تحرير هذه الحاشية الشريفة الواقعة في بحث الاشتقاق من كلام الامجد الاعز الكرام، العالم العامل الفاضل المدقق لجميع أنواع الكلام أستاذي العلامة السيد محمود البازياني -حفظه الله- عن جميع المصائب والآلام بحرمة سيدنا محمد -ص- المبعوث من أشرف الأنام. على يد الحقير الفقير عبدالسلام ابن الامام، الغريق في بحر العصيان والآثام لأجل... ابن الامام الكوي. اللهم أحصل له المقصود والمرام آمين في ١٨/ن سنة ١٢٥٥.

ئەوەندە لەم نووسینە وەردەگیرێ کە مامۆستای بازیانیی لە ساڵی ١٢٥٥دا لە ژیاندا بووە.

## حاشیەی مەلا محەمەدی بالیسانی بەسەر شەرحی عیصامی عەضودیەوە

### ٣٢٧

سەرەتاکەی:

«أما بعد: فلما عم الفيض جميع النفوس بحسب استعدادها، وتوصلت بأنفاس من طارت صيته في الأرض وآفاقها، حيث كتب لي إجازة التدريس في العلوم كلها بالمدينة المنورة أفضل الصلاة على... العالم العامل المولى الفاضل المدني الشيخ ابراهيم الشهراني، وأجازني في التحشية على إطلاق فاضل الدهر رسول الزكي. بعد ما ألحّ عليّ من هو بمنزلة ولدي صاحب النفس والفهم الجلى أن أعلق حواشي على شرح العصام العضدي... توجهت نحو مراحه...»

کۆتاییەکەی:

«... المطلق الوضع هذا... الحاشية الواقعة على عصام الدين لمولانا محمد بالساني، ونقصانه من جانب النسخة. تمت من يد الفقير الحقير الراجي الى عفو الملك الكريم محمد بن ابراهيم بن محمد بن رسول بن علي بن أحمد بن و نازانم!!».

له ناميلكەی پێش ئەمەدا دەڵێ:

«من يد الفقير الحقير الذي أغرق في بحر الذنوب على الدوام محمد الأزمكي لأجل أستاذي الفاضل الكامل الوارع المتصف بالصفات التي رضى عنها الملك الباري، مولانا وبالحقيقة أولانا ملا غزايي...»

## ناميلكەيەكی مەلا محەممەدی كوڕی عەلی باليسيی

### ٣٢٨

دەستخەتی ژمارە (١٩٩٥٤ د.ع) بەشێكە لە دەستخەتێكی گەورە و، یەكێك لەوانەی بازرگانیی بەدەستخەت و پارچە پارچە كردنیەوە دەكەن، پارچە پارچەی كردووە و، نازانین چەند پارچەی دیكەی لێ كردووەتەوە. ئەم بەشەی كە لە دەستدایە و باسی دەكەین كتێبێكە لە باسی تەریقەت و ویرد و زیكر و ئەو بابەتانەدا.

ئەم كتێبە دانراوی مامۆستایەكی كوردە و لە ناوەكەی بەولاوە شتێكی دیكەی دەربارە نازانین و نەماندیوە. لەم بوارەدا یەک دوو دێڕ لە پێشەكیەكەی دانەر دەخەینە بەرچاوی خوێنەران بەڵكو ئەگەر لەمەولا شتێكی دی دەربارە دۆزرایەوە بخرێتە پاڵ ئەمە و مێژووی ژیانی ڕوون ببێتەوە. دانەر دوای حەمد و ثەنا و صەلات و سەلام لە چەند دێڕدا دەڵێ:

«اما بعد: فيقول الفقير المأصور تحت أعباء الذنوب، الحقير المكتسي بأثواب العيوب محمد بن علي باليسي، أغفر لهما يا غفار الذنوب: إن أهل طريق الله المحفوظ عليهم اداب الشريعة ومكارم الطريقة أكرم الخلق على الله...»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«اللهم كما وفقتنا للاتمام فوفقنا للعمل كما تحب، ونستغفر الله مما جرى به قلمي وتحركت به بناني، مما يخالف أعمالنا، ونستحي منه لقبح سيآتنا، ونعوذ بالله من حسناتنا وسيآتنا. ونرجو من الله أن يغفر لنا زلاتنا، ويعفو عن قبيح

خصالنا، بمنه وكرمه وأن يحشرنا وأهلنا وأولادنا وسائر أحبتنا في زمرة أحبائه وأوليائه، إنه جواد كريم رؤوف رحيم...»

لە دوای ئەمەیش یەک دوو نامیلکەی بچکۆلەی بێ ناونیشان هەیە. بەڵام نە ناوی نووسەرەوە و نە مێژووی نووسینەوە و نە شوێنی نووسینەوەیان دیاریی نەکراوە.

لە ڕوویەکی دییەوە:

وەک گوتمان لە دەستخەتەکانەوە شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەم مامۆستای بالیسانییە وەرناگیرێ، بەڵام کە جارێکی دیکە و لە ڕوویەکی دییەوە سەرەتاکەی مامۆستا خۆی کە بۆ حاشیەکەی نووسیوە دەخوێنینەوە دەگەینە شتێک کە سەردەمی ژیانی مامۆستامان بۆ دەربکەوێت، چونکە مامۆستا دەڵێ: لەلای مامۆستا مەلا ئیبراهیمی شارانیی و مەلا ڕەسوولی زەکی ئیجازەی وەرگرتووە. مامۆستای شارانییش ساڵی ١٠٢٥ لە دایک بووە و، ساڵی ١١٠١ کۆچی دوایی کردووە، واتە مامۆستای بالیسانیی لە سەدەی یازدەی کۆچیدا ئیجازەی وەرگرتووە و لە ژیاندا بووە.

## معراج الادراک فی تشریح الافلاک

### ٣٢٩

ئەم کتێبە دانراوی مامۆستا مەلا محەمەد باقری کوڕی مەحموودی بانەییە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

ويعد: فيقول الفقير الى الله الغني محمد باقر بن محمود الباني: لما كان المختصر المسمى بتشريح الافلاك في فن الهيئة...

کۆتاییەکەی:

قد يكون بالتقريب وقد يكون بالتحقيق وفقني الله على ختم الكتاب بالتحقيق حامداً له تعالى على الاعانة والتوفيق، مصلياً على رسوله سيد أهل التحقيق وعلى آله وأصحابه الفائزين الفايضين! بالتصديق. وأنا المفتقر الى عفو الغني الودود محمد باقر بن محمود.

ئەم مامۆستا لە پێشەکیی کتێبەکەیدا کتێبەکەی پێشکەش بەمحەمەد پاشای والیی کوردستان دەکات و لەم ڕووەوە نووسیویە:

وجعلته هدية الخدام لأمير الأعظم، والمطاع الأكرم الافخم، مالك رقاب الامراء والأساطين، ومفتخر الأكابر من الملوك والسلاطين، ناصب لواء المعدلة والانصاف، قامع بنيان الجود والاعتساف، ملجأ الفقراء والمساكين، وملاذ العلماء والصالحين. فائز الحكمتين العلمية والعملية، حايز الرياستين الدينية والدنيوية، صاحب المناقب والمفاخر، قدوة الاماثل والأكابر، أعني به والي جميع ولايات كردستان، محمد پاشا ابن المرحوم المغفور المبرور خالد پاشا...

بەژمارە (٢٠٤٥٨ د.ع) پارێزراوە.

نوسخەیەکی دی ئەم دانراوە لە کتێبخانەی ئەوقافی بەغدادا بەژمارە ٥٥٠٣ پارێزراوە[١]. عوثمانی کوڕی مامۆستای دانەر نووسیویەتیەوە، لە ١١ی ڕەمەزانی ساڵی ١٢١١دا مۆری مەحموودی کوڕی مەعرووفی بەرزنجەیی پێوەیە.

## الدرة السنية في شرح الفريدة الالفية

٣٣٠

تقريظ لحضرة مفتي المدينة المنورة السيد محمد زين العابدين ابن محمد الهادي البرزنجي الحسيني الموسوي كان الله له وبلغه أمله:

حبذا درة العلوم السنية — شرح عقد الفريدة الألفية
قد حوت كل مبحث مستجاد — حسدته مصاقع العربية
عقد در في سمط تبر جليّ — بل وبدر للانجم الزهرية
درة في الزمان ضاء سناها — فهي في الباب للأنام هدية
بنت فكر الجلال قدّس سراً — خطبتها ذوو النفوس العليّة
فارتضت منهم الامين وماطت — عن صفات من الجمال جليّة
حرس الله ذاته وحماه — وبه لمّ شمل كل البرية
وأبنه الكامل النجيب فيحيى — دارس العلم حيث فيه بقية

بەژمارە (١٠٦٠٤ د.ع) پارێزراوە.

(١) بەداخەوە وەک کارەساتێکی دڵتەزێن هەواڵی ئەوە دەنووسین کە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی بەغدا لە شەڕی ڕزگاری عێراقدا سووتا و تێکچوو لەوانەیە ئەو دەستخەتانە هەموویان تێدا چووبن.

## شرح سيرة الخلفا من ذات الشفا: ماموّستا مەلا محەمەدی بەرزنجیی

### ۳۳۱

کتێبی (ذات الشفا) لەناو زانا و خوێندەوارانی کوردستاندا بایەخێکی باشی پێدراوە و مەلا و فەقێ هۆگری بوون و، لەباتی کتێبەکانی دیکەی سیرەت پشتیان پێ بەستووە و سوودیان لێ وەرگرتووە، هەر لەبەر ئەو بایەخەیش بووە کە کەڵە مەلایانی کورد لایان لێ کردۆتەوە و چەند کەسیان شەرحیان کردووە، شەرحەکەی ئیبنولحاج بەناوی (رفع الخفا)وە زۆر باو بووە و ئەوەبوو لەم دواییەدا بەلێکۆڵینەوەوە چاپکرا. ماموّستایەکی دیکەیشمان کە ناوی نازانم بەفارسی شەرحی کردووە.

لەم ماوەیەشدا ئەم کتێبەمان لە (دار العراق للمخطوطات)دا دۆزییەوە کە بەژمارە ۱۶۰۵۸ پارێزراوە. ئەوەی لەم کتێبەدا تازەیە ئەوەیە ماموّستای بەرزنجیی دانەری تەنها بەشی سیرەتی خەلیفەکانی پێغەمبەری جیاکردوەتەوە و شەرحی کردووەتەوە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

بسم الله الرحمن الرحيم

وبه ثقتي:

هذا شرح سيرة الخلفاء من ذات الشفا. خلافة ابي بكر الصديق. أما ابوبكر الصديق كان اسمه في الجاهلية...

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

يأتي آخر الزمان من ولد فاطمة يملأ الأرض عدلاً كما ملئت ظلماً، وإنه يقاتل في الملحمة، ويفتح القسطنطنية، ويخرج الدجال في زمنه، وينزل عيسى -عليه الصلاة والسلام- ويصلي خلفه. وما سوى ذلك كله أمور مظنونة أو مشكوكة والله أعلم بحقيقة الحال، ونعوذ بالله من الزيغ والضلال والغلبة في المقال.

والحمدلله على كل حال، والصلاة على حائز قصب الكمال في الغدو والآصال، وعلى آله وصحبه خير صحب وآل. غفرالله لنا ولوالدينا وآبائنا وإخواننا طنباً ودنياً وقلباً ولجميع امة محمد آمين. مؤلفه الفقير الى الله تعالى محمد بن الرسول بن عبدالسيد العلوي الحسيني الموسوي الشهرزوري البرزنجي ثم المدني عفا الله عنه. ختمتها يوم الأربعاء بين الصلاتين، حادي عشر شهر الله الحرام

ذي القعدة من شهور سنة ستة وثمانين وألف بالمدينة النبوية بمنزلي بالزقاق المعروف بسويقة، حامداً ومصلياً مستغفراً محتسباً محوقلاً، داعياً بالمغفرة للمسلمين والمسلمات، جعلها الله ذريعة ليوم الميعاد، وبجاه سيد العباد آمين. وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين والحمدلله رب العالمين. وقد وقع الفراغ من يد أحقر العباد جامي ابن أبابكر، بن بهلول، بن احمد بن عيسى. اللهم أغفر لنا ولهم ولجميع المسلمين آمين ١٢١٣٠.

له سەرچاوەکانی بەردەستماندا وەک معجم المؤلفين و، مەشاهیرەکەی مامۆستای ڕۆحانیی ناوی ئەم دانراوەی مامۆستای بەرزنجیم نەدیوە،

هەروەها مامۆستا (یوسف مەجمەر)یش شەرحی (ذات الشفا)ی کردووە و، لە بەرگی سێیەمی ئەم کتێبەدا باسیم کردووە.

## مامۆستا مەلا ئیبراهیمی بەرزنجیی

### ٣٣٢

مامۆستا شێخ ئیبراهیمی کوڕی محەمەدی ئیبراهیمی بەرزنجیی، مامۆستایەکی گەورەی کورد بووە و، ڕێگەی کەوتوەتە بەغدا و، هەر زوو بەبۆنەی زانیاریی و پلەی خوێندەواریی بەرزیەوە جێگەی خۆی کردۆتەوە و بووە بەمامۆستا و پێشنوێژی شافیعیی لە مزگەوت و مەدرەسەی شێخ عەبدولقادری گەیلانیدا، بەڵام بەداخەوە دوای خۆی شوێنەواری پرژوبڵاوبووەتەوە و، لەوانەیە زۆریشیان تێدا چووبن و، شتێکی ئەوتۆ لە ژیانی نازانین.

لە (دار العراق للمخطوطات)دا دوو دەستخەتی نایابیم دی کە دوای خۆی کەوتوونەتە لای بنەماڵەی ئالووسیی.

دەستخەتی یەکەمیان بەژمارە ٣٠٢٣٠ پارێزراوە و، حاشیەیەکە بەسەر شەمسیەوە و نوسخەیەکی زۆر نایابە و بەخەتێکی زۆر جوان نووسراوەتەوە.

دووەمیان: دەستخەتێکی گەورەیە، کۆمەڵێک دانراوی تێدایە، ساڵی ١٢٣١ نووسراوەتەوە و بەژمارە ٣٠٣٠٠ پارێزراوە و، بەوەی کە دەستخەتەکانی ساڵی ١٢٤٧ کەوتوونەتە لای ئالووسیی، پێش ئەو ساڵە کۆچی دوایی کردووە.

(ابراهيم الدروبي)ش ئاوا باسی دەکات:

ئیبراهیمی بەرزنجیی مامۆستا بووە لە حەزرەتی گەیلانیی و، مەرجەعی فەتوا بووە و

دیوەخـانێکی گـەورەی لە مـاڵی خـۆیدا لە (باب الشـیخ) هەبووە زانا و ئەدیبـان تیـایدا کـۆبوونەتەوە. سـاڵـی ١٢٧٠ک/١٨٥٣ز کـۆچی دوایی کـردووە، عـەبدوڵڵای کـوڕی بوو بەجێنشـینی، ئەمیش وەک باوکی زانا بووە و (موتەوەلی) ئەوقـافی (نایلە خاتوون) بووە، سـاڵی ١٣١٠ک/١٨٩٢ز کـۆچی دوایی کـردووە و، مـحـەمـەد بەرزنجـیی کـوڕی کـە بووە بەپێـشنوێژی شـافـیعـییـەکـان لە مزگەوتی گـەیلانیی شـوێنی گـرتوەتەوە، ئەمـیش سـاڵـی ١٣٤٧ک/١٩٢٨ز کۆچی دوایی کردووە[1]. بەگـوێرەی هەندێ زانیـاریی دیش کە لە لامە سەید عەبدوڵڵای کوڕی ئەم مامۆستا مەلا محەمەدە دوا نەوەی ناسراوی ئەم بنەماڵە بووە و، ئیـتر لە بەغـدادا تواونەتەوە و، ناویان کـووژاوەتەوە. لە پەتای ناوی ئەم بنەماڵەیشدا دەڵـێین: دەبێ چەند بنەمـاڵەی دیکەی کـورد بووبن بە (بنەمـاڵـەی بەغـدادیی) و لە بەرزنجەیی و، قەرەداغیی و، پشدەریی و، ڕۆژبەیانیی و... شۆرابنەوە؟!

## ناملکەیەکی بچکۆڵە لە مەتنیقدا

## ٣٣٣

سەرەتاکەی:

قوله: وقد اضطربت كلمة الشراح هنا. عبدالله يزدي

أي: اختلف! كلمتهم في بيانها وتقريرها، أي أختلفوا في تقرير وبيـان تلك الانحاء وتصويرها.

کۆتاییەکەی:

لقد لخصنا المرام في الحشين(!) اللهم خلصنا من النار وأعطنا المرام في الدارين. وقد جئنا به بعد اكثار المطالعة وشدة الاعتناء، ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء، وأنا أحقر العباد الى نجاة المنجي محمد ابن محمد امين البرزنجي. كتبه المصطفى الأربيلي. اللهم وفقه في الدين والدنيا آمين.

بجاه سيد المرسلين.

مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە

---

(١) بڕوانە: البغداديون أخبارهم ومجالسهم. تأليف ابراهيم عبدالغني الدروبي. دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد. ٢٠٠١.

هەندێک تازەیە، سەعدەدین مەسعوودی گەردیی لە بەشەکانی دیی دابڕیوە.
بەژمارە (٣٥٨١٧ د.ع) پارێزراوە.

## دانراوێکی دیی مامۆستا مەلا مەحموودێکی دی

### ٣٣٤

پێش ئەم دوو پەڕە کتێبێکی دی هەیە بەناوی (شرح الظروف) کە دانراوی مامۆستایەکە بەناوی مەحموود کوڕی ئیبراهیم و شەرحی (الظروف)ی مامۆستا مەلا حەسەنی زەردەبەنیی بانەییە، کە پێشتر باسیمان نووسیوە و، چەند مامۆستایش شەرحی بەرهەمەکانییان کردووە. مامۆستا مەلا مەحموود ئاوا سەرەتای کتێبەکەی نووسیوە:

«أما بعد: فيقول العبد الضعيف المحتاج الى عفو مولاه اللطيف محمود بن ابراهيم -رحمة الله عليهما وعلى جميع المسلمين آمين يارب العالمين-: لما لم يكن للكتاب المسمى بالظروف شرح، وهو من مصنفات الفاضل العالم العامل ملا حسن الزردبني، تغمده الله بغفرانه وأسكنه في وسط جنانه...» دوایی دەڵێ: «سميته بشرح الظروف»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«تم شرح الظروف، بعون الملك الرؤوف، من فهم الحقير الفقير المحتاج الى عفو الله القدير محمود بن ابراهيم، على يد أحمد بن محمد بن حسن بن اسماعيل بن مولود غفرالله لهم ولسائر المسلمين آمين والحمدلله رب العالمين. تم في ١٢٢٦.»

لە سووچێکیشیەوە نووسراوە:

«تأليفه سنة ألف ومائتين وخمسة عشر من الهجرة النبوي! ١٢١٥».

لە پێش ئەم کتێبەیشەوە نامیلکەیەکی بچکۆڵەی ئەم مامۆستا هەیە لە باسی جیاوازیی لە نێوان (الفعل) و(اسم الفاعل)دا و سەرەتاکەی ئاوایە:

«الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيد الأولين والآخرين وعلى آله وأصحابه بآدابه المتأدبين. أما بعد فأقول: اعلم أن الفرق بين اسم الفاعل والفعل حيث قالوا: إن اسم الفاعل مع فاعله مفرد والفعل...»

کۆتاییەکەی:

«... تأمل فاحفظه لأنه نافع إن شاء الله تعالى هذا ما قاله فكري النائل بعون الله القادر محمود بن ابراهيم. رحمة الله علينا وعلى جميع المسلمين آمين يارب العالمين.

باسێکی دەستخەتەکە:

ئەم دەستخەتە کە بەژمارە (٧٨٩٠ د.ع) پارێزراوە بریتییە لە چەند دانراو و نامیلکە کە کاتی خۆی شڕ و پەڕپووت بوون و دوایی بێ گوێدانە ناوەڕۆکیان یەکخراونەتەوە و، ئەمەیان لێ پێکهێنراوە کە ئێستە لە دەستدایە و نامیلکەی دوایی هۆنراوەی (حديقة السرائر في نظم الكبائر)ی بێتووشییە، ئەمەیان بەخەتی زەلامێکی دییە و ساڵی ١٢٧٤ نووسراوەتەوە و ناوی کەسی پێوە نییە.

## مشكلات الطالبين

### ٣٣٥

دانراوی: شێخ حسەینی کوڕی شێخ عەبدوڵڵای بەرزنجیی.

(حسەینی کوڕی شێخ محەمەدیشی پێ دەڵێن).

سەرەتاکەی ئاوایە:

وبعد: فيقول العبد الفقير الى رحمة ربه القدير حسين بن عبدالله عفا الله عنهما: فلما جمعت هذه الرسالة سميتها مشكلات الطالبين. وجعلتها على خمسة أركان: الركن الأول في بيان الصرف، والثاني في بيان النحو، والثالث في بيان المنطق. والرابع في تعريفات البيان والمعان. والخامس في بيان تعريفات الفقه...»

کۆتاییەکەی:

«تمت الكتاب المسمى بمشكلات الطالبين، من مصنفات شيخ الكامل المكمل والعارف الواصل المتصل محي الملة الملة (كذا) والدين، هادي السالكين الى منهاج نبي الأمين، الشيخ الشيوخ الشهير المعروف بغير ابيه وأجداده العريف العالي العلوي البرزنجي الساكن المتوطن بالقوجلري، وهو حسين بن شيخ

محمد بن شیخ احمد بن شیخ عبدالله کوسه بن شیخ عبدالقادر بن شیخ معروف بن شیخ مصطفی بن شیخ خلیل بن شیخ اسماعیل...»

بەژمارە (٢٣٣٦٤ د.ع) پارێزراوە.

کۆتاییەکەی نەماوە و ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەیشی نازانرارێ، کۆن دیار نییە.

## ترغیب الانام

### ٣٣٦

٢٦٧٨٩ د.ع

ئەم ژمارە دەستخەتێکە بەپێی کۆتاییەکەی ناوی (ترغیب الانام)ە عەبدورەحمانی کوڕی دانەوەکەی -کە نازانین ناوی چیی بووە- ساڵی ١٣٣٩ نووسیویەتیەوە.

دەستخەتەکە لە ڕێگەی (...) گەیوەتە (د.ع) و، (...) نەزانانە لە مقەبای گرتووە و، بەمەقەست سەروگوێی قرتاندووە و، گەلێ وشە و پیتی بڕیوە! لە مقەبا تێگرتنەکەیشیدا پاش و پێش کەوتن ڕوویداوە!

سەرەتاکەی ئاوایە:

أهل طغوی ظاهر افعالشان    مي کند تکذیب قیل وقالشان
حکایت بر سبیل تمثیل ودلیل بر    ما سبق ومقدمة بر ما سیأتي...
درگبتاو از لاحقات شهرزور    بود شخصی ازد یار عقل دور
اتفاقاً کرد عزم کاروان    بارفیقان ظریف و نکتەدان
توشه اش در نیمەره نابود شد    زاتش غم سینه اش پر دود شد

کۆتاییەکەی:

اي مبشر با صلاة صابران    نصرة اسلام ده بر کافران
صل یارب علی خیر الانام    الف آلاف صلاة مع سلام
هم درود بیحساب و بیشمار    بر روان آل و أصحاب کبار
باجناب تابعان ظاهرین    بر حق أحکام قرآن مبین.

## شەرحی هەژدە بیت

### ٣٣٧

دانراوی مامۆستا شێخ عەبدوڕەحمانی (خالص) تالەبانیی.

سەرەتاکەی، دوای هەندێ پێشەکی:

«وبعد حقير فقير خاكسار عبدالرحمن المفوض بالله ابن الشيخ أحمد ابن الشيخ محمود القادري الطالباني الكركوكي كة من العهد الى المهد ومن المهد الى العهد آتش محبت طائفه درويشان در دل و سوداي مولدي ايشان در دماغ دارد باستفالهء معاني...»

کۆتاییەکەی:

«محرم اين راز نه بود فهم عام
دم فروبايد كشيدن والسلام
تمت كتابة هذه الرسالة الشارحة لبعض أبيات المثنوي بقلم الحقير الفقير المذنب مصطفى ابن الشيخ ابراهيم الحريري البابا جيچكي القادري حسب إشارة قطب العارفين غوث الواصلين الشيخ المؤلف لهذه الرسالة ادام الله ظلاله على المسلمين برحمتك يا أرحم الراحمين سنة ١٢٦٤.»

شایانی وتن و نووسینە ئەم نووسەرەوە بەڕێزە خەتخۆش و وریا و ورد بووە و، شیعریشی لە کۆتایی دەستخەتەکەوە هەیە، بەڵام هیچی تری دەربارە نازانین.

دەستخەتەکە ٢٣ لاپەڕەیە، هەر لاپەڕەی ١٤ بەیتی تێدایە، وەک گوتمان بەخەتی مامۆستا (حەریری)یە. لە (د.ع)دا بەژمارە (١٨٨٨٦) پارێزراوە.

## الاصطرلاب

### ٣٣٨

دانراوی «ابو الحسن كوشياري ابن لبان ابن باشهري الجبلي»

سەرەتاکەی:

«الحمدلله رب العالمين. وصلواته على انبيائه ورسله أجمعين. قال أبو الحسن كوشيار: الاسطرلاب كلمة يونانية، وأشهر ما قيل في معناه ميزان الشمس.

کۆتاییەکەی:

«وکان الفراغ منه بالجزيرة المحروسة في أواخر شهر جمادي الآخر المبارك. ٨٦٨ هجر (كذا) وكتبه العبد الراجي رحمة ربه وغفرانه عبدالله ابن الصاحب نورالدين ابن الصاحب عيسى الجزري المسيحي رحم الله تعالى من قرأ فيه وترحم عليهم آمين. والحمدلله رب العالمين.

دەستخەتەکە لە (دار العراق للمخطوطات)دا بەژمارە ٢٦٢٤٩ پارێزراوە. هەندێک شڕ بووە و قەراخەکانی خوراوو پواون ١٠٠ لاپەڕ دەبێت. لە قەوارەی ناونجی.

دەبێ لێرەدا ئەوە بگوترێ کە (ابن اللبان)ێکمان هەیە عەززاویی بەم جۆرە باسی دەکات: زانای پێشەوا محەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدولمۆئمینی سعرتی ناسراو بە (ابن اللبان) ساڵی (٧٤٩) کۆچی دوایی کردووە.

تەفسیرێکی هەیە بەناوی (ابن اللبان) تاکە نوسخەی لە (المکتبة الخديوية)دا بەژمارە ٩ پارێزراوە. (بڕوانە: تأريخ التفسير، عباس العزاوي د.ع، ل: ١١٤).

## مەلا زەینی چۆڵەمێرگی

٣٣٩

دەستخەتی (٣١٥٩٩ د.ع) دانراوێکە لە شەرحی ئیستیعارەدا، دانراوی مامۆستایەکی کوردە، تا ئێستە دانراوی دیکەیم نەدیوە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

«بسم الله الرحمن الرحيم وبه العون، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم. قوله: إن أحسن آه قد أحسن الشارح رحمه الله بأن حمد الله بأحسنية جنس ما حمد به المصنف شكراً.»

کۆتاییەکەی:

«... بأن يكون للمشبه رادف، وشيبه (كذا!) رادف اشبه به كما هو مذهب صاحب الكشاف، ومن تبعه. تمت الحاشية المسماة بملا زين چوله مركة الواقعة على مولانا عصام الدين. على يد الفقير الحقير مرتضى بن يحيى چلبي العمري القرشي سنة الف وتسعين من الهجرة النبوية».

## نامیلکەیەک لە (اسطرلاب)دا

٣٤٠

دانراوی: حەیدەری کوڕی سەیید عەبدوڕەحمانی جەزەریی.

سەرەتاکەی:

الحمدلله الذي زين السماء الدنيا بزينة الكواكب...

«اما بعد: فيقول أفقر الخلق الى الله الغني حيدر بن سيد عبدالرحمن الحسيني الجزري: لما كان علم الاسطرلاب في ذاته علماً شريفاً، ولمساس الحاجة ممسكاً انيفاً، وكان المتداول من رسائله رسالة فارسية، مع انها لم تكن لأقصى مقاصده وافية، عربتها ملخصة على أحسن ترتيب هو مسلك الصواب، وأضفنا اليها زوائد هي المطمح في عمل الاسطرلاب...»

کۆتاییەکەی:

«فخارج القسمة هو الظل للارتفاع المطلوب فيستعمل منه بما مر في الباب الأول.

الحمدلله مبدءاً ومنتهى، والصلاة والسلام على أفضل مخلوقاته محمد سراً وعلناً وعلى اله الطيبين الطاهرين ابداً سرمداً.

تمت رسالة الاسطرلاب بيد أحقر الطلاب، ايوب المنهمك في الاذناب، حسب أمر العالم العامل والفاضل الكامل الحاجي ملا محمد سعيد أفندي أنال الله لما يخفي ويبدي آمين يا مجيب السائلين سنة ١٣٢١.»

دوا دەست -پێش د.ع- لای محەمەد شەریفی کوڕی مەلا عوثمانی کوڕی مەلا عەبدولکەریمی ڕەنگەرەژانی بووە.

دیارە دەستخەتەکە بەشێک بووە لە دەستخەتێکی گەورە و لەبەر (...) بەش بەش کراوە.

## تەعلیقاتی ڕەمەزانی کوڕی ئەبو هورەیرەی جزیری

٣٤١

سەرەتاکەی:

وبعد فيقول الفقير الى الطاف ربه الغني، رمضان بن أبي هريرة الجزري القادري: لما كانت الرسالة المسماة بخلاصة الحساب للبارع في [انحاء!] ما حوته على قاطبة عرفان هذا الباب، بهاءالدين الحسيني، عامله الله بما هو جدير...»

کۆتاییەکەی:

«... هذا وقد اسلنقى عن الكبو لنقل هذه التعليقات من السواد الى البياض تراب أقدام العلماء، وغبار مسالك الفضلاء. من إذا غاب لم يذكر، وإذا حضر لم ينظر، عبده الفقير اليه سبحانه رمضان بن ابي هريرة الجزري القادري، عفا عنهما بعفوه الأزلي، ضحوة الاحد من آخر الشهر المبارك جمادي الأول، سنة ست وسبعين والف من الهجرة النبوية المصطفوية، على هاجرها أفضل الصلاة وأكمل التحيات. قد وقع الفراغ من تحرير هذه النسخة ضحوة الأحد من أول الشهر المبارك ربيع الأول على يد أضعف العباد واحوجهم الى عفو ربه الكريم علامة بن ابراهيم غفر ذنوبهما الرب الرحيم ١١٩٥.»

دەبێ لێرەدا ئەوەیش نەبوێرین کە ڕەمەزان ئاغای جزیری شاعیریشمان هەیە، دوور نییە هەردووکیان یەک کەس و یەک مەلا بن. کە سەرێک لە سەرچاوەکانی ناو و بەرهەمی زانایان دەدەین، ناوی ئەم مامۆستا لە هەندێ سەرچاوەدا دەبینین، بەڵام ئەوانیش شتێکی ئەوتۆیان لەلا نییە. بۆ نموونە لە (معجم المؤلفين)دا هاتووە:

ڕەمەزانی جەزەریی. ساڵی ١٠٩٢ک - ١٦٨١ز لە ژیاندا بووە. ناوی ڕەمەزانی کوڕی ئەبو هورەیرەی جەزەریی قادرییە، دانراوی (حل الخلاصة لأهل الرياسة)ی لە حسابدا هەیە. لە کۆتایی مانگی (جمادي الأولى)ی ساڵی (١٠٩٢)دا لە دانانی بووەتەوە. (معجم المؤلفين ١٧٣/٤).

ئەم کتێبەی ئێمە باسمان کرد ناوی تێدا نییە. لە دەستخەتەکەی لای ئێمەدا هاتووە کە لە کۆتایی مانگی (جمادي الأول)ی ساڵی (١٠٧٦)دا لە دانانی بووەتەوە.

ئەم دوو مێژووە لەیەکەوە نزیکن و ناوەڕۆک و بابەتی کتێبەکەیش یەک شتە.

## کۆمەڵێک دانراو لە دەستخەتێکدا

### ٣٤٢

دەستخەتی ژمارە ٢٩٩٢٤ د.ع

دەستخەتێکی جوانی نایابە بەخەتی نووسەرەوەی بەڕێز عەبدولعەزیزی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی عەبدولعەزیزی بەردەڕەشیی بانەیی عومەری شافیعی مەککیی ساڵی ١٢٩٥ لە شارۆچکەی سابلاغ نووسراوەتەوە.

دەستخەتەکە سێ دانراوی تێدایە:

یەکەم: حاشیەی جامیی چۆڕییە بەسەر شەرح موغنیی میلانییەوە.

سەرەتاکەی:

«الحمدلله الحمد هو الوصف بالفعل الجميل على جهة التعظيم...»

کۆتاییەکەی:

«فان البيان بهذه الكيفية مما لانجده في غير هذا المقام. تمت النسخة الشريفة المسماة بالجامي الجوري على يد الحقير المذنب الراجي الى عفو الملك الكبير، ابن أحمد بن محمد البردرشي الباني عبدالعزيز غفرالله لهم آمين. في سنة ١٢٨٩».

دووەم: مەکتووبی عەقائیدی کاکە ئەحمەدی شێخە بەفارسی، لە سەرەتاکەیەوە دەڵێ مەکتووبێکم لە عەقائیدا نووسیبوو بەڵام بەهۆی ئەوەوە زۆر درێژبوو خەڵک حەزیان لێ نەدەکرد، بۆیە هاتم عەقیدەیەکی بچکۆڵەی باپیرم بابا عەلی هەمەدانیم بەکورتیی نووسیی بەهیوای ئەوەی سوودبەخش بێت.

سەرەتاکەی:

«الحمدلله الباطن الذي لايبلغ أحد عرفان حقيقة ذاته ولا صفاته،والظاهر الذي...

کۆتاییەکەی:

«انهارا بنويسند وجاهلان گوش دهند، وتعلم كنند، والسلام على من اتبع الهدى واجتنب الردى، وعلى المعلمين والمتعلمين والعالمين».

سێیەم: شەرحی شەواهید بە فارسی، تەواو نەکراوە.
چوارەم: حاشیەیە بەسەر هەندێ جێگەی شەرح موغنیەوە، دانراوی سەید حەسەنی چۆڕیی.

سەرەتاکەی:

«اما بعد: فیقول الحسن الحقیر الی مولاه القدیر: لما أمرني رفیقي وهو جناناً! شفیقي أن أضع علی بعض المواضع من المغنی وشرحه حواشي... أحببت امتثال امره لانه أکبر مني سناً، فکتبت اداء للمطلوب ووصولا الی المحبوب، ورجائي أن لا الام علی فساد فیها، فإني ما قرأت الا رسالتین من النحو ورسالتین من الصرف!!»

کۆتاییەکەی:

«والثامن کما في مسلمي رفعاً...»
بەدەستخەتی هەمان نووسەرەوەیە و لە ساڵی ۱۲۹۵دا تەواوی کردووە و، دوا شت نووسیویە:

لەبەرەبەیانی ڕۆژی ۱۹ موحەڕەمی ساڵی ۱۲۷۵ و باوکم لە گوندی تەوەکەڵ –لە کاتێکدا خەڵکی گوندەکە بەهۆی کوژرانی محەمەد ئەمین بەگی کوڕی ئەحمەد بەگی کەندەسوورەییەوە ڕەویان کردبوو- کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ئەو گوندەدا بەخاک سپێرڕا.

## نامیلکەیەک لە باسی (أما)دا

۳٤۳

دانراوی ۳/٦٦٦۰
نامیلکەیەکە لە باسی (اما)دا دانراوی مامۆستایەکی کوردە، کە شتێکی ئەوتۆمان دەربارەی لە دەستدا نییە. لە سەرەتاکەیەوە دەڵێ:

الحمدلله الذي هدانا طریقه المستقیم، ووفقنا علی ما وضعه من الدین القویم، والصلاة والسلام علی من أرسله رحمة للعالمین، وعلی اله وأصحابه الذین کانوا في مناهج الحق سالکین.

وبعد: فيقول العبد المفتقر الى عفو الملك المقتدر حسين بن علي المشتهر بالشيخ [مالك فتى!] من قبائل الدزورّ. لما رأيت كثرة الاختلاف في هذا المقام، وشدة الاعتساف في تركيب هذا الكلام، ويسبب وقع التشوش على بعض الطالبين، وورد التحير على الراغبين. ومع ذلك... عليّ بعض الطلاب لديّ[1]. ان أشرح تركيبه، وأوضح تقريبه. بحيث كشف النقاب...

نامیلکەکە چوار لاپەڕەیە بەخەتێکی وردی خۆش نووسراوەتەوە. لە کۆتاییەوە ناوی کەس و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە دەڵێ:

هذا آخر ما ذكرته في هذا المقال وأرجو من الله المتعال أن يجعله وسيلة في يوم الضلال...

نووسەرەوەکەی هەڵەی نووسینەوەی هەیە.

دانراوی پێش ئەم کە (داودی خوافی)ە بەخەتی هەمان نووسەرەوەیە و دەڵێ:

ناوی مووسای کوڕی خضری کوڕی مووسای کوڕی حسەینی ناسراو بە (جلک)ە ساڵی ١٢٢٥ لە شاری (أربيل) لە مەدرەسەی مەلا عەبدوڕەحمانی مەلا نەبیی (کردی - گەردیی) نووسیویەتیەوە.

## شمایل شرح قطر الندی یسمی الکتاب بشمایل حریري

٣٤٤

لە سەرەتاوە -دوای الحمدلله والصلاة والسلام- ئەڵێ:

وبعد: فيقول أفقر الخلق الى مولاه الغني محمد بن علي بن أحمد الحريري، وفقه الله للعمل في يومه لغده قبل أن يخرج الأمر من يده: كما أن الرسالة المسماة بقطر الندى وبل الصدى التي الفها ملك العلماء ورئيس الفضلاء، ابو عبدالله جمال الدين محمد بن يوسف بن هشام الانصاري رحمه الله [ورادق!] رضوانه عليه، والرسالة جامعة للمهم من المسائل العربية، محتوية على ما لابد منه من المباحث النحوية، كذلك شرحها الفاضل المحقق والامام المدقق الشيخ الجليل عبدالله المشهور بالفاكهي تغمده الله بغفرانه...

(١) لێرەدا پەراوێزێکی داناوە دەڵێ: مەبەست (أحمد بن ابراهيم الكور)ە.

تا دوایی باسی ئەوە ئەکات کە ماوەیەک خەریکی ئەم کتێبە بووە و حاشیەی بەسەرەوە نووسیوە و، تەعلیقاتی لەسەر داناوە... کۆمەڵێک داوایان لێ کردووە ئەو شتانەی کۆبکاتەوە و بیانکات بەشەرحی کتێبەکە، ئەمیش داواکەی جێبەجێ کردووە.

کتێبێکی گەورەیە (٥٠٠) لاپەڕە زیاتر دەبێت، بەخەتێکی ورد نووسراوەتەوە، لاپەڕەی ٢٦ دێڕی تێدایە، هەڵەی نووسەرەوەکەی زۆر زەق و ئاشکرا دەری دەخات کە نیمچە خوێندەوار بووە.

نووسەرەوەکەی ناوی محەمەد بووە ساڵی ١٢١١ھ نووسیویەتیەوە.

کتێبەکە پێش ئەوەی لە د.ع لەنگەر بگرێت گەلێ جێگەی دیوە، لەوانە لای محمد الحسینی القزوینی. ناوەکانی تر بەدەستی چەپەڵ دەستێک کووژێنراونەتەوە.

## شەرحی (لغز - مەتەڵ)ی عەبدوڵلا ئەفەندی عومەریی مووسڵی

٣٤٥

دانراوی: ئیبراهیم فەصیحی کوڕی صبیغەتوڵڵای حەیدەری.

سەرەتاکەی:

أما بعد: فيقول الحقير الطريح، السيد ابراهيم فصيح، ابن صبغة الله مفتي الشافعية ببغداد المحمية، الحيدري البغدادي: لما ورد من الحدباء الى بلد الزوراء لغز يحتوي على نكات لطيفة، ودقائق ظريفة...

کۆتاییەکەی:

«فلا يعرف الفضل غير ذويه. اني والحمدلله تعالى عرفته بحسب الامكان، وإن لم أكن من ذويه. ولا من بنيه وأبيه. والله الموفق للصواب، واليه المرجع والمآب».

ناوی کەس و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە.

لە دواییدا (تقريظ) بەباڵابڕینی (عبدالباقي أفندي الفاروقي) بەشیعر نووسراوە.

دەستخەتی (٢١٢٨)ش کە کتێبی (العمدة في محاسن الشعر وآدابه)یە بەخەتی ئەم مامۆستا (ئیبراهیم فەصیحی حەیدەریی)یە.

## دەستخەتێکی مامۆستا عەزاوی

### ٣٤٦

لە کاتی لێکۆڵینەوەی کتێبی (شهرزور - السليمانية)ی خوالێخۆشبوو عەباس عەزاویدا گەلێ بەشوێن شوێنەوار و دانراوەکانی ئەم مامۆستادا گەڕام و، بەگوێرەی توانا هەوڵی باشم بۆ کۆکردنەوەی ناو و شوێنیان و زانینی هەر زانیارییەک دەربارەیان دا. ئەو کاتە دوای ئەو هەوڵ و کۆششە گوتم: لەوانەیە گەلێ شتی دیکەی ئەم مامۆستا لەناوچوونی، یان مابن و بەڵام دوورەدەست و لە شوێنی نەزانراودا مابنەوە.

هەر لەو نووسینانەدا کە دەربارەی ئەم مامۆستا بەرێزە نووسیم ئاماژەم بۆ باسێک کرد کە مامۆستا عەزاویی خۆی ناوی هێناوە و، منیش بۆی گەڕام و لەناو دانراوەکانیدا نەمدۆزییەوە، باسەکە لەسەر مامۆستای مەزنی کورد شێخ عەبدورەحمانی ئیبنولخەیاتی قەرەداغییە.

ئێستەیش هەر عەوداڵی دوای ئەم باسەم و، لەم ڕۆژانەدا سەرم لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی عێراق دا بەڵکو سۆراخی شتێک بکەم. لێپرسراوی بەشی دەستخەتەکانی ئەو کتێبخانە گوتی: هەندێک (مسوده) و شتی عەزاویی هەیە لەناو تۆمارکراوەکاندا ناویان نییە، تەماشایەکیان بکە. بەڵێ یەک دوو کیس پەڕەپەڕە و (مسوده)ی خستە بەردەستم. بەشی زۆریان لەسەر تیرە کوردەکان و شوێن و سەرۆکەکانیان و، بەشێکی باشیشیان لەسەر تیرەکانی جافن.

لەناو ئەو پەڕەپەڕانەدا دەفتەرێک سەرنجی ڕاکێشام، لەسەر بەرگی یەکەمی نووسراوە (کردستان - الثانی) ژمارە (٩)ی دراوەتێ.

ئەم دەفتەرە تێکڕا بەخەتی خوالێخۆشبوو عەزاویی خۆیەتی. کاتی خۆی - نازانم چۆن و لەگەڵ چی دیکەدا - کەوتووەتە کۆڕی زانیاریی کورد و، دەفتەرەکە لە چەند جێگەدا بەمۆری:

«کتێبخانەی کۆڕی زانیاریی کورد

مكتبة المجمع العلمي الكردي»

مۆرکراوە، سەرەتاکەی ناتەواوە و، باس لە مێژووگەلێک دەکات کە لە دەفتەری- یان دەفتەرانی - پێشوودا لەسەری نووسیون. ئەم دەفتەرە (٢٧) لاپەڕەیە و باسی (ماهی

دەشت) و فەرمانڕەوایانی (سویدی) کە دەیانگێڕێتەوە بۆ بەرمەکیەکان و، فەرمانڕەوایانی عیمادییە و فەرمانڕەوایانی لوڕ، دەکات.

دیارە ئەم دەفتەرەیش بەشێکە لە ڕەنجێکی دیکەی ئەم مامۆستا بەرێزە کە دەربارەی مێژووی گەلی کورد داویەتی و، دوور نییە هەر نۆ دەفتەرەکە -پێکەوە- کتێبێک بووبن لەو باسەدا، بەڵام پێش ئەوە دەستی دڵسۆزێکیان بگاتێ، یان هەر لە کتێبخانەی کۆڕدا دەستیان تێخرابێت و پەرتەوازە بووبن و زۆریان لەناوچووبن، یان مابن و لەملاو لەولا دوورەدەست بن و، دەبێ چاوەڕوان بین بزانین چییان بەسەر دێت و، هەروەها دەبێ چاوەڕوانی زیاتریش لە بەرهەمەکانی ئەم مامۆستا مەزنە بین بەڵکو لەمەولا بدۆزرێنەوە و ببووژێنرێنەوە.

دیارە لە هەلێکی وادا ناکرێ لە ناوەرۆکی ئەم دەفتەرە بەگشتیی بدوێین و هەمووی بنووسینەوە، بەڵام لە باسی لوڕ و میرانی لوڕدا شتێکی تێدایە دەکرێ لێرەدا ئەم بابەتەی پێ برازێنینەوە.

سەگێکی بەوەفا:

لەمەوپێش زۆر لەسەر سەگ نووسراوە و، ئێستەیش لە وڵاتانی دەرەوە بایەخێکی زۆر بەسەگ دەدرێت و، زۆر خەرج و دەرامەتیان لەسەر بەکار دەبرێت و، گەلێ جار -لە هەندێ شوێندا- خەرج و دەرامەتی سەگێک لە خەرج و دەرامەتی دانراو بۆ زەلامێک -یان چەند زەلامێک-ی وڵاتانی دیکە زیاترە و، ئەو بایەخەی بەسەگەل دەدرێت بەگەلێ مرۆڤ نادرێت! ئێمە نامانەوێ لەسەر ئەم بابەتە بڕۆین، تەنیا ئەوەندە هەیە لەو دەستخەتەی مامۆستا عەزاویدا هەڵوێستێکی سەگێکم خوێندەوە کە جێگەی سەرنجە و، شیاوی ئەوەیە - ئەگەر لە سەگنامەیشدا نەبێ - لەسەر لاپەڕەی وەفا و زیرەکیی و خزمەتگوزاری تۆمار بکرێت، ئەمەیش ڕووداوەکە:

یەکێک لە سەردارەکانی لوڕ کە ناوی ئەبولحەسەنی (فضلوی) دەبێ کوڕێکی دەبێ ناوی عەلی دەبێ، ڕۆژێ دەچێ بۆ ڕاو، سەگێکی دەبێ زۆری خۆش دەوێ[1] لەگەڵی دەچێ بۆ

---

(١) دیارە لە کۆنەوە سەگ لە لادێ و ژیانی گوندنیشینانداکاریگەرییەکی گەورەی هەبووە و، ئەو سەگەیش بەدەردی کاری ئەوانی خواردبێت و، بەدەم ئیش و کاریانەوە بوویێت جێگەی بایەخی تایبەتی بووە و، گەلێ خزمەتی شیاوی کراوە. لە وتارێکدا بەزمانی عەرەبی ٢٠ساڵێک لەمەوبەر باسی ئەوەم نووسی کە گەنجێک لەوانەی سەگیان پەروەردە دەکرد بۆ ڕاو و شکار و، بەتایبەتی بۆ=

ڕاو. کۆمەڵێک چەتە و ڕێگر ڕێگە لە عەلی دەگرن و، عەلی شەڕیان لەتەکدا دەکات، تا ئەنجام بەسەختی بریندراری دەکەن. بەبۆنەی ئەوەوە برینەکانی سەخت دەبن، عەلی لە هۆشی خۆی دەچێت و، چەتەکان وا دەزانن مردووە. بۆیە فڕێی دەدەنە ئەشکەوتێک و بەجێی دێڵن.

سەگەکەی عەلی چاوی لەم کارەساتە دەبێت و، بەوردیی سەرنجی هەمووی دەدات، تا ئەنجام شوێنی تاقمە چەتەکە هەڵدەگرێت و شوێنیان دەکەوێت، شەو کاتێ هەموو چەتەکان خەوتوون دەچێتە سەر ماڵی سەرۆکەکەیان و، لە خەودا دەیدۆزێتەوە و، هەردوو گونی[1] دەردێنێ و، گونەکان دەگرێ بەدەمیەوە و، دەچێتەوە بۆ ماڵی عەلی. کاتێ دەست و پێوەند و کەسوکاری عەلی ئەمە دەبینن دەزانن کارەساتێک قەوماوە. گورج شوێن سەگەکەی عەلی دەکەون و دەڕۆن تا دەیانباتە ناو ئەشکەوتەکە و لای لاشەکەی عەلی! دەبینن عەلی زۆر پەرێشانە و بەئاستەم گیانی تێدا ماوە، هەڵی دەگرن دەیهێننەوە بۆ ماڵەوە، تیماری دەکەن پاش ماوەیەک چاک دەبێتەوە، بەڵام لەولاوە سەرۆکی ڕێگرەکان دوای گون دەرهاتنەکەی دەمرێ!

دەبێ لە کۆتایی ئەم باسە بچووکەوە ئەوە لە بیر نەکەم کە مامۆستا عەزاویی باسی

---

= ڕاوە بەراز، سەگێکی چاکی دەبێ، ڕۆژێ لە کاتی ڕاوە بەرازدا یەکانەیەک شفرەیەک دەدا لە سکی سەگەکەی، سکی دەدڕێ و ورگ و ڕیخۆڵەی دەخاتە سەر زەوی، گەنجەکەیش کە سەگەکەی زۆر خۆش دەوێت - دیارە کاری پێشتریشی دەبێت - دەرسیی و دەزووی پێ دەبێت، دەرسیی و دەزوو دەردێنێ و ورگ و ڕیخۆڵەی سەگەکە دەخاتەوە جێگەی خۆی و، بێ بەنج و ژووری عەمەلیات ورگی سەگەکەی دەدوورێتەوە و، دێنێ چەپەرەیەکی لە شێوەی (تابووت) لە دار بۆ دەتەنێ و لەگەڵ هاوەڵەکانیدا بەچوارقوڵیی دەیخەنە سەرشانیان و، لەناو قۆپییەوە دەیهێننەوە بۆ گوندی تەکیە! خەڵکی گوندیش کە بەزۆریی ماڵی گەنجێک و دووانیان لەناو ڕاوە بەرازکەردایە دەبینن وا لە دوورەوە دارە تەرمێک بەرەو دێ دێت، هەر یەکێکیان بیری بۆ ئەوە دەچێت کەسێکی دووچاری کارەساتێک بووبێت. کە دێنە پێشەوە دەبینن وا گەماڵەکەی... بەعەمەلیاتکراوی لەسەر دارە تەرمەکەیە!! دوایش سەگەکە چاک دەبێتەوە و لە جاران باشتر و بەقین و خەشمتریش لە بەرازان دەکەوێتەوە ڕاوکردن. (بڕوانە: العراق، العدد: ١١٨٩، ٢٤/١/ ١٩٨٠، تعقیب حول الصید والألعاب فی المنطقه الکردیه).

(١) دیارە ئەمەیش ڕەفتارێکی کۆنی سەگە بۆ بەربەرەکانی کردنی دوژمنانی. لەبیرمە لە منداڵیمدا گەلێ جار گوێم لێ بووە کە باسی سەگێکی خیرا و چەشی ڕاوە بەرازیان بکردایەت دەیانوت: سەگەکەی فلان بۆ هەل دەگەڕا تا بۆی ڕێدەکەوت فرسەتی دەهێنا و گونی بەرازەکەی دەگرت ئیتر تا نەیکوتایە بەزەویدا بەری نەدەدا.

سەرچاوەی ئەم نووسینانەی نەکردووە، گەڕامەوە بۆ شەرەفنامە دەبینم باسەکەی لەوێ وەرگرتووە و، دیارە لە فارسییەکەی وەرگرتووە و خۆی کردوویەتی بەعەرەبی و هەندێک هەڵەی تێداکردووە. ئەمەیش دەقەکە وەک لە شەرەفنامەدا هاتووە:

«ئەبولحەسەن کوڕێکی هەبوو ناوی عەلی بوو، ڕۆژێک چووبووە ڕاو، سەگێکیشی دەگەڵ خۆی بردبوو، تووشی هێندێک دز و چەتان هات و بوو بەشەڕیان و عەلی بریندار کرا و لە هۆش خۆی چوو. دزەکان نەیاندەزانی بووراوەتەوە. وایانزانی مردووە. لە لینگی نەوین و ڕەکێشیان کرد و لەناو ئەشکەوتێکدا ڕایانکێشا و بەجێیان هێشت. سەگەکە بەرەودوا کەوتە شوێن دزان و شوێنی ون نەکردن و دە نیوەشەودا کە دز دەخەودا بوون پەلاماری کابرای سەرتەریدەی دا و گازی لە باتوونی گرت و تا نەیکوشت بەری نەدا. ئەمجار بەهەڵەداوان ڕای کرد و خۆی بەماڵە عەلیدا کردەوە. نۆکەرانی عەلی کە سەگیان بەدەمی خوێناوییەوە دیت ترسان کە عەلی شتێکی بەسەرهاتبێ، سەگیان دایە پێش خۆیان و ڕاست بردنیە سەر ئەو ئەشکەوتەی کە عەلی تێدابوو. عەلییان بەبرینداری هێنایەوە و دەرمانیان کرد و لە مردن خەلەست و، لەپاش ئەو کارەساتەش گوایە ماوەیەکی زۆر هەر ماوە.»

ئەمە دەقی کوردی شەرەفنامە بوو. دەقە عەرەبییەکەیش نزیکە لەمەوە و، دیارە وەک گوتمان مامۆستا عەزاوی لە فارسییەکەوە کردوویە بەعەرەبی.

## شەرحی قەسیدەی بوردیە

### ٣٤٧

دانروی سولەیمانی خانیی ساڵی ١٢٠٤ لە خوشاب دایناوە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

الحمدلله الذي نفذ محبته في القلوب، وجعلها وسيلة الى كل المطلوب والصلاة والسلام على نبيه المحمود، الذي كان معجزاته غير معدود، وعلى آله وأصحابه الاتقياء، الذين وفقهم الله على الأعداء. وبعد: فلما كان في القصيدة الموسومة بالبردية المنسوبة الى شيخ محمد البوصيري...

دیارە عەرەبییەکەی هەندێ لاوازە.

کۆتاییەکەیشی -بۆ مەدرەسەکانیش نووسیمان- ئاوایە:

«تمت الكتاب في وقت تاراجكردن حكاريان ومحموديان الشقاق، وفي وقت جمع شدن لشكر حكاريان ومحموديان ورروميان وروند وجنگ كردن ايشان في سنة ١٢٠٤ في خوشاب، في زمان احمد بگ بن علي بگ اللهم اغفرلهما، وايانا قد وقع الفراغ من تسويد هذه النسخة الشريفة على يد أضعف العباد، وأحقرهم عبدالله بن يونس في الوان، في مدرسة أسكندرية، لأجل استاده المشفق الماهر في العلوم زاد الله قدره في الثقلين والدارين، آمين يا معين في سنة ١٢١٠.

شایانی باسە مامۆستایەکی دیمان بەناوی مەلا عەلی شەرحی بوردەی کردووە و، لە ئەڵقەی (١٦٢)ی پرۆژەکەدا باسیم کردووە.

## الرسالة الخلالية في معرفة سمت القبلة

٣٤٨

دانراوی: حسەینی حسەیینی (خلالی).

سەرەتاکەی:

«أما بعد: فيقول الفقير الى الله تعالى حسين الحسيني الخلالي... لما كان أشرف الطاعات بعد الايمان هو الصلاة...»

کۆتاییەکەی:

«لا يتعين في شيء من هذه المواضع شيء من المشرق والمغرب والشمال والجنوب. الحمدلله على الاتمام، والصلاة والسلام على خير الانام وعلى آله وأصحابه الكرام...

ئەم دەستخەتە کە لە (د.ع)دا بەژمارە ٧٧٢٥ پارێزراوە هەشت لاپەڕەیە، دیارە کاتی خۆی بەشێک بووە لە دەستخەتێکی گەورە و، بازرگانیکەران بەدەستخەتەوە لە بەشەکانی دییان دابڕیوە و لەسەر ئەم بەشەیان نووسیوە:

«الرسالة الخلانية في كيفية معرفة الزوال وسمت القبلة بالدوائر الهندسية والأصول الفلكية. تأليف الشيخ حسين الحسيني الخلاني.

الملاحظه

لم يطبع ولايوجد غير هذه النسخة فمن الممكن أن يكون نسخة المؤلف!!»

بەڵام ئەوەی ئەمان بە (خلانی) یان خوێندوەتەوە لە دەستخەتەکەدا (الخلالی)یە.

دانراوی ژمارە ١/٢٤٨٥٥

ئەم ژمارە نامیلکەیەکی بچکۆلەی مامۆستایەکی مەزنی کوردە -بەداخەوە، تا ئێستە- لەمە زیاتر لە دانراوی لە دەستدا نییە و، لەمەیش زیاتری لەسەر نازانین.

سەرەتای نامیلکەکە ئاوایە:

٣٤٩

«وبعد: فيقول العبد الفقير الى فتح الله الودود الولي، فتح الله بن محمود الموصلي ثم الدرندوي، اسبل الله عليه الستر العلى: قد ورد علينا من الوطن ومعاعد الدمن، الموصل الخضراء، برج الأنبياء عمرها الله بالعلماء، وغمرها بصادق الأوليا، الى يوم الجزاء، سؤال يتعلق بالنهجة المرضية، في شرح الالفية، للجلال الاسيوطي ذي الفضائل السمية، والفواضل السنية، والله اسأل، وبأنبيائه وأسمائه اتوسل، أن يوفقني للمرام، ولسداد الكلام»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

وقع الفراغ من هذه الرسالة يوم الثلاثاء، سابع عشر من صفر الخير سنة الف ومائة واحدى وأربعين. في درنده في وادي اشوري...»

نامیلکەکە (٦) لاپەڕەیە دوور نییە بەخەتی دانەرەکەی بێت.

بەپێی ئەوەیش کە دەڵێ، ڕۆژی سێشەمەی حەوتی سەفەری ساڵی ١١٤١ لە نووسینی نامیلکەکە بووەتەوە، دەبێ ئەوە قسەی مامۆستای دانەر بێت و، دەبێ لەو ساڵەدا لە ژیاندا بووبێ، بەڵام لەوە زیاتری لێ نازانین، بەڵکو!

## شەرحی «خلاصه الوضع»ی داود

٣٥٠

دەستخەتی ١٥٥٢٠ کتێبێکی شەرحی ڕیسالەی وەضعی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری میر ڕۆستەمییە دانەرەکەی ئاوا دەفەرموێت:

«الحمد لمن أنطق لسان عبده بآيات إجلاله، والشكر لمن أنعم عليه العلوم بلطفه وافضاله. والصلاة على المختار من أشرف أصناف الانسية، وعلى آله وأصحابه الممتاز بالانفاس القدسية. وبعد: فان أقل عباد الرحمان داود بن سليمان، حفظهما الملك المنان، يقول: لايخفى على الطبائع السليمة والعقائد القويمة، إن كتاب خلاصة الوضع للفاضل المحقق والكامل المدقق ابي بكر الامير روستمي، حرسه عن الاعوجاج والالم يشتمل، على خلاصة قواعد ليطفة، وينطوي على زلالة فوائد شريفة، ولم يكن لها شرح يوضح معانيه. ويلخص مبانيه، فأراد أن يشرحه شرحاً كاشفا لرموزه.

بەم شێوەیە مامۆستای دانەر سەرەتای کتێبەکەی نووسیوە و، هیچ ناوی بۆ دانەناوە و، لە کۆتایشەوە هیچی نەوتوە ئەوەندە نەبێت کە دەڵێ: (او كلياً كليث وأسد، فإنهما موضوعان لأمر كلي وهو الحيوان المفترس. تمت الكتاب بعون الملك...)
دەستێکی چەپەڵ ناوی نووسەرەوەکەی کووژاندووەتەوە.

## شەرحی (اسطرلاب) دانراوی مەلا طەییبی دووشیوانیی

### ٣٥١

(اسطرلاب)ەکە دانراوی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری (کچک ملا)ی ئەربیلییە.

سەرەتاکەی:

«... اما بعد: فيقول أفقر المذنبين الى عفو ربه ورحمته وشفاعة سيد المرسلين وعترته، محمد طيب بن الحاج ملا أحمد الصائم الدوشيواني -أفاض عليهما شآبيب الغفران، ومنّ عليهما بالعفو والإحسان-: هذه عجالة أجريتها مجرى الشرح لفوائد الحسنية مع منهياتها (!) السنية، بحيث لا يغادر صغيرة ولا كبيرة الا احصاها، لمولانا رئيس العلماء الاسلامية، وأعلاها وأصدقهم ديناً وأحقهم يقيناً وأوفرهم علماً... [دوای پەڕەیەک لە پیاهەڵدانی مامۆستا دەڵێ:] أعني حضرة ابي بكر أفندي المشتهر بكچك ملا، ابن من اشتهر في المشارق والمغارب بأعلى الأوصاف وأجلى المناقب، المرحوم بكرم الله العلي، الحاج عمر أفندي الأربلي...»

کۆتاییەکەی:

«... بخلاف صفيحة الجيوب، فإنه يعرف بها قدر ارتفاعه بهذا العمل بلا تفاوت، فلا يتجه ذكره ههنا وتركه فيما يأتي، بل يتجه العكس [فتأمل!] وهذا آخر الكلام في هذا المقام والحمدلله على الاتمام.»

بێ ناوی نووسەرەوە و ساڵی نووسینەوە و شوێنی.

خوالێخۆشبوو مامۆستا زوبەیر بیلال ئیسماعیل لەناو ناودارانی مامۆستایانی ئەم دواییەی ئەربیلدا ناوی ئەم مامۆستای هێناوە[1].

مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای فەرهادیش دەربارەی ئەم مامۆستا، کە بە کوڕی چوارەمی مامۆستا مەلا ئەحمەدی (الصائم)ی داناوە، ساڵی ١٣٢٥-١٣٩٨ی بەرانبەر بە ١٩٠٧-١٩٧٨ی بۆ لە دایکبوون و کۆچی دوایی داناوە و، دەفەرموێ: ئەم مامۆستا زانایەکی پلە باڵای سەردەمی خۆی بووە و، زۆری خوێندنی لای مامۆستا مەلا ئەبوبەکری ناسراو بە (مەلا گیچکە) بووە و لە گوندەکانی گردەسۆر و دواتریش لە قوشقایە مامۆستا بووە و، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا لە خزمەتیدا خوێندوویە. جگە لە دەستی باڵای لە زانیارییە ئایینیەکاندا و بەتایبەتیش ئاسماننناسیی، دەستی شیعریشی هەبووە و، گەلێ شوێنەواری جوانی لێ بەجێماوە[2].

## مامۆستایان مەلا محەمەد شەریف و مەلا عەبدولکەریمی ڕەنگەڕەژانیی

### ٣٥٢

لە کوردستاندا بەدرێژایی مێژوو دەیان و سەدان خێزان و بنەماڵەی زانیاریی هەبوون کە پشتاوپشت کوڕ لە باوک و باپیری زانیاریی وەرگرتووە و، خوێندنیان لێ فێر بووە و، دواییش بەبایەخترین میرات و کەلەپووری ئەو بنەماڵانە کە دەستاودەست بۆیان ماوەتەوە کتێب و دانراوی باوباپیران یان دەستخەتی دانراوی زانایانی دیکە بووە کە لای ئەوان بەخەتی خۆیان یان کەسانی دیکە بووە.

گەلێ لەم بارەوە گوتراوە و نووسراوە و، تا زیاتریشی لەسەر بنووسرێت کەمە و، زیاتر

(١) بڕوانە: علماء ومدارس في أربيل، زبير بلال اسماعيل. مطبعة الزهراء الحديثة، الموصل، ١٤٠٤هـ - ١٩٨٤م، ص١٢٠.

(٢) بڕوانە: الاكليل، عەبدوڵڵا فەرهادیی، ل: ٤٢٧.

هەڵدەگرێت. جگە لەو بنەماڵانەی بەختیان یار بووە و چەردەیەکیان لەسەر نووسراوە، ناوی چەندین زانا و بنەماڵەی دیکەم دۆزیوەتەوە کە چەند پشت یەک لە دوای یەک نووسراوە: مەلا کێی کوڕی مەلا کێ، بەڵام لەوە زیاتریان دەربارە نازانرێت. هەروەها نازانرێت پلەی زانیاریی پیاوانی بنەماڵەکان چۆن بووە و، دانراویان بووە یان نا.

جگە لەوانیش و لەمانیش بنەماڵەی وەهایش هەبووە دەستاودەست شوێنەوارەکانیان تا ئەم سەردەمەی دوایی پارێزراوە و، گەنجینەی پڕ بەهای پڕ لە زانیاریی و دانراوی نایاب و کەموێنەیان مابووەوە، بەڵام لەم دوادواییەدا، دوای بڕانەوەی جەنگی جیهانیی دابڕانێک لە نێوان نەوەی نوێی ئەو بنەماڵانە و باوباپیرانیاندا ڕووی دا، کە ئەمان لەوان نامۆبوون و، بەچاوی بێ ڕێزیی و گومانەوە ئەیانڕوانییە شوێنەوارەکانیان و، بۆ پەڕەی زەردی ئەو دەستخەتە (زەرد هەڵگەڕاو!) انەیان وەک پاشماوەی دواکەوتن و، هۆی دەردیسەریی و نەخۆشییەکانی کۆمەڵ دەڕوانی و، هەرچۆن بۆیان بلوایەت خۆیان لە دەستیان قوتار دەکرد.

لەم ڕووەیشەوە ناوی دەیان مامۆستا و، ئەدیبی گەورە و، دوکتۆر و، پرۆفیسۆرم لا یە کە شوێنەواری باوباپیرانیان و، دانراوی بێ وێنەیان و، تاکە نوسخەی دانراوی نایابیان بەخەتی باوپیرانیان بەنرخی پیاز فرۆشتووە و، وەک بلێی بارێکی قورسیان لە کۆڵی خۆیان کردووەتەوە و، لە شتێکی ئێسک قورس خۆیان ڕزگار کردووە. ئێستەیش ئەگەر لێیان بپرسرێتەوە: چی لەو دەستخەتانەدا هەبووە و، بەرهەمی کێیان لە کەسوکار و باوباپیرانی خۆتانی تێدا بووە؟ هیچ وەڵامێکی دروستیان بەدەستەوە نییە؛ چونکە نەهاتوون -هیچ نەبێ- لیستەیەک بۆ ئەو بەرهەمانە بکەن و، ناوی دانراوەکانی -جارێکی دی هیچ نەبێ- باوباپیرانیان و پێوەندیدار بەخۆیانەوە تۆمار بکەن(١)!

**وەک گوتم گەلێ ناو و نموونەی ئەم بابەتەم لا یە و، دەکرێ -ئەگەر کات و تەمەن بەباریانەوە بێت- وەک بابەتێکی چڕوپڕی لایەنێکی زیانی قەرەبوونەکراوەی مێژووی کورد و زانایان و ناودارانی کورد تۆمار بکرێت و، کتێبێک یان باسێکی بەپێزی لەسەر بنووسرێت.**

لەم هەڵەدا لا لە بەرهەمێکی ناتەواوی مامۆستایەکی کورد دەکەینەوە کە لە باسی

---

(١) ئوسامە نەقشبەندیی بۆی گێڕامەوە: کاتێ کتێبخانەکان گەڕاون و دەستخەتیان کۆکردوەتەوە مامۆستایەکی ناسراو هاتووە پێی گوتوون: بچن کتێبخانەکەمان -کە کتێبخانەی بنەماڵەیەکی گەورەی ناسراوی کورد بووە- بهێنن، من خۆم کاتم نییە لەگەڵتان بێم، خۆتان چیی ئەکەن بیکەن. مامۆستا ئوسامە دەڵێ: چووین لە کۆیە دەستخەتەکانمان هێنا کە...

مێژووی ژیانیدا ناوی نییه و، هیچی لەسەر نەنووسراوە.

بەڵام پێش ئەم باسە و، بۆ ئەمەولایش، دەبێ ئەوە بڵێم: لە نووسینی ئەم بابەتانەدا ناوهێنانی کەسانێک -کە بەناچاریی ناویان دەهێنم- مەبەستم -خوانەخواستە- ناو زڕاندن و ئابڕووبردن و ڕسواکردنی کەس نییە و، تاکە مەبەستم دەربڕینی ڕووی دژواری قۆناغێکی مێژوویی زانیاریی و ئەو زیانانەیە لەو مێژووە کەوتوون.

ئەم مامۆستای لێرەدا ناوی دەبەم باشترین سەرچاوە بۆ ژیانی و تۆمارکردنی شتێک لە باری زانیاریی و ڕۆشنبیریی کتێبە دەستخەتەکەی (الاكليل)ی مامۆستای فەرهادییە. ئەم مامۆستا -خودا پاداشی بداتەوە- زانیاریگەلێکی باشی لەسەر زانایانی هاوچەرخی خۆی و ئەو زانایانەیش ماوەیەک پێش ئەوبوون لە هەولێر و دەوروبەریدا کۆکردووەتەوە. یەکێک لەو زانایانە مامۆستا مەلا محەمەد شەریفی ڕەنگەڕژانیی برای ئەم مامۆستایە کە باسی دەکەین. (ل٣٧٨) هەندێکی لەسەر ژیانی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم و شوێن و جێگەکانی خوێندنی نووسیوە. ئەوەیشی نووسیوە کە ئەم مامۆستا ساڵی ١٣٤٠ک-١٩٢١ز کۆچی دوایی کردووە.

پاش گەڕان و سەروسۆراخی دەستخەتان لە (د.ع)دا بۆم دەرکەوت ئەم دوو برا - مامۆستا محەمەد شەریف و مامۆستا عەبدولکەریم- کتێبخانەیەکی باشیان هەبووە و بەشێکیشیان دانراوی خۆیان بووە و، تا ئەم سەردەمەی دواییش باش پارێزراون، بەڵام لەم ماوەی دواییدا محەمەد شەریف ناوێک کە کوڕی مەلا عوثمان بووە و -دیارە بەو هیوایە وا ناونراوە کە جێگەی محەمەد شەریفی پێشوو پڕ بکاتەوە- هاتووە دەستی خستوەتە کتێبخانەی باوباپیری و تەنانەت نەیکردووە -هیچ نەبێ- شوێنەوار و دانراوەکانی باوباپیرانی جیابکاتەوە و لای خۆی بیانپارێزێ، هەموویانی پارچە-پارچە کردووە و، بێناز و پەرتەوازەی کردوون و، دواییش -وەک دەڵێن- بەنرخی پیواز فرۆشتوونی!

لەم ڕۆژانەدا بۆ جاری دووەم چاوم بەتوورەکەیەک لە دەستخەتەکانی (د.ع)دا گێڕایەوە کە چەند پەڕەی پەرتەوازە و بێنازی تێدا بوو، زەلامێک -کاری ڕاست بێت- کاتی خۆی لەملاولا کۆی کردبوونەوە و یەکی خستبوون و ژمارە (٣٧٠١)ی دابوونێ. لە ناو ئەو پەڕەپەڕانەدا چوار لاپەڕە سەرنجیان ڕاکێشام کە هیچ لەوە باشتر نابینم دەقی سەرەتاکەیان لێرەدا وەک خۆی تۆمار بکەم:

«قال الفقير أبو عبدالله عبدالكريم الواثق بالله
بعد اداء حق حمد وكذا تصلة على النبي المصطفى

قال الناظم: بسم الله الرحمن الرحيم. ونفوض ما في هذه الكلمة المباركة الى المطولات من التفاسير والشروح، ونسكت منه هاهنا.

(قال) العبد (الفقير) المحتاج الى الله تعالى في كل حركاته وسكناته، الذي كنيته (أبو عبدالله) بإشباع همزة الأب وإسقاط واوه في اللفظ للوزن، واسمه (عبدالكريم) الإيراني السقزي الرنگەرژاني أصلاً، المهاجر الى المملكة الروم الساكن المدرس بقرية (يدي قزلر) من قرى الدزدي الملحق بقضاء أربل حالاً، ولقبه (الواثق بالله) قولاً واقعاً (بعد اداء) وتأدية (حق حمد) وثناء لله تعالى (وكذا) بعد اداء حق (تصلية) وتسليم (على النبي) محمد بن عبدالله بن عبدالمطلب بن هاشم -صلى الله عليه وسلم وعظم وكرم- (المصطفى) المختار مما سوى الله: (إني نظمت) مقول قال (من لغات) أهل الفارس بعض الأصول والقواعد (للاخ) الديني (الموانس) بي كالأخ الطيني الوفي الشفيق، الذي هو أغلى علي من كل الرفيق، وهو (محمد الصالح) بن عبدالله شاوري رئيس عشيرة المرزان، لازال على هداية...»

باسێکی دەستەخەتەکە:

ئەم دەستخەتە -وەک گوتم- پاشماوەی دەستخەتە و، ئەوەی کە ماوە شەش لاپەڕەیە، نازانین چەندی لێ لەناوچووە. دیارە مامۆستا کتێبەکەی بۆ باسی زمانی فارسی و فێرکردنی زمانی فارسی نووسیوە، بەڵام بەداخەوە ناتەواوە و نازانین چ ڕێگەیەکی گرتوەتە بەر بۆ کارەکەی و، چۆنی نووسیوە و، قەوارەکەی چەند بووە، دوور نییە ئەمە نوسخەی دانەرەکەیشی بێت. بەهۆی ناتەواوییەوە مێژووی نووسینەوە یان دانانیشی نازانرێت.

محەمەد شەریفی ڕەنگەڕەژانیی(٢):

لە پەنای باسی مامۆستا عەبدولکەریمی ڕەنگەڕەژانیدا باسی مامۆستا محەمەد شەریفی

(٢) خوالێخۆشبوو زوبەیر بیلال ئیسماعیل ئەڵێ: ئەم مامۆستا محەمەد شەریفە پیاوێکی زانا و خوێندەوار بووە و، فارسی و، تورکی و، ئینگلیزی و، فەرەنسی، سەرەڕای زمانەکانی عەرەبی و کوردی زانیوە و، گەلێ کتێب و بەرهەمی لەو زمانانەوە بۆ عەرەبی و کوردی وەرگێڕاوە و، شیعر و بەرهەمی چاپکراوی هەیە،ساڵی ١٩٧٦ بەوەستانی دڵ کۆچی دوایی کردووە.
لە ماوەی ژیانیدا تووشی کارەساتێکی دارایی بووە و، ناچار بووە بەوە گەلێ دەستخەتی نایابی بفرۆشێ کە لە باوباپیرییەوە بۆی جێمابوون. (بڕوانە: علماء ومدارس في أربيل ص: ٩٤).

قال الفقير ابو عبدالله بعد اداء حق حمد وكذا
عبدالكريم الواثق بالله تصلية على النبي المصطفى

قال الناظم بسم الله الرحمن الرحيم ونفوض ما في هذه الكلمة المباركة

الى المطولات من التفاسير والشروح ونسكت منه هاهنا

قال العبد الفقير المحتاج الى الله تعالى في كل حركاته وسكناته الذي

كنيته ابو عبدالله باشباع همزة الابد واسقاط واوه في

اللفظ للوزن واسمه عبدالكريم الايراني السقزي الزنكه زناني

اصلا المهاجر الى مملكة الروم الساكن المدرس بقرية بيدي قرلر

من قرى الدزدي الملحق بقضاء اربل حالا ولقبه الواثق بالله.

قولا واقعا بعد اداء وتأدية حق حمد وثناء لله تعالى وكذا بعد

اداء حق تصلية وتسليم على النبي المصطفى محمد بن عبدالله

بن عبد المطلب بن هاشم صلى الله عليه وسلم وعظم وكرم المصطفى.

المختار مما سوى الله اي نظمت معول قال من لغات اهل الفارسي

نموونه له دانراوی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی ڕەنگەڕەژانی

اذ نظمت من لغات الفارسي    محمد الصالح لازال على    لعل حفظ يكون سهلا    اذا علمت السابق وعنا

بعض الاصول للاخ المونس    هداية الاله جل وعلا    على جميع من يكون اهلا    ادخله في الذهن فقل بابا

اربع مع عشرين حرفا قد يجي

في الفارسي من الحروف التهجي

بعض الاصول والقواعد للاخ الدين المونس لي كالاخ

الطيب الوفي الشفيق الذي هو اغلى على من كل الرفيق وهو

محمد الصالح بن عبدالله شاوه يس رئيس عشيرة المرزان لازال

على هداية الاله جل وعلا وجملة لعل حفظ اى بعض الاصول

المنظومة او النظم يكون سهلا على جميع من يتعلم الاخ وغيره

يكون اهلا له من طالبيه في قوة العلة للنظم اذا علمت يا صاح

الحكم السابق وعنا لك اى ظهر بالف الاطلاق ادخله •

وادخله في وعاء الذهن اى ذهنك واذا اوعيته فقل

واحكم بابا بالالف المذكورة اربع بلا تنوين للضرورة مع

بفتح فسكون عشرين حرفا قد يجي في الكلام الفارسي يا

النسبة خففت للوزن بعضا من جميع الحروف التهجي •

عشرون

نموونە لە دانراوی مامۆستا مەلا عوثمانی ڕەنگەڕەژانی

برا گەورەیشی بەکورتیی دەنووسم، مامۆستای فەرهادی هەندێک بەدرێژیی لەسەر ئەم مامۆستای نووسیوە و، وای داناوە لەگەڵێ جێگە -لەوانە ڕەواندز- خوێندوویەتی و، بەفەقێتیی لەو ناوەدا، بووە و، دوای ئەوەی لەو ناوچانەدا ماوەیەک خوێندوویەتی گەیشتوەتە هەولێر و لای مامۆستا مەلا عومەریش خوێندوویە تا دوادوایی خوێندنی و، لە هەولێر شەرحی هۆنراوەی (الاضمار)ی کردووە و ناوی ناوە (غـاية الإظهار في شرح منظومة الاضمار) و، بەباسی خەڵکی ڕەواندوزدا چووە و بەپیاوانیانیدا هەڵگوتوە و، بەتایبەتی ستایشی زۆری مامۆستای مامۆستا مەلا عومەری خەیلانیی کردووە، کە مامۆستای مامۆستا مەلا عومەری (کچک ملا)یش بووە.

مامۆستای فەرهادیی باسی ئەوەیش دەکات کە مامۆستای ڕەنگەرەژانیی باسی دووریی لە برا و کەسوکاری، بەتایبەتی مەلا عەبدولکەریمی برای کردووە و، دوای ماوەیەکیش ئەو مەلا عەبدولکەریمە هاتووە بۆ ئەربیل و بەیەکەوە لای مەلا گیچکە خوێندوویانە. (ل: ٣٧٨ و ٣٧٩). بەڵام ئەوەی مامۆستا زوبەیر دەربارەی ئەم مامۆستای نووسیوە لە باسەکەی مامۆستای فەرهادیی ناچێت و جیاوازییان هەیە، بۆیە پوختەیەکی باسەکەی مامۆستا زوبەیریش دەخەینە پاڵ ئەم باسە.

مامۆستا زوبەیر بیلال ئیسماعیل ڕوونتر دەربارەی مامۆستا محەمەد شەریف دەنووسێ:

مامۆستای ڕەنگەرەژانیی لە پەراوێزی یەکێک لە دانراوەکانیدا پوختەی ژیانی خۆی نووسیوە و دەڵێ: ڕەنگەرەزان گوندێکی سەر بەناوچەی سەقزی پارێزگای کوردستان سنە-ی ئێرانە و، مامۆستا لەوێ لە دایک بووە و دوایی بۆ خوێندن وڵاتی خۆی بەجێهێشتووە و لە هەولێر لای مامۆستا مەلا عومەر ئەفەندی گیرساوەتەوە و، ماوەی دوازدە ساڵ لەتەک عەبدولکەریمی برایدا لە خزمەتیدا بوون و ئیجازەی لێ وەرگرتووە، دوایی فەرمانی پێداوە کە بچێ لە گوندی حەزەی دەشتی هەولێر ببێ بەمامۆستا و، هەر لەوێیش ژنی هێناوە و مەلایەتیی کردووە، دوایی چووەتە گوندی (تل الغيم)ی نێوان گوێر و مەخموور و، لە ماوەی ژیانیدا جگە لە دەرسوتنەوە و خزمەتی ئایین گەلێ کتێبی داناوە و، شیعری کوردی و فارسیشی هەبووە و، کۆچی دواییشی دوای ساڵی ١٢٨٧ واتە لە کۆتایی سەدەی سیازدەی کۆچیدا بووە و، لە گوندی (یدی قزلر) بەخاک سپێرراوە[٣].

بەڵام بەگوێرەی ئەو دانراوەی مامۆستا محەمەد شەریف کە لە دەستدایە ئاشکرایە

(٣) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل: ٩٣.

مـامۆسـتامـان مـاوەیەک لە ڕەواندوز بووە، ئیتر چۆن لەوێ بووە و کەی بووە؟ نازانین. دوو دانەی (مسألة الاضمار)ی مامۆستا محەمەد شەریفم لە د.ع دا دۆزیوەتەوە، بەژمارەکانی (٣/٥٩٦٢) و (٤/١٦٨٧٢) پارێزراون و، دانراوەکـە (٢٠) بەیتـە و شـەرحـەکـەیان نەدیوە، وا لەم هەلەدا بەشێکی سەرەتا و کۆتاییەکەی دەنووسین:

## مسألة الاضمار

### ٣٥٣

دانراوی محەمەد شەریفی سەقزیی.

سەرەتاکەی:

قال محمد الشريف الســـقزي — العـــاجـز الغريب بالرواندز:
أحـسن ما يذكر باللســـــان — وخيــــر ما يضمر في الجنان
حمدك ياذا الفضل والاحسان — وغـــافر الذنوب والعصيان
صل عــــلى نبيك المخـــتار — وآلـــه وصـحبــه الابـــرار
فـــهذه منظومة مخـــتصـــرة — ضمــنتها فـوائداً مــحررة
نظـــمتها ليلاً عـــلى الـبدار — سـميتها (مسألة الاضمار)
وانحصرت ابياتها في عشرة — لـــــــكنها مقروة مكررة

کۆتاییەکەی:

نظمتـهـا قد كنت ذا حزن وهم — من هجـر اخوان واحباب وعم
لاسيما اخـــي الذي نور البصر — مني بـ(سردشت)بعيداً قد هجر
الله أرجو الوصل بالخــير الى — جميعـهم وهو ذو المجد العلى
تمــت ودمعـــي ســائر كالسيل — فـي نصف ليل من فراق الليل

نوسـخـەیەکی دیکەی ئەم کـتـێبـە لە هەمـان کـتـێـبـخـانەدا هەیە کە بەژمـارە ٣/٥٩٦٢ پارێزراوە و، لە یەک لاپەڕە دایە و، دەسـتـخەتەکە بەخەتی مـامۆسـتـا مـەلا عـەبدولقـادری کـانی کـەوەیی نووسـراوەتەوە، لەوانەیە ئەمـیش هەر خـەتی ئەو بێ، بەڵام ناو و مێـژووی پێوە نییە.

هۆنراوەکە (٢٠) بەیتە.

## دەبێ ئەمە دەربارەی پاشای ڕەواندز زانرابێت؟

٣٥٤

ژمارە ١٨١٧١ی (دار العراق للمخطوطات) پاشماوەی کتێبی (فتح الوهاب بشرح منهج الطلاب)ە کە شڕ و پەڕپووت و تێکەڵاوە و، کۆتاییەکەیشی نەماوە. بەڵام خۆشبەختانە لاپەڕەی یەکەم و سەرەتای کتێبەکە ماوە و، دوو سێ نووسەرەوەی بەڕێز هەندێ شتیان بەعەرەبی و فارسی تێدا نووسیوە، ئێمە لێرەدا دەیانکەین بەکوردی و تۆماریان دەکەین بەهیوای ئەوەی سوودی خۆیان ببەخشن.

یەکەم: لە سیازدەی مانگی (ربیع الاول)ی پیرۆزی ساڵی ١٢٤٧دا شەوی یەکشەمە پاشای ڕەواندز لە دەوروبەری (دیرە)وە شەبەیخوونی هێنا و، بەیانیی ئەو ڕۆژە خۆی و تفەنگچیانیی و ناسراوانی شاری هەولێر لەسەر سەراوی عەینکاوە چادریان هەڵدا و، سوارەکانی کەوتنە غاردان و دەوروبەری شاریان تالان کرد، بەڵام شێوانی ئەو ڕۆژە کە شەوی دووشەمە دەکات وەکیلی ئەربیل حاجی سەلیم ئاغای ئەنطاکیی و ناودارانی دیی و سەربازەکان دەوری قەڵایان چۆڵ کرد و تەسلیمی پاشای ناوبراویان کرد. ١٣ ربیع الاول ١٢٤٧.

دووەم: مەلا یونس بەنەخۆشیی ڕشانەوە ڕۆژی یەکشەمەی ٢٧ی مانگی (ربیع الأول)ی ساڵی ١٢٤٧ کۆچی دوایی کرد.

دیارە ئەم مەلا یونسە کە لێرەدا ناوی هاتووە مامۆستایەکی ناسراوی ئەو سەردەمە بووە، بەڵام کێیە و چیی بووە؟

سێیەم: ئەم کتێبە هاتە نۆرەی من و بەکڕینێکی شەرعیی چووە رزی ماڵی من. منیش بەندەی بێچارە مستەفای موفتیی لە شارۆچکەی ئەربیل. ٢٢/س/١٢٤٢.

چوارەم: ئەم کتێبە لە میهرەبانی خوداوە کەوتە دەست بەندەی هەژاری خودا سەیید محەمەدی کوڕی سەیید عەلی کوڕی سەیید بەکری (مرجی) ساڵی ١٢٣٤.

پێنجەم: مەلا محەمەدی خەطێ ٨٢ ڕیاڵ دوو درهەم و نیو کەمی وا بەلای فەقێ حەسەنی زێبوەییەوە.

## ریسالەی ڕووسیە

### ٣٥٥

دانراوی ژمارە ٣/٢٧٠٨٧

دانراوی مامۆستا مەلا عوبەیدوڵڵای کوڕی مەلاحسەینی کوڕی مەلامحەمەدی ڕووسیی.

سەرەتاکەی:

«اما بعد: فيقول المفتقر الى غفران ربه القدوسي، عبيدالله بن منلا حسين بن منلا محمد الروسي: لما كان ببحث المسمى بالمضاعف في علم الصرف ابواب، ولها تصاريف كثيرة، ورأيت في عدة من الأوراق، ووقع ايضاً في سماع من كثير من الإخوان، ولم يتوافق بعضهم بعضاً لكثرة اختلافها وتصاريفها... أردت أن أكتب أوراقاً...»

کۆتاییەکەی:

«وفي بعضهم يستوي لفظ اسم الفاعل واسم المفعول نحو... والتقدير مقدر مختلف. هذا آخر ما كتب من الأوراق لإيضاح المضاعف. تمت الرسالة المسماة بالروسية في يوم السبت في شهر نيسان بعد المضي منها! تسعة ايام في سنة وقع الثلج الكثير، في مدرسة زيلان عند الشيخ الحازق الماهر الكامل الفاخر صاحب النسب الطاهر نعني به المحي للدين الشيخ محمد جلال الدين.»

لەمە زیاتر دەربارەی ژیانی دانەر هیچم لە دەستدا نییە.

## بضاعة المجود في علم الخط وأصوله

٣٥٦

دانراوی ژماره ١٤٢٨٢

ئەم نامیلکە هۆنراوەیەکی ڕەجەزە، دانراوی (شێخولئیسلام محەمەدی کوڕی حەسەنی سنجاریی)یە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| يقول راجي كرم الغفار | محمد بن الحسن السنجاري |
| الحمدلله الذي علمنا | ما لم نكن نعلم بل ألهمنا |
| علمنا الخط القوى المعرب | وخصنا بالهاشمي العربي |
| محمد المبعوث بالرسالة | صلى عليه الله ذو الجلالة |
| ثم على أصحابه الكرام | وتابعيهم بمدى الأيام |
| وبعد: ان أحسن الخطوط | اقواه في المنسوب والمخطوط |

کۆتاییەکەی:

الياء

| | |
|---|---|
| الياء من دالين مقلوبين | كشفرة لطيفة من ذين |
| فهذه الأصول للكتابة | من حازها يفوز بالطلابة |
| والحمدلله على التمام | والشكر لله على الالهام |

مێژووی نووسینەوە و ناوی کەسی بەسەرەوە نییە، لەوە دەچێ خەتی (عبدالرزاق فليح البغدادي) بێت و بۆ عەباس عەزاویی نووسیبێتەوە، چونکە پێداچوونەوەی عەزاویی بەسەرەوەیە. ئیتر نازانم چاپی کردووە یان نا؟

## (توحيد الصانع ببرهان التمانع)ی مامۆستا مەلا محەمەدی کوڕی عەبدوڵلای زیارەتیی

۳۵۷

۲۰۶۶۳

لە لاپەڕە (۳۶۳)ی بەرگی دووەمی (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە)دا باسی دانراوێکی مامۆستا مەلا محەمەدی زیارەتیم کرد. دوابەدوای ئەوە هەر لە (د.ع)دا ڕێگەم لە دانراوێکی دیکەی ئەم مامۆستا مەزنە کەوت. ئەمیش وەک نامیلکەکەی دی پێشکەشی کردووە بە داودپاشای والیی بەغدا. دەستخەتەکە کاتی خۆی بەخەتێکی جوان نووسراوەتەوە و، قەراخەکەی زەرکەفت کراوە و، بەدووری نازانم ئەم نوسخە ئەو نوسخە بێت کە کاتی خۆی نێرراوە بۆ داود پاشا. بەڵام دوایی بەر چەپۆکی زەمانە کەوتووە و کارێکی بەسەر هاتووە کە نازانین چۆن لە دەستی دەرچووە! تەڕبووە، ڕەش هەڵگەڕاوە، لاپەڕەکانی بەیەکەوە لکاون. بەڵام دوایی دەستێکی بەتەنگەوە هاتن فریای کەوتووە و گیانی بەبەردا کردوەتەوە.

دوای (الحمدلله) و صەلات و سەلام بەم شێوە دەستی کردووە بەسەرەتای کتێبەکە:

«وبعد: فيقول الفقير الى الله الأبدي محمد بن عبدالله الزيارتي: فإني... سلكت طرائق الاغتراب لاقتراف العلوم والآداب، لم يزل الدهر يرمقني شزرا، ويلحظني جزرا، ويوسعني هجرا وهجرا، لا أمتطي منه إلا في داج داجن، ولا أرد فيه الا على ماء آجن، يسومني خطة الأذى، ويقلاني قلة المقلة للقذى، وكنت ممتثلاً بـ: لاتمددن يداً يوماً لأخذ يد ولو أضرت بك اللأواء والنوب، اذ التعفف كان دأبي وأجمل ثيابي...[١]»

پاش ماوەیەک لەو قسانە و وشەئاراییی، کتێبەکەی پێشکەشی داود پاشای والی بەغدا دەکات. دواتریش ئەڵێ:

«وكانت خاتمة تحصيلنا على أفضل علماء العراق على الإطلاق، العلامة الواقف

---

(١) لەم پێشەکیەدا زۆر بەزەقیی دەردەکەوێ کە مامۆستای زیارەتیی لەژێر تەئسیری نامیلکەی (الرسالة العراقية)ی مامۆستای بێتووشیدا پێشەکیەکەی خۆی نووسیوە و، گەلێ لە واتە و وشەکانی ئەوی وەک خۆیان گواستوەتەوە ناو پێشەکیەکەی. (بڕوانە: البيتوشي، تأليف: محمد الخال، مطبعة المعارف، بغداد، ١٣٧٧هـ - ١٩٥٧م ص: ٢٢٥).

منهاجه فضلاء عصره، والماشي ادراجه نبلاء مصره، المقتدى به للأنام. والحبر الصمصام، رئيس العلماء العلام، يحيى أفندي، لازال ممدوداً ظلال فيضه على كافة أهالي العلم وأصحاب اليقين، بحرمة الأولياء والمرسلين...».

ئەم دەستخەتە کە لە (د.ع)دا بەژمارە (٢٠٦٦٣) هەڵگیراوە ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە و، ساڵی ١٢٤٢ نووسراوەتەوە.

## صره الفتاوی

### ٣٥٨

دانراوی: صادق محەمەد کوڕی عەلی ساقزیی ٢٢٣٥٠

سەرەتاکەی:

وبعد: فيقول العبد الفقير الى ربه القدير صادق محمد بن علي الساقزي: لما اشتغلت من عنفوان شبابي بالفقه الشريف، وجمعت مسائله المفتى بها الواقعة في المحاكم غالباً، أردت أن أرتبها على منوال الكتب تسهيلاً للحكام، وتنفيعاً للأنام، راجياً من الله الجليل أجراً جزيلاً وخيراً جميلاً، وسميتها صرة الفتاوى، ومن أراد أن لايحتاج في الافتاء الى كتاب آخر من الفقه فليكتبها. وها أنا أشرع في المقصود بعون الملك المعبود. كتاب الطهارة.»

کۆتاییەکەی:

«قد وقع الفراغ والاتمام من تنميق النسخة الشريفة المسماة بصرة الفتاوى، في يوم الخميس بعد الظهر في شهر ذي القعدة المبارك في سنة الف ومائتين واثني(!) وأربعين من الهجرة النبوية المصطفوية. من انملة الحقير الفقير الى رحمة ملك القدير عبدالقادر...»

دەستێکی چەپەڵ ناوەکەی کووژاندوەتەوە و دواییش لە کۆتاییەوە پەڕەیەکی دڕاندووە!

دوو نوسخەی ئەم کتێبە لە کتێبخانەی مەرکەزیی ئەوقافی موسڵدا هەیە و، بەپێی فیهرەستی ئەو کتێبخانە ئەم مامۆستا ساڵی ١٠٩٩ کۆچی دوایی کردووە[1].

---

(١) بروانە: فهرس مخطوطات مكتبة الأوقاف العامة في الموصل، سالم عبدالرزاق، ج/٥، ص: ١٦١.

نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبە لە د.ع دا بەژمارە ٢٣٠٦٦ پارێزراوە، سەلاحەدین عەبدوللەتیفی کوڕی سەید محەمەدی کوڕی سەید عەبدولقەهار ساڵی ١٢٤١ نووسیویەتیەوە. ٦٦٠ لاپەڕەی قەوارە گەورەیە. (تملک)ی (عبداللطیف الحسیني) بەسەرەوەیە.

## مامۆستا مەلا عەلی حەریریی سورچیی و مامۆستایان و کتێبخانەکەیان لە عاستی چەند دانراو و دەستخەتدا

### ٣٥٩

پێشتر لە چەند بۆنە و لوانی جیاجیادا چەند جار لەسەر ناو و شوێنەواری مامۆستایانی ئەم بنەماڵەم نووسیوە و، دواتریش نووسراوەکان لە جێگەگەلی جیاجیای بەرگەکانی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورددا جێگەی خۆیان گرتووە. بەڵام تا ئێستە بەهەموو ئەو نووسراوانە نەگەیشتوومەتە ئەنجامی چەند باسێک و، وەڵامی چەند پرسیارم بۆ نەدراوەتەوە. لەوانە: ئایا عەلی حەریری کێیە؟ چەند عەلی حەریرییمان هەیە؟ ئەم مامۆستا مەلا عەلییە لە بنەڕەتدا خەڵکی کوێیە؟ دوایی لە کوێ گیرساونەتەوە؟ بەرهەم و شوێنەواریان چیی بووە و چییان بەسەرهاتووە؟؟؟

لەم هەلەدا پاش کۆکردنەوەی زانیاریگەلێکی نوێ دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەم باسە بەڵکو چەند تیشکێک بخەمە سەر ئەو لایەنانە و، قۆناغی کاروانی مێژووی ئەم بنەماڵەیە هەندێک بەرەوپێش بەرم.

یەکێک لەو پرسیارانەی وەڵامیم دەستکەوت ئەوەبوو، گەلێ جار دەستخەتم دیوە مۆری کتێبخانەی مەولانا حەمزەی پێوەیە و، ناوونیشانی هەندێک لەو دەستخەتانەم پاراستووە. هەروەها ناو بەناو دەستخەت لە کەرکوکەوە دەهات و دێت بۆ (د.ع) کە مۆری هەمان کتێبخانەیان پێوەیە. لە خۆم دەپرسی: دەبێ ئەم کتێبخانە لە کوێ بووبێت و؟ سەرەنجامی چیی بووبێت و؟ چی بەسەر هاتبێت؟ تا خوا و ڕاسان دەستخەتی ژمارە (٢٠٦٢٩ د.ع)م بینی، نووسەرەوەی ئەم دەستخەتە وەڵامی بەشێک لەم پرسیارانەی دامەوە، چونکە ئەم نووسەرەوە بەڕێزە کە ناوی محەمەدی کوڕی خضری کوڕی ئەحمەدی قەهرابادیی موکرییە دەڵێ: ساڵی ١١٣٥ لە مەدرەسەی حەمزە ئەفەندیی لە گوندی کەرکووک نووسیمەوە.

هذا تاليف المفتقر الى الله الغنى علي بن محمد السورچي المنتسب
الى الخير مولدا والى علي المرتضى نسبا لرد بعض
ايرادات المحشي الفاضل عصام الدين على انوار التنزيل
واسرار التأويل في جزء سورة النبأ تحفة للمولى
المحقق والحبر المدقق ملجأ علماء الاسلام
المتداول آثار فضله بين الانام السيد
فيض الله افندي لا زال مظهرا
للطف الله الابدي آمين
رب العالمين

نمونە لە دانراوی مامۆستا مەلا عەلی سوورچی

لەمەوە بۆمان دەرکەوت مامۆستایانی ئەم بنەماڵە لە قۆناغێکدا -کە لەوانەیە دواقۆناغ بووبێت- مەدرەسەکەیان لە کەرکووکدا بووە.

بەڵام دوای ئەوە پرسیاری ئەوە دەمێنێتەوە: کە سەرەتای ئەم مەدرەسە کەی و لە کوێ دەستی پێکردووە؟ وەک ئەو پرسیارەیش دەمێنێتەوە: ئەگەر پیاوانی ئەم بنەماڵە هەر لە کەرکووکدا پووکاونەتەوە و ئاسەواریان -یان ئاسەواری زانایانیان- بڕاوەتەوە، کەی بووە؟

لێرەدا ئەوەندە زیاد دەکەی، کە مامۆستا حەمزەی کوڕی عەلی سەردەمێک موفتیی کەرکووک بووە[١]. لەم هەلەدا ئەو زانیارییانەی لەمەوپێش کۆمکردوونەتەوە دەخەمە دامێنی ئەم باسەوە، دوای ئەوە بەرهەمەکانی مامۆستایەک لە مامۆستاکانی ئەم بنەماڵە دەخەمە بەردەستی خوێنەران و، دواتریش شتێک لەسەر مامۆستا ڕەسووڵی سوورچی دەنووسم کە نازانم ئەویش هەر لەم بنەماڵە زانیارییەیان هەر لەم هۆزەیە؟

(١) بڕوانە: هوية كركوك الثقافية. دار آراس، ٢٠٠٤

سەرەتا ئەو زانیارییانەی لە دەستخەتەکان وەردەگیرێن و پێوەندییان بەسوورچییەوە هەیە دەخەینە ڕوو:

١- دەستخەتی ٢/٧٧٥٥ د.ع کە حاشیەیە بەسەر عەقائیدی دەووانییەوە ئەحمەدی کوڕی عەلی (سۆرانی) ساڵی ١٠٢٦ لە شاری بدلیس لە مەدرەسەی ئیخلاصییە لای محەمەدی کوڕی مەلا شروین نووسیویەتیەوە.

٢- بەپێی دەستخەتی (٣٩٤٩١ د.ع) مەولانا عەلی سوورچی ساڵی ١٠٧٤ لە ژیاندا بووە و لە سەردەشت مامۆستا بووە.

٣- دەستخەتی (٧٩٠٥ د.ع) شەرحی ئەحمەدی کوڕی ئەحمەدی عیمادییە بەسەر نامیلکەی عەرەب سیناوە لە حیسابدا، عەلیی سۆرانیی ساڵی ١٠٨٩ نووسیویەتیەوە.

٤- دەستخەتی (٣٩٤٨٥ د.ع)یش ساڵی ١١١٠ لەبەر خاتری مەولانا حەمزەی کوڕی مەولانا عەلی سوورچیی نووسراوەتەوە.

٥- دەستخەتی (١٥٣٧٩ د.ع) فەتاوای عەلی ئەفەندییە بەتورکی، گومان بۆ ئەوە دەچێت فەتاوای عەلی سۆرانیی سوورچیی بێت. ساڵی ١١٢٥ نووسراوەتەوە.

٦- دەستخەتی (١٥٧٧٨ د.ع) کە حاشیەیە بەسەر شەرحی تەفتازانییەوە ئیسماعیلی سوورچیی ساڵی ١١٨٤ لە مەدرەسەی گۆرانکە لەبەر خاتری مەلا جامی کەلیچی نووسیویەتیەوە.

٧- دەستخەتی (٢٤٠٦٤ د.ع) ئیجازەی خوێندن و وتنەوەی (بوخاری)یە مستەفای کوڕی وەلییەدینی کوڕی بەیرامی سوورکیی ساڵی ١٢٠١ داویەتی بە مستەفای کوڕی ئەحمەدی کوڕی مستەفای بەرخاڵی لە ناحیەی لوانە.

دوای ئەمانە دێمە سەر باسی هەندێک لەو دەستخەتانەی کە من پەیم پێ بردوون و مۆری کتێبخانەی مەولانا حەمزەیان پێوەیە:

ژمارەی دەستخەتەکان:

١- (٤٣١٩٧ د.ع) وەقفی حەمزەی کوڕی عەلی سۆرانیی بەسەرەوەیە.

٢- دەستخەتی (٢٦٥٥٤ د.ع)ش (تملک) لە دەستدابوونی (حمزە علی) پێوەیە، بەڵام مۆری پێوە نییە. ئەم حەمزە موریدی شێخ (کلشینی) بووە.

٣- (٢٤٥٨ د.ع) مۆری حەمزەی کوڕی سۆرانیی پێوەیە.

٤- (٢٥٣٦ د.ع)ش هەروەها.

٥- (٢٦٢٥ د.ع)ش مۆری هەمان کتێبخانەی پێوەیە.

٦- (٢٦٧٩ د.ع) کە (هدیەء قطب شاهي در استخراج آیات کلام إلهي)یە. (تملک)ی عەلی کوڕی حەمزە ئەفەندیی کوڕی عەلی کوڕی محەمەد ئەفەندیی بەسەرەوەیە.

**نامیلکەیەکی مەلا عەلیی سوورچیی حەریریی سۆرانیی**
**لە بەرپەرچدانەوەی هەندێک قسە و گومانی عیصامەدیندا**
**کە لە تەفسیری بەیضاویی گرتوون**

نامیلکەکەی پێشکەشی شێخولئیسلام فەیضوڵڵا ئەفەندیی کردووە و، دیارە کاتی خۆی مووچە و بەراتی لە لایەنی دەوڵەتی عوثمانییەوە بۆ بڕراوەتەوە و، دواتر لێی کەمکراوەتەوە، ئەمیش داوای ئەوە ئەکات مووچەکەی وەک خۆی لێ بێتەوە.

ئەمەیش سەرەتاکەیەتی:

«وبعد: فهذا نبذ مما وقع بالخاطر الفاتر من دفع بعض ایرادات المحشي المدقق عصام الدينه على كلام سند المحققين وقدوة الراسخين، الاوحدي الالمعي القاضي البيضاوي. طاب الله ثراه، وجعل الجنة مثواه، في جزو سورة النبأ حال المذاكرة مع بعض أهل الدراية من الطلاب، وفقدان ما نرجع اليه من الكتاب، أفردته برسالة وجيزة، وكتابة أوراق قليلة، بطبع مقروح بالبعد عن الأهل والوطن، وقلب مجروح بحوادث الدهر وسهام الفتن، حتى كاد أن لايستقر الذهن على مبحث لحظة، ومطلب لمحة، والى الله المشتكى، ومنه المبتغى، ليتبرك بأنامل ناصر السنة، وإمام الأمة، معين الحق، ظل الله على الخلق، أغرّ اللقب، شريف النسب، كريم الشيم، ولي النعم، مولانا شيخ الإسلام الأوحدي، السيد فيض الله أفندي، لازال كاسمه فيض الله على البلاد وملجأ للعباد...»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«تم بحمدالله وحسن توفيقه مصلياً على النبي وآله، سنة الف ومائة وأثني عشر(!) آخر الشهر المبارك ذي الحجة. راجياً من الله أن ينفعنا به عاجلاً وآجلاً آمين. والحمدلله رب العالمين».

ئەوەندە لەم دەستخەتە وەردەگیرێ کە مامۆستای سوورچیی دانەری ئەم نامیلکە لە

ئاوارەییدا نامیلکەکەی داناوە، بەڵام لە کوێ و بۆچی ئاوارە بووە؟ جارێ شتێکی دەربارە نازانین.

لەوانەیشە ئەم نووسینەی دوایی نووسینی دانەرەکەی بێت و مێژووی دانانی کتێبەکە ساڵی ١١١٢ بووبێت.

وێنەی دەستخەتی ئەم نوسخە نایابەم لایە و مێژووی نووسینەوە و ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە، وەک زۆر لە دانراوەکانی ئەم بنەماڵە مۆر و وەقفی مامۆستا مەلا حەمزەی پێوەیە، بەناوی (بندہء لم یزلي حمزہء بن علي).

نمونە لە دانراوی مامۆستا مەلا عەلی سوورچی

## حاشیەی مەلا عەلی حەریری سوورچیی بەسەر تەفسیری بەیضاوییەوە

٢٤٤٥

سەرەتاکەی:

الحمدلله الذي أنزل على عبده قرآناً تبيانه ساطع. وفرقاناً برهانه قاطع...

تا دەفەرموێ:

«وبعد: فيقول المفتقر الى الله الغني المغنى علي بن محمد الصهراني الحريري: لما كان بعضٌ من أهل الدراية مشتغلاً بقراءة تفسير سورة يس من (أنوار التنزيل وأسراراً التأويل) عليّ، وتحرير فحوى مباحثه لدي، أردت أن أجمع مما جرى على الدرس من تقريرات، أدى اليها الفكر القاصر، والذهن الفاتر، رسالة وجيزة، وأوراقاً قليلة، تذكرة للأحباب وتبصرة للطلاب.»

کۆتاییەکەی:

الحمدلله على الإتمام والصلاة والسلام على خير الأنام، وعلى آله وأصحابه الكرام، وعلى تابعيهم وتابعي تابعيهم في عقائد الدين وفروع الاسلام. اللهم ثبتنا على الصراط المستقيم. وأفض علينا سجال فضلك العميم، وامنن علينا بحسابك اليسير، إن الفضل بيدك وأنت على كل شيءٍ قدير.

مۆری حەمزەی کوڕی عەلی (بندەء لم يزلي حمزەء بن علي) پێوەیە. لەتەک وەقفکردنیدا بەشێوەی: (وقف الولد الولد الوالد).

## دانراوێکی مەلا عەلی سوورچیی حەریری سۆرانیی کە لە بەرپەرچدانەوەی ڕەخنەکانی عیصامەدیندا لە تەفسیری سوورەتی (النبأ)ی بەیضاوی

٤٣١٨٣

سەرەتاکەی:

وبعد: فيقول المفتقر الى أفضال ربه الغني علي بن محمد السورچي الحريري: بينما نحن نتذاكر في أنوار التنزيل وأسرار التأويل للعالم الرباني، سند المحققين، القاضي البيضاوي، نورالله ضريحه، وجعل خير مونس رفيقه،

مراجعين الى حاشية للمدقق الفاضل عصام الدين -أعلى الله درجته في أعلى العليين- وقفت على ايراداته عليه في سورة النبأ، فاشتغلت بجرحها، مستمداً من الله لردها، لأن الأمر اليه وكل شيء يعود اليه.

کۆتاییەکەی:

بحمدالله تم ما قصدناه بقلب مجروح بتراكم سهام الفتن، وطبع مقروح بأمواج الهموم، بالبعد عن الوطن، نسأل الله أن يجعل التوفيق رفيقنا، والصراط المستقيم طريقنا. رحم الله قائلاً يقول آمين والحمدلله رب العالمين».

ئەم دانراوە (٨٢) لاپەڕەیە، کەچی هەر ئەم مامۆستا دانراوێکی دیکەی لە هەمان بابەتدا لە هەموو جزمی (عم)دا هەیە، ئەویان -تێکڕای- (٤٧) لاپەڕەیە. دانراوی دووەمیان -وەک لەم باسەدا دەیبینی- پێشکەش کراوە بە شێخولئیسلام فەیضوڵڵا ئەفەندیی. جا دەبێ کامیانی لەپێشدا دانابێت؟ جارێ نازانین.

## مامۆستا مەلا ڕەسووڵی سوورچیی

### ٣٦٠

لە دەستخەتە کۆنەکاندا لەتەک ناوی گەلێ لەو مامۆستایانەدا کە لە ناویان زیاتر هیچیان دەربارە نازانین، زۆر جار ناوی (ڕسول سورچی) لە کۆتایی پەراوێز و حاشییەکانەوە دەبینرێت و، هەرچەند ئەم ناوەم دیوە بەسەریدا تێپەڕیوم و لە عاستیدا دەستەوسان بووم؛ چونکە هیچ تروسکاییەکم بەدەستەوە نەبووە کە تووڵەڕێیەکی پێ ببینم بەرەو زانیارییەکی کەم لە ژیانییم بەرێ. تا ماوەیەک لەمەوپێش دۆستی بەڕێزم کاک شێخ ستار بەرزنجیی وتی: دوو دەستخەت لای زەلامێک هەن باسی مەلا ڕەسووڵی سوورچییان تێدایە، منیش لێی پاڕامەوە و داوام لێ کرد بەهیمەت یان بەقیمەت، بیانگەیەنێتە دەستم.

پاش ماوەیەک کاک شێخ ستار داواکەی بەجێ هێنام و، دوو دەستخەتەکەی بۆ هێنام. خۆشبەختانە دەستخەتێکیان بوو بەچراوکێک بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی شتێک لە ژیانی مامۆستای سوورچیی و، بەڵکو لەمەولایش زانیاریی زیاتری دەربارە بدۆزینەوە.

ئەو زانیارییانەی لە دەستخەتەکە وەردەگیرێن:

یەکەم: مامۆستای سوورچی لە سالانی ١٠٢٠ی کۆچی بەدواوە، واتە سەرەتای سەدەی

یازدەهەم، چەند مەدرەسەی ناسراو و بەناوبانگی ئەو سەردەمە گەڕاوە و، لەو مەدرەسانەدا -کە نازانین بەفەقێتی یا بەمەلایەتیی تیایاندا بووە- ئەو دەستخەتەی نووسیوەتەوە.

دووەم: ئەوە ڕوون و دیارە کە مامۆستا لەو سەردەمەدا لە ژیاندا بووە.

سێیەم: مامۆستا ڕەگەزی خۆی بۆ هۆزی (شێخەڵان) دەگێڕێتەوە، کە ئەم هۆزە ئێستە بەو ناوە ئەوەندە ناسراو نییە و، ئەم دەڵێ بەشێکە لە هۆزەکانی سۆران.

چوارەم: تەنها ناوی باوکی خۆی دەبات و دەڵێ: ڕەسووڵی کوڕی (ککال) و لەوە بەولاوە پشت و بنەماڵەی خۆی نانووسێت.

ناوی ئەو مەدرەسانەیش کە تیایاندا بووە بەم شێوەن و لە قەڵەمی خۆیەوە ناونووسیان دەکەین:

١- تمت الحاشية المسماة بميرزا جان، بعون الملك المنان، في بلدة هيزان، على يد أضعف العباد وأحوجهم الى الغفران، رسول ابن ككال المشهور بشيخلان، طائفة من قبيلة من قبائل الصهران، اللهم اغفر لهما ولجميع المسلمين بحرمة سيد الانس والجان، قد وقع الفراغ منها في وقت المغرب في يوم السبت السابع من الشوال، سنة ألف وإحدى وعشرين من الهجرة النبوية المصطفوية.

٢- هذا آخر ما قصدنا إيراده في شرح رسالة إثبات الواجب. تمت الكتاب بعون الملك الوهاب على يد أضعف العباد وأحقرهم رسول ابن ككال في بلدة بدليس، في مدرسة الإخلاصية، في شهر شعبان في يوم الإثنين، بين الطلوعين، سنة ألف وخمسة وعشرون! من هجرة سيد البشر اللهم اعتقنا من النار السقر.

٣- تمت الرسالة المتبركة في إثبات الواجب المنسوبة الى المولى المحقق مولانا جلال الدواني الصديقي، على يد أضعف العباد وأحقرهم رسول السورچي في شهر الله المبارك جماد الآخر، في يوم الأربعاء، في وقت الضحى، في بلدة هيزان، في مدرسة ميدان، سنة ألف وأثنتان وعشرون! من هجرة سيد الإنس والجان.

٤- تمت رسالة اثبات الواجب لمولى المحق (!) الرباني جلال الدواني، في يوم الآخر من جمادي الآخر في وقت الاستواء في قرية سينان على يد رسول سورچي.

دەبێ ئەوە نەبوێرین کە حاشیە و پەراوێزی مامۆستای سوورچیی بەسەر ئەم دانراوانەوە هەیە. واتە لەو کاتەدا ئەگەر فەقێیش بووبێت لە پلەیەکی بەرزی خوێندندا بووە و وەک مەلا وابووە.

ئەم دەستخەتەیش بەشێکە لە کتێبخانەی مەولانا حەمزەی سوورچیی سۆرانیی. کە مۆرەکەی (بەندەی ئەزەلیی حەمزەی بن عەلی)یە. دەستی تەماع لەم دەستخەتەدا مۆرەکەی کووژاندوەتەوە.

هەر لەتەک ئەم دەستخەتەدا کاک شێخ ستار دەستخەتێکی دیکەیشی بۆ هێنام. ئەمەیان ناو و مێژوو و شوێنی تێدا نووسینەوەی تێدا نییە. بەڵام ئەوە دیارە کە ئەمیش بەخەتی مامۆستا مەلا ڕەسووڵی سوورچییە و، حاشیەی ئەوی بەسەرەوەیە و، دواتریش لە کتێبخانەی بنەماڵەی سوورچییدا بووە، پێش ئەوەی ئەو کتێبخانە -کە نازانین کەی بووە- بشێوێت و دەستخەتەکانی پەرتەوازە بن.

کە باس باسی مامۆستا مەلا ڕەسووڵی سوورچییە و، لەوانەیە جارێکی دی بەم زووانە نەگەڕێمەوە خزمەتی ئەم مامۆستا بەڕێزە، بەپێویستی دەزانم ئاماژە بۆ یەک دوو بابەتی سەر بەم مامۆستا بکەم:

یەکەم: دەستخەتی ژمارە (١٤١٨٣ د.ع) حاشیەی عیصامە بەسەر جامییەوە، ئەم دەستخەتە حاشیەی زۆری مامۆستا مەلا ڕەسووڵی سوورچیی بەسەرەوەیە.

دووەم: دەستخەتی ژمارە (٣٥٥٣٠ د.ع)ش یەکێکە لەو دەستخەتانەی کە بەحاشیەی زۆری مامۆستای سوورچیی ڕازێنراوەتەوە.

سێیەم: مامۆستا ئەنوەر مائیی[1] لە (الاكراد في بهدينان)دا باسی چەند دانراو و حاشییەی ئەم مامۆستا دەکات و، دەڵێ: مامۆستای سوورچیی قوتابیی و فەقێی مامۆستا (يوسف الاصم) بووە. بەپێی ئەوەیش کە لە دەستی ئێمەدایە و لێرەدا نووسیمان کە مامۆستای سوورچیی ساڵی ١٠٢٠ دەستخەتی نووسیوەتەوە و مامۆستا (يوسف الاصم) لە سەرەتای سەدەی (١١)ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە ئەم قسە ڕێگەی تێدەچێت و، دەبێ چاوەڕوانی زیاتر لەم بارەیشەوە بین.

(١) بڕوانە: الأكراد في بهدينان. تأليف أنور المائي مطبعة الحصان الموصل ١٩٦٠، ص١٨٩.

## (تحفة المسكين الى جناب الأمين)ی ماموّستا مەلا محەمەد هاشمی کوڕی عەبدولغەفووری کوڕی عەبدوڕەحمانی سندیی

٣٦١

وەک زۆر جار گوتوومە و نووسیومە ئەمجارەیش دەیلێمەوە:

ئەم دانراوەیش بەڵگەیەکی دیکەی زیانی ئەندازە نەزانراو و قەرەبوونەکراوەی مێژووی ڕۆشنبیریی و زانایانی کوردە.

کێمان ناوی ئەم ماموّستای بیستووە؟ چ سەرچاوەیەکی بەردەستمان شتێکی لەبارەیەوە نووسیوە؟ ئەم ماموّستا -وەک خۆی لە پێشەکیی کتێبەکەیدا ڕوونی دەکاتەوە- هەر لە باسی حەجدا سێ کتێبی: گەورە و، ناونجیی و، بچووکی داناوە. ئەمەیان کە لە دەستدایە و هەواڵمان لێی هەیە بچووکەکەیانە دوانەکەی دیش ناویان ئاوایە:

١- حياة القلوب في زيارة المحبوب -صلى عليه وسلم- (گەورە).

٢- سفينة السالكين الى بلدالله الأمين (ناونجی).

٣- تحفة المسكين الى جانب الأمين -صلى الله عليه وسلم- (ئەم نامیلکەی بەردەستمان).

وەک گوتم هیچ سەرچاوەیەکی بەردەستمان شتێکی دەربارەی ئەم ماموّستا نەنووسیوە، بەڵام بەوە باشە کە ماموّستا خۆی لە سەرەتای کتێبەکەیدا ئەوەندەی نووسیوە کە ساڵی ١١٥٨ ئەم کتێبەی نووسیوە و ئەمەی لە کتێبی (تحفة السالكين)ی خۆی وەرگرتووە، کە ئەویش لە (حياة القلوب)ی خۆی کورتکراوەتەوە.

ئەم کتێبە وەک لە ناوەکەیەوە ئاشکرایە کتێبێکی شەرعە و، باسی حەج و عومرە و زیارەتی پێغەمبەر (د.خ) دەکات. بەخەتێکی جوان و خۆش و خۆشخوێن نووسراوەتەوە، بەداخەوە کۆتاییەکەی نەماوە و نازانین کەی و لەکوێ نووسراوەتەوە و کێ نووسیویەتیەوە.

دەستخەتەکە درێژکۆڵەیە و لەسەر شێوەیە (بەیاض) نووسراوەتەوە و ئەوەی کە ماوە (٩٠) لاپەڕەیە و لە (دار العراق للمخطوطات)دا بەژمارە (٢٣٥٧٤) پارێزراوە.

## شەرحی عەقائیدی سەلّماسیی

### ٣٦٢

٢٦٧٨٨

سەرەتاکەی:

«اما بعد: فيقول العبد الفقير المحتاج الى رحمة الله الرحيم، محمد بن سعيد بن ابراهيم السلماسي رزقه الله حجة الأولياء، وحفظه عن مقالة الأعداء: التمس مني بعض أهل الصدق والصفاء والجود والوفاء، ان أشرح الرسالة التي صنفها شيخي وأستادي المولى المعظم والامام الأعظم، المحقق المدقق، فريد دهره، علامة عصره، المولى امين الملة والدين الحاج بله التبريزي -قدس الله سره العزيز- في علم أصول الدين...»

کۆتاییەکەی:

دەستخەتەکە دەستی تەماعی ... لەیەکی هەڵتەکاندووە و بەشبەشی کردووە، وا دیارە کۆتایی ئەم دانراوە تێدا چووە. هەروەها ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەی دیار نەماوە. گەلێ گەڕام پارچەیەکی دیکەم لێ دۆزییەوە کە بەژمارە ٢٦٧٧٩ پارێزراوە و، (طبقات الفقهاء)ی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری موصەننیفە، ئیتر خودا دەیزانێ بەشەکانی دی بە چ دەردێ چوون.

## مامۆستا مەلا عەلی سیامەنسووری (عەلی حیکمەت)

### ٣٦٣

مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت (سیامەنسووریی) و کتێبخانەکەی:

یەکێکی دی لە مامۆستا مەزنەکانی کورد کە لە سەردەمی خۆیدا دەورێکی باڵا و دیاری لە خزمەتکردن و گەشەپێدانی ڕۆشنبیری و پێگەیاندنی قوتابی و مامۆستایانی کورددا بووە و، گەلێ مامۆستای دیاری پێگەیاندووە و، ماوەیەکی باش مەدرەسەی دەوڵەمەند بەفەقێی زرنگ و لێهاتووی هەبووە و، دواییش کتێبخانەیەکی باشی پێکەوە ناوە، بەڵام ئەمیش -وەک زۆربەی مامۆستایانمان- دوای خۆی کتێبخانەکەی نەپارێزراوە و پرژ و

بڵاوبوونەتەوە و، زۆری کتێبەکانی تێداچوون و کەمێکیان بەبێنازیی گەیشتوونەتە (د.ع).

لەم دەرفەتەدا یادێکی بچووک لەم مامۆستا مەزنە دەکەینەوە.

سەرەتای ژیانی ئەم مامۆستا بەوردیی نازانین و، نازانرێ کەی لە دایک بووە. ئەوەی زانراوە ناوی عەلی کوڕی حاجی عەبدولوەهابە و، لە گوندی سیامەنسووری سەر بەپارێزگای کەرکووک لە دایک بووە.

ئیتر نازانین لەلای باوکی خوێندوویەتی یان لەلای مامۆستایانی دی، وەک نازانین لەلای کێ ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە، ئەوەندە دەزانین ساڵی ١٢٣٩ وەک لە دەستخەتی ٤٣٩٤٠ د.ع دا هاتووە کە دانراوی عەبدوڵڵا یەزدییە، مامۆستا مەلا عەلی لە شاری سلێمانی لای مامۆستا شێخ محەمەد نەسیم خوێندوویە.

مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دەفەرموێ: ساڵی ١٢٧٥ لە دایک بووە و ساڵی ١٣٣٨ کۆچی دوایی کردووە. بەڵام وەک لە مێژووی عەبدوڵڵا یەزدییەکەوە دەردەکەوێ ئەم مێژووەی مامۆستای مودەڕیس فەرموویەتی دروست نییە.

هەروەها دەزانین مامۆستامان لە پیاوە بەتەمەنەکان بووە، چونکە مامۆستا و مەلا مەحموودی کوڕی ڕەسووڵ ساڵی ١٣٢٤ کتێبی (البرهان الحق في رد من تمسك بعد وقوع الطلاق الثلاث ببطلان نكاح من سبق) کە بەژمارە ٢٦١٦٥ د.ع پارێزراوەی بۆ مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت نووسیوەتەوە.

ئەوەی کە ئاشکرایە لە ژیان و پلەی خوێندن و دەرسوتنەوەی مامۆستای سیامەنسووریدا ئەوەیە مامۆستایەکی مەزنی خاوەن دانراو و کتێبی بەپێز و بایەخی سەردەمی خۆی بووە و، ئەوەی لەو کتێبانە زانیومانە ئەوەیە:

١- کتێبێکی داناوە و پێشکەشی کردووە بەشێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدوڕەحمانی تاڵەبانیی و سەرەتاکەی ئاوا نووسیوە:

«وبعد فيقول الفقير الى الله الغني، علي بن عبدالوهاب الشاه منصوري، حفهما بالعفو والمغفرة يوم ينفخ في الصور: إنه التمس مني الفاضل الزكي سليمان القربگي ان وفقه الله على اكتساب المجهول من المعقول، أن أبين النسب بين القضايا الموجهة، فكتبت فرائد بيمن من هو مصباح الأمم، ومفتاح الكرم، وكنز العلم والحكم، ومطهر الظواهر من الفسوق والبطالة، والبواطن من الزيغ

والجهالة، أعني به منبع المعاني، الشيخ عبدالرحمن الطالباني.»

- هەروەها مامۆستا مەلا عەلی دانراوێکی دیکەی هەیە کە بریتییە لە شەرحێک بەسەر (مختصر البیان)ی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری میر ڕۆستەمییەوە.

لە د.ع دا بەژمارە ٤٣٨٦٣ د.ع پارێزراوە، بەڵام بەبۆنەی ئەوەوە دەستخەتەکان لە ترسی جەنگ پێچرابوونەوە نەمتوانی بیبینم تا زیاتری لەسەر بنووسم.

لە ڕێگەی دەستخەتەکانەوە ئەوەندەیشمان بۆ دەرکەوتووە کە مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت لە ساڵی ١٣٠١دا لە مزگەوتی حاجی ئەحمەد ئاغا مامۆستا بووە و، ئەحمەدی عیزەتی کەرکووکی کوڕی محەمەدی کوڕی شەمسەدین لە ساڵی ناوبراودا لە خزمەتیدا خوێندوویە و کتێبی (قول احمد)ی نووسیوەتەوە و بەژمارە ٧٧٢٤ د.ع پارێزراوە.

وەک گومان مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت کتێبخانەیەکی بەیەکەوە ناوە، دوای خۆی پەرتەوازە بووە و، دەستخەتەکان بێناز کەوتوون و، توانیمان لە (د.ع)دا ناوی ئەمانەیان بدۆزینەوە:

١- شەرحی محەمەدی کوڕی ئەسعەدی سدیقی دەووانیی بەسەر عەقائیدی عەضودییەوە، کە بەخەتی مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت خۆیەتی و، ئەم مێژووانەیشی تێدا نووسیوە:

* کۆچی دوایی باوکی ساڵی ١٣٠٢.
* لە دایکبوونی صیبغەتوڵڵای کوڕی لە ساڵی ١٣٠٥.
* لە دایکبوونی محەمەد فەیضی کوڕی ساڵی ١٣٠٩.
* لە دایکبوونی عەبدوڵڵا لەبیبی کوڕی ساڵی ١٣١٤.

لەم ناوانەیشەوە دەردەکەوێ کە مامۆستامان دەیەوێ ناوی گەورە زانایانی کوردی وەک صیبغەتوڵڵا و محەمەد فەیضی و... بەکوڕەکانی زیندە ڕابگرێ، بەهیوای ئەوەی کوڕەکانی جێگەی ئەوانە بگرنەوە. ئەم دەستخەتە بەژمارە (٤٣٨٧٨/١ د.ع) پارێزراوە.

* دانراوی ژمارە دووی هەمان دەستخەت بریتییە لە نامیلکەی عەرووزی شێخ مەعرووفی نودێیی، مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت ساڵی ١٢٩٤ نووسیویەتیەوە.
* الفوائد الحسنیة بالعمل بالربع المجیب: دانراوی کوچک مەلا، عەبدولکەریمی بیبانیی ساڵی ١٣١٦ لەبەر خاتری مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت نووسیویەتیەوە. بەژمارە ٤٣٩١٢ پارێزراوە.

* (الرسالة الماردينية) کە بەژمارە ١/٤٣٩١٧ د.ع پارێزراوە سولەیمان بانەیی ساڵی ١٢٩١ لەبەر خاتری مەلا عەلی سیامەنسووریی نووسیویەتیەوە.
* (رسالة الحساب)ی بەهادینی عامیلیی کە بەژمارە ٢/٤٣٩١٧ پارێزراوە و حاشیەی مەلا عەبدوڵلای پیرەبابی بەسەرەوەیە بەخەتی مەلا عەلی سیامەنسووریی و محەمەدی کوڕی خەلیلی کوڕی عەبدوڵلای کۆڕعومەریی ساڵی ١٣٢١ نووسراوەتەوە.
* حاشیەی بەهائییە کە بەژمارە ٣/٤٣٩١٧ کە بەخەتی مەلا عەلی سیامەنسوورییە.
* (رسالة في العمل بالربع المجيب لمعرفة ساعة الوقت) عەبدوڵلای کوڕی عەبدوسەمەدی سەڵەنیی لەبەر خاتری مەلا عەلی سیامەنسووری نووسیویەتییەوە و، حاشیەی هەمان مامۆستایشی بەسەرەوەیە.
* ئەو دوو دەستخەتەیش ئاماژەمان بۆ کردن کە بریتیی بوون لە:

أ- (البرهان الحق في رد تمسك بعد وقوع الطلاق الثلاث ببطلان نكاح من سبق) کە بەژمارە ٢٦١٦٥ پارێزراوە و لەبەر خاتری مامۆستا مەلا عەلی سیامەنسووریی نووسراوە.

ب- ئەو دەستخەتەیش کە بەژمارە ٤٣٩٤٠ پارێزراوە و، مامۆستا مەلا عەلی کاتی فەقێیتیی لە سلێمانیی نووسیویەتیەوە.

بێگومان مامۆستایەکی گەورە و بلیمەت کە تەمەنێکی درێژی بەپێزی لە شاری کەرکووکدا بەسەر بردبێت و دەرسی بەدەیان فەقێ و مەلای زیرەک و زرنگ گوتبێ... کتێبخانەیەکی گەورەی پێکەوە ناوە و دەیان و سەدان کتێب و دەستخەتی نایاب لە کتێبخانەکەیدا کۆبووەتەوە، بەڵام دیارە زۆریان تێداچوون و کەمیان ماون و لەوەیش کەمتریان بەرچاوی ئێمە کەوتووە.

**قوتابیی و موجازەکانی مامۆستا سیامەنسووریی:**

مامۆستا سیامەنسووریی کە لە شاری کەرکووکدا نیشتەجێ بووە و، مامۆستای مزگەوت بووە و، تەمەنێکی پانوبەرین و درێژ و بەپێز و بەرەکەتی لە بواری دەرسوتنەوە و فەقێ و مەلا پێگەیاندندا بەسەربردووە، گومانی تێدا نییە دەیان و زیاتریش فەقێی چاک و مامۆستای کارامەی پێگەیاندووە و، دوای ئەوەی ئیجازەی دەرسوتنەوەی داونەتێ مەشخەڵی ڕووناکبیرییان هەڵگرتووە و شوێناو شوێن و گونداو گوند ڕێگەی ڕۆشنبیرییان

بۆ نەوەکانی گەلەکەیان ڕۆشن کردووەتەوە، بەڵام بەداخەوە نەمامۆستا خۆی ناویانی نووسیوە و دەفتەری بۆ کردوونەتەوە -ئەگەر کردبێتیشی تێداچووە- و، نەخۆیشیان دەقی ئیجازە و مێژووی ئەو ڕووداوە مێژووییانەیان بۆ تۆمارکردووین و، بەمەیش ئەو لاپەڕەیە پرشنگدارەی ژیانی ئەم مامۆستا و فەقێ و موجازەکانیمان لەکیس چووە.

پاش گەڕان و هەوڵێکی زۆر بەشوێن شوێنەواری مامۆستا مەلا عەلی سیامەنسووریدا توانیم ناوی دوو مامۆستا بدۆزمەوە کە لە قوتابییە وریا و خوێندەوار و لێهاتووەکانی ئەم مامۆستا دەژمێرێن و، لێرەدا بەکورتیی ناویان دەخەینە سەر ئەم باسە:

یەکەمیان: مامۆستا مەلا عوثمانی خورمڵەییە: ئەم مامۆستا زۆربەی خوێندنی لای مامۆستا مەلا عەلی حیکمەت بووە و، دواییش لای ئەو ئیجازەی وەرگرتووە. یەکێک بووە لە مامۆستا بەتەمەنەکان و نزیکەی سەد ساڵ ژیاوە. ساڵی لەدایکبوونی بەدروستیی نازانین، ساڵی ١٩٥٠ز کۆچی دوایی کردووە.

پاشماوەی کتێبخانەکەی لای مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای کوریەتی کە بەمامۆستا مەلا عەبدوڵڵای عوەینە ناسراوە و، ئەم مامۆستا ساڵی ١٣٣٢ لە دایکبووە و ئێستە لە ژیاندایە و، ڕۆژی ٢٠٠٣/٦/١٦ چوومە خزمەتی و ڕێگەی دام شوێنەوارەکانی باوکیم بینی و دوو دانراوی باوکیشیم لەناو شوێنەوارەکانیدا دی، لەم هەڵەدا بەمێژووی زانیاریی کوردیان دەناسێنین:

١- نامیلکەی یەکەم (رسالة في مسألة النفس الانسانية) کە سەرەتاکەی ئاوایە:

«أما بعد فيقول خورملي المفتقر الى رحمة ربه المقتدر: لما كان تفصيل الاختلاف في العلم ومحله امرا مهما، رأيت نظمه في سلك التحرير، مستمداً من الحكيم الخبير، فاعلم إن النفس الإنسانية عند جمهور المتكلمين جسم لطيف حامل قوة الى أعضاء البدن سارٍ فيه سريان الماء في الورد، لايتبدّل ذاته...»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«مقولة الإضافة كذا في شرح المواقف مع زيادة نقلا عن غير، سبحانك لاعلم لنا إلا ما علمتنا إنك أنت العزيز الحكيم. وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين».

٢- (رسالة في توجيه بعض ألفاظ القرآن) سەرەتاکەی ئاوایە:

«وبعد: فيقول الراجي عفو ربه العلي، المشتكى اليه عثمان الخورملي: لما كان

في العبارات القرآنية اشكال وخفاء يكون بعضها ماضيا وبعضها مضارعا، وبعضها أمرا إلى غير ذلك من الدال على الزمان، وأزلية صفاته تعالى كأزلية ذاته، تنادى علي تنزهها عن وقت وآن كما أفصح به كتب العلماء القادة النخبا، جمعت في مواضع من كتب الكلام والأصول ما يزول به الخفاء، وينزل به الشفاء...»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«أو يقول في دفع الإشكال: لم لايجوز أن تكون هذه الصيغ على كلا القولين من المتشابهات، وهي التي استأثر الله تعالى بعلمها، وقد يطلع عليها بعض أصفيائه؟ الحمدلله على الاتمام، والصلاة والسلام على خير الأنام، وعلى آله وأصحابه الكرام».

جگە لەم دوو دانراوەی خۆیشی مامۆستای خورمڵەیی کۆمەڵێک دانراوی مامۆستایانی دی نووسیوەتەوە، تۆمارکردنیان بۆ ڕەوتی خوێندنی مامۆستا و بوونی هەندێ حوجرە و مەدرەسەی کوردستان لەو سەردەمەدا بێ سوود نییە.

أ- دەستخەتێک کۆمەڵێ دانراوی تێدایە لەوانە:

١- نامیلکەی (عصام الدین) عوثمانی خورمڵەیی ساڵی ١٣١٧ لە گوندی کۆزەپانکە نووسیویەتیەوە.

٢- (سید شریف) مامۆستا مەلا عوثمان هەمان ساڵ لە هەمان مەدرەسەدا نووسیویەتیەوە.

٣- (رسالة الوضع) عەبدوڵلای کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانی کۆیی ساڵی ١٣٠٥ لەبەر خاتری مەلا عوثمانی خورمڵەیی نووسیویەتیەوە.

٤- (الاستعارة) مەلا عوثمانی خورمڵەیی ساڵی ١٣١٦ لە گوندی خورمڵە نووسیویەتیەوە.

ب- شەرحی موغنیی میلانیی مەلا عوثمانی خورمڵەیی ساڵی ١٣١١ نووسیویەتیەوە.

ج- تەسریفی مەلا عەلی، عوثمانی خورمڵەیی ساڵی ١٣١٢ لە ئەربیل نووسیویەتیەوە.

د- سەعدوڵلا ساڵی ١٣١٥ مەلا عوثمانی خورمڵەیی نووسیویەتیەوە.

ه- (عصام الدین) شەرحی عەضودییە ساڵی ١٣٢٠ نووسیویەتیەوە.

و- کۆمەڵێک دانراو لەوانە:

١- نامیلکەی عەرووز محەمەد سالح سالی ١٣٢٠ لەبەر خاتری مەلا عوثمانی خورمڵەیی نووسیویەتیەوە.
٢- ریسالەی حیسابی بەهادینی عامیلیی، محەمەد عەلی کەپنەک ڕەش سالی ١٣٢٦ لەبەر خاتری مەلا عوثمانی خورمڵەیی نووسیویەتیەوە.
٣- (بیان نسب القضایا )ی عەبدوڵلا ی کوڕی حەیدەر.
ز- کۆمەڵێک دانراو:
١- شەرحی مەسئەلەی عیلمی عەبدولکەریم، شەرحەکەی دانراوی مامۆستا مەلا عەبدولقادری موهاجیرە.
٢- نامیلکەی خەلقی ئەفعالی جەلالەدینی دەوانیی لە عەقائیددا.
٣- حاشیەی شێخ عەبدولقادری سنەیی بەسەر عەقائیدی جەلالەدینی دەوانییەوە. ئەحمەدی ناوبڕکەیی سالی ١٣٢٧ لە مزگەوتی ئەحمەد ئاغا لە کەرکووک نووسیویەتیەوە.
ح- کۆمەڵێ دانراو. لەوانە:
١- نامیلکەی ئیرادەی جوزئی مەولانا خالید.
٢- حاشیەی سەید محەمەد ئەمینی بەرزنجیی بەسەر عەبدوڵلا یەزدییەوە.
٣- (اجزاء القضیة)ی چۆڕیی.
٤- نامیلکەی (المغالطات) لەگەڵ (الاجوبة الشافیة) دانراوی سەید حەسەنی بەرزنجیی.
٥- (أجزاء القضیة)ی مەلا عەلی قزڵجیی مەلا عوثمانی خورمڵەیی سالی ١٣٢٨ نووسیویەتیەوە.

دووەمیان: مامۆستا مەلا عەبدوڵلای کوڕی شێخ عەبدوسەمەدی سەڵەنیی:

هیچمان دەربارەی لەدایکبوون و کۆچی دوایی ئەم مامۆستا دەست نەکەوتووە و، ئەوەی زانیومانە ئەوەیە فەقێی مامۆستای سیامەنسووریی بووە و لای ئەو خوێندنی تەواو کردووە و ئیجازەی وەرگرتووە.

جا کە سەرچاوەکانی مێژوو لە عاستی ئەم مامۆستادا بێدەنگن و شتێکمان دەربارەی لە دەستدا نییە چی لەوە باشتر کە هەندێک لە شوێنەواری مامۆستامان بۆ مێژوو تۆمار بکەین و، لەو ڕێگەیشەوە ناوی بخەینە سەر لاپەڕەکانی مێژوو؟

یەکەم: دانراوێکی مامۆستا خۆیەتی کە ناوی (رسالة في معرفة ساعة الوقت)ە و بەخەتی دانەرەکەیەتی و، سەرەتاکەی ئاوایە: دوای سەڵات و سەلام دەفەرموێ:

«وبعد: فلما لم يكن باب معرفة ساعة الوقت بالربع المجيب مسطورة في الرسائل العربية التي بأيدينا، ولم يكن بدٌّ من كشفها وإيضاحها يقينا، وكانت عندنا رسالة تركية يبحث عنها بحث مبيناً، أمرني الشيخ الذي كان للسراط المستقيم أمينا، الاستاذ العلي اللوذعي، الذي صار لإتقان العلوم حصنا حصينا، بترجمة ذلك البحث لتصير معرفته في أذهاننا رصينا، مع عدم علمي باللغة التركية، وقلة فهمي بالاصول الميقاتية، فامتثلت لأمره السامي، فترجمته، فجاء بحمده الحامي، كمايتفكه به الناظرون، ويقبله الأذكياء المتفطنون، بالله أستعين وهو نعم المعين».

ئەم پێشەکییەم بۆ ئەوە گواستەوە ئێرە تا خوێنەری ئازیز لەڕوویەوە توانای مامۆستای سەڵەنیی لەکاتی فەقێیتیدا بزانێ و، بزانێ مامۆستامان کاتێک فەقێ بووە توانای دانانی کتێبی بووە و، ئەو کتێبەی نووسیویەتی وەک (بحث التخرج)ی قوتابییانی زانکۆی ئەم سەردەمە وایە و، لەمەیشەوە دەتوانین بڵێین: مەدرەسەکەی وەک زانکۆیەک وابووە.

ئەمەیش کۆتایی ئەم دانراوە:

«زدناه على ست تصير ثماني ساعات وأربعا وأربعين دقيقة، فهي ساعة الوقت، والله أعلم بحقيقة الحال، وإليه المآب والمآل. وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين. على يد مؤلفها فقير رحمة الله الغريب بالديار السوسية الخوزستانية الهوشنجية، عبدالله بن الشيخ عبدالصمد السلاني، في ليلة الخميس، الثلاثين من ذي الحجة، عام اربعة وعشرين بعد ثلاثماءة وألف، اللهم اجعل خاتمة أمورنا خيرا، ولا تلحق بنا من تبعة شرورنا ضيرا،....»

دوای ناساندنی ئەم نامیلکە دوو دەقی دیکەی مامۆستای سەڵەنی دەنووسین کە لە هەمان ساڵدا نووسیونی.

١- تمت لمن حصن سياساتنا الدينية والدنيوية، بنتائج الأقلام، وألهمنا علوماً ومعارف تنور البصائر وتشحذ الأفهام. وأرسل إلينا محمداً (ص) فهدانا لدين الإسلام، فعليه مع آله وأصحابه أتم الصلاة وأكمل السلام.

وبعد: فيقول المفتقر الدني، إلى عفو المقتدر الغني، عبدالله بن الشيخ عبدالصمد السلاني: بعد ما كنت مدة مديدة، وأزمانا عديدة، قدمت رجلاً، وأخرت أخرى،أجدر وأحرى، لكتابة شرح الشافية لكمال الدين الذي صار لفن التصريف الماء المعين، فصار ذلك خلجة في بالي، وعقدة عظيمة مورثة لبلبالي، أفضاني قضاء الله تعالى والقدر، الى بلد رومى أهله من ماء الكوثر، بسبب إفاضة إفادات من تخلق بالأخلاق الوهابية، وتلبس بخلع ارتقاء نفسه المطمئنة الى المقام الموسوم بالابية. وأقام مقاما عظيما لانتشار العلوم الآلية، والرياضية الحقيقية الغير ريبية، فبالحقيقة بن يحيى مندرسات العلوم، ويجني ثمرات المعقول والمفهوم. وهو العلي الذي علا به علوم الاسلام، وسما منار اقتدار الاعلام، لازالت رحابه الزكية مناخ مطايا أرباب الفضائل، ولا برحت منزلته السفية، مآب الأماثل، ولا انفك امدادات ظله لحماية نكات الخوالف والاوائل. هذا ولسان التوقير في مدحه مفرط في التقصير. فلما استأمنت بتقبيل أياديه، واستشرفت لديه بإفادة مطالب العلم ومباديه. أسعفت بشوق الكتابة الموما إليها. وطفقت أشرف على الهلاك إن أردت إيقاع الاعراض عليها، فعلمت أن هذا من ميمنته، ونتائج علوه ومسومته، فاستخرت الله تعالى، وشمرت ساق الجد مبتدياً بها أواسط شعبان ليلة الاثنين خلت منه اثنا عشر يوما، وفرغت منه أواخر رمضان خلا واحد وعشرون يوماً، يوم الخميس فيكون مدة الاشتغال بها ٣٩ يوما، جعله الله منتفعا بها ومنعما عليها. ولا جعلنا نادمين كندامة إبان. وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما، سنة أربع وثلاثمائة وعشرين بعد الالف هجرية.

حررته مجتهداً وليس يخلو عن غلط.

قل للذي يلومني: من ذا الذي ماسها قط؟

لە ژێر ئەمەدا مۆری مامۆستای سەڵەنییە:

فسيكفيكهم الله وهو السميع العليم.

لە ناوەڕاستی مۆرەکەیشدا نووسراوە: (عبدالله).

عەبدوڵڵا کوڕی شێخ عەبدوسەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مەلا مەحموودی کوڕی خاوەن کەرامەتی زۆر و ناسراو بەمەلا ئیبراهیمی گەورەی کوڕی مەلا کامیلی کوڕی شێخ

عومەری سەڵەنی نووسیویەتیەوە، لەم دەقەیشەوە دەردەکەوێ کە ئەم مامۆستا لە بنەماڵەیەکی مەلازادە بووە و، دیارە کە باپیریان بەمەلا ئیبراهیمی گەورە بەناوبانگ بوو‌بێت، ئەو مامۆستا مەلا چاک و گەورە مەلا بووە و، ڕەنگە چەند دانراو و شوێنەواری باشی بووبێت، بەڵام چ خۆی و چ باوکی و چ نەوەکانی لە ناوەکانیان بەولاوە -کە ئەوانیشمان بەبۆنەی ئەم دەقەوە زانیوە- هیچیان دەربارە نازانین.

لە پەراوێزێکی ئەم دەستخەتەدا مامۆستای سەڵەنیی نووسیویە: لە ٢٧ی سەفەری ساڵی ١٣٢٥دا خودا کوڕێکی پێ بەخشیوە ناوی ناوە محەمەد ئەسعەد. لەدوای ئەمەیشەوە مۆری (إني عبدالله)ی داناوە. ئەم دەستخەتە ٣٥٨ لاپەڕەیە و هەمووی بەخەتی خۆیەتی و، حاشیەی مامۆستای مامۆستا مەلا عەلی بەسەرەوەیە.

لە کۆتایی نامیلکەی (الربع المجيب)یشەوە نووسیویە:

«تمت وعلى الكاتب الرحمة، وعلى من دعا له بالمغفرة، استراح أنامل الحقير الفقير عبيدالله بن الشيخ عبدالصمد السلاني في كركوك لدى خدمة الفاضل مولانا ملا علي دام رأفته ولطفه، في فصل الشتاء، في وقت العشاء، ليلة الاحد سادس ذي الحجة سنة اربع وثلاثمائة وعشرين والف، من هجرة النبي ذي الشرف، وقت انتقال كوكبة علي أكبر خان الى بلدة موصل للمرافعة مع الدولة العلية العثمانية...»

لە کۆتایی پەڕاوێزێکی دییەوە هەر لەم دەستخەتەدا مێژووی ساڵی ١٣٢٤ی نووسیوە.

لە شوێنێکی دیدا دەنووسێ کاتێ سوپای عوثمانیی بەسەرکردەیی محەمەد فاضیلی چەچانیی ڕووەو لاهیجان ڕۆیشت بۆ گرتنی دەستەڵات و وڵات لە عەجەم لە شاری کەرکووک لە مەدرەسەی خانەقای سەید ئەحمەدی سەرگەڵوویی ئەم کتێبەم نووسیوەوە.

هەروەها دەربارەی سلێمانی قەرەبەگیش شتێک لە دەستدا نییە و، دوور نییە میرێ یان ناودارێ یا کوێخایەکی ئەو ناوچە بووبێت لەو سەردەمەدا.

بەڵام شێخ عەلیی تاڵەبانیی -کە دیارە ئەم مامۆستا مورید و سەر بەڕێبازەکەی بووە- پیاوێکی چاک بووە و خاوەن ڕێباز و زانا و خاوەن دیوەخان و نانبدە بووە. ئەم پیاوە لە ساڵی ١٢٤٨ی کۆچیدا لە دایک بووە و، پاش تەمەنێکی پیرۆزی پڕ خزمەت ساڵی ١٣٣٠ک لە کەرکووک لە جیهان دەرچووە.

دوایی بۆم دەرکەوت ئەم مامۆستا حاشیەیەکی بەسەر نامیلکەی (مختصر البيان)ەوە هەیە، بەژمارە ٤٣٨٦٣ پارێزراوە، بەڵام کە ئەم باسەم دەنووسی دەستخەتەکانی (د.ع) لە

ترسی جەنگ پێچرابوونەوە، بۆیە نەمتوانی دەستخەتەکە ببینمەوە و بەدرێژیی باسی بکەم.

هەروەها بۆم دەرکەوت ئەم مامۆستا کتێبخانەیەکی باشی بووە و، بەشێکی بەخەتی خۆی بووە، بەڵام ئەمیش دووبارە تێکچووە و، شپرزە بووە و، پەرتەوازە و بێناز دەستخەتەکانی بەملاودا لادا بڵاوبوونەتەوە، لەبەر ئەمە نازانین کتێبخانەکەی چەند بووە و، چەند دەستخەتی تێدا بووە و، چەندیان بەخەتی خۆی بووە. ئەوەندەی بۆمان لوا بەشوێن شوێنەواری ئەم مامۆستادا گەڕاین و، چیمان بینیی و پێمان زانی زانیاریمان لەسەر کۆکردنەوە، ئەمەیش کەمترین شتە کە زۆر بچووکیشە بۆ مێژووی زانایانی کورد لەسەر ئەم مامۆستا پێشکەشی بکەین، بەڵکو ئەمەیش دواکار و قوناغ نەبێت کە بۆ ئەم مامۆستا بەرێزە دەکرێت. ئەوەیش کە دەستمان کەوتووە ئەو دەستخەتانەن لە (د.ع)دا لەنگەریان گرتووە، ئێمەیش بەرز و زنجیرەی ژمارەکانیان لەو کتێبخانەدا دەیانخەینە سەر لاپەڕەکانی ئەم باسانە:

١- ١/٤٣٨٧٨ - شەرحی محەمەدی کوڕی ئەسعەدی سەدیقی دەوانیی بەسەر عەقائیدی عەضودییەوە.

عەلی کوڕی عەبدولوەهابی سیامەنسووریی نووسیویەتیەوە. هەندێ زانیاریی لە کۆتاییەوە نووسیوە، لەوانە:

* کۆچی دوایی باوکی ساڵی ١٣٠٢.
* لە دایکبوونی صیبغەتوڵلای کوڕی مامۆستای سیامەنسووریی.
* لە دایکبوونی محەمەد فەیضی کوڕی ١٣٠٩.

حاشیەی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای پیرەبابی بەسەرەوەیە. محەمەد خەلیلی کوڕی عەبدوڵلای (کۆر عومەری) ساڵی ١٣٢١ نووسیویەتیەوە، هەروەها حاشیەی گەلێ مامۆستایانی دیکەی بەسەرەوەیە.

٣/٤٣٩١٧ - حاشیەی بەهائییە: مامۆستا مەلا عەلی کوڕی عەبدولوەهابی سیامەنسووریی نووسیویەتیەوە.

٤٣٩٢٠ - رسالة في العمل بالربع المجيب لمعرفة ساعة الوقت: عەبدوڵلای کوڕی شێخ عەبدوصەمەدی سەلانیی لەبەر خاتری مامۆستا مەلا عەلی سیامەنسووریی نووسیویەتیەوە، حاشیەی مامۆستا خۆیی بەسەرەوەیە.

## تەعلیقاتی مەلا سلێمان بەسەر گەلەنبەویی ئادابەوە

٣٦٤

٢/٤٢٤١٢

سەرەتاکەی:

«أما بعد: فيقول أحوج المفتقرين الى رحمة ملك الملوك سليمان سالم المستوطن زاوية الخمول من كركوك، نظر الله بعين عنايته اليه، وغفر له ولوالديه: هذه كلمات من سوانح الخاطر الملول وعوائد فوائد الاجلة الفحول عسى أن ينتفع بها الطلاب، في حل رسالة الآداب، للعالم الشهير، والعلم الخطير، علامة الروم فهامة الرسوم، مولانا اسماعيل العريف بالگلنبوي، عليه رحمة الملك القوي.»

کۆتاییەکەی:

«وفي الثاني قطعه السائل بعد الشروع فيه والإقدام عليه، فافهم والله سبحانه وتعالى أعلم.

قد وقع الفراغ من تسويد الكلمات الواقعة على رسالة الگلنبوي على يد أحمد البلاوي سنة ١٣٢٩.

وا دەردەکەوێ ئەم مامۆستایش خاوەنی دانراوگەل بووە و، دانراوەکانیشی لەناو فەقێ و مەلایاندا بڵاوبوونەتەوە و، فەقێیان نوسخەیان لەبەر نووسیونەتەوە و، بەدەرس لای مامۆستایانیان خوێندویانن. ئەوەتا خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا عەبدولمەجیدی قوطبیش -بەدەوری خۆی- دوو دانراوی ئەم مامۆستای نووسیوەتەوە.

یەکەمیان هەمان دانراوی سەرەوەیە و بەژمارە (٢/٣٥٦٢٩) پارێزراوە و مامۆستا مەلا عەبدولمەجید لەبەر نوسخەی دانەرەکە نووسیویەتیەوە و، دۆعای خێروخۆشیی بۆ دەکات. نووسینەوەکەی لە ١٥ی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٤٨دا.

دووەمیان هۆنراوەی ئیستیعارەیە، سەرەتاکەی دوای سوپاس و ستایش و صەلات و سەلام ئاوا دەست پێدەکات:

| | |
|---|---|
| وبعده يا طالب البيان | يا مغرماً في طلب المعاني |
| خذ من سليمان نظيماً جعلا | لجيد بلقيس بلاغة حلى |

| | |
|---|---|
| بنـوره تقـرًّ عــين المبـتـدي | الــى معــالم البيان يـهتدي |
| فــحـان أن أشــرع بالمـرام | والـلــه حسبى وبه اعتـصامي |
| ها أنـــني معرفــاً أقـول: | عــلـم البـيان إنـــه أصــول |

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| رســالة البـيــان نظمــاً تمت | حــمــداً لمن آلاؤه قــد عــمت |
| وأكـمل الصـلاة والتـحــايا | علـــى النبي سيـــد البـرايا |
| وآلـــه وصحـــبه الأبـــرار | مـــا ناح قمري على الأشجار |

قد فرغ من استنساخه على نسخة الناظم دام ظله، وأفيض علينا بركاته آمين، صبيحة السبت تاسع شهر رمضان لسنة الف وثلاثمائة وثمانية! وأربعين في المسجد المشهور هو بمسجد شيخ نوري عفى عنه، العبد المستغرق في بحار الذنوب السابح في أنهار الخطايا والعيوب، الراجي من ربه العفو الغفور، التجاوز عما صدر عنه من الهفوات والقصور، عبدالمجيد الملقب بقطب زاده، زاده الله في الدارين رفقة وسعادة، وحشره مع ابائه في زمرة عباده الذين قال في حقهم: للذين أحسنوا الحسنى وزيادة.

ئەم هۆنراوە (١٤٧) بەیتە. بەخەتێکی زۆر جوان نووسراوەتەوە.

**١٧٠٠٤ د.ع**

**٣٦٥**

نامیلکەیەکی بچکۆلەیە سەرەتاکەی ئاوایە:

وبعد: فيقول العبد المفتقر الى العليم الشاهد محمد بن يوسف الزاهد: لما كانت مسألة التقليد التي يحتاج إليها المفيد والمستفيد، قد بينها العلامة الأشهر، الشيخ الشهاب أحمد بن حجر.

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

واما من نشأ بين المسلمين من أهل القرى والأمصار، وتفكر في ملكوت السماوات والأرض آناء الليل وأطراف النهار، فليس بمقلد. جعلنا الله من المتفكرين الذين بذلوا مهجتهم للدين.

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين وصلى الله على سيدنا محمد وآله الطيبين الطاهرين.

له سووچێکیەوە نووسراوە:

هذه الرسالة الكائنة في مسألة التقليد من مؤلفات محمد بن يوسف بن عبدالرحمن، ومكتوباته ومملكاته.

مۆرێک کە ناخوێنرێتەوە.

دانراوەکە بەشێکە لە دەستخەتێک کە چەند دانراوی دیکەی لەخۆ گرتووە -کاتی خۆی!- بەڵام دەستی چەپەڵی تەماعبازی قاچاغچیی و بازرگانیکەر بەدەستخەتەوە شیرازەی پساندووە و پارچە - پارچەی کردووە.

دانەرەکەی بەکورد دەزانین، بەڵام جارێ بەڵگەیەکی ئەوتۆمان بەدەستەوە نییە.

## شەرحی (اسماء الله الحسنى)

### ٣٦٦

دانراوی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری زێباریی

سەرەتاکەی:

«أما بعد: فإن أنفع المطالب حالاً ومآلاً وأكمل المناصب مرتبة وجلالاً، هو عد أسمائه صباحاً ومساء، ومعرفة معانيها يقيناً ووفاء، والعمل بها وجوباً وأداء؛ اذ يحتوي على المعارف الدينية، والمعالم اليقينية، ويدور حولها بالسعادة العظمى، والكرامة الكبرى في الآخرة والأولى، التي أشار اليها سيدنا -صلى الله عليه وسلم- بقوله: إن لله تسعة وتسعين اسماً من أحصاها دخل الجنة. وقد رمز الى شرحها من أيده الله بالسلطنة العظمى والخلافة الكبرى، وجعل له لسان صدق في الآخرين، ورفع مكانه يوم الدين، سلالة عترة العباس الطاهرين. بهرام بن زبيرخان...»

کۆتاییەکەی:

«تمت الرسالة المؤلفة في أسماء الله الحسنى من تصنيف مولانا ملا ابوبكر الزيباري الهمدلي. في قرية قارقارقا، قرية من ناحية دوستكي قريب من قصبة

دهوك مقدار ساعة واحدة، في يوم العشرين من شهر رمضان النبيل في سنة ١٣٣٩ من الهجرة النبوية المصطفوية على هاجرها أفضل الصلاة والسلام».

نووسەرەوەکەی ناوی خۆی نەنووسیوە.

دەربارەی مامۆستای زێباریی و ڕەوتی ژیانی شتێکمان لە دەستدا نییە، ئەوەندە هەیە بەبۆنەی ئەوەوە کتێبەکەی بۆ بارامی کوڕی زوبەیر خان داناوە و بارامیش ساڵی ١١٨٢ک کۆچی دوایی کردووە دەزانین ئەم مامۆستا لە پێش ئەو مێژووەدا لە ژیاندا بووە.

بەژمارە ٢٩٤٣٧ د.ع پارێزراوە

## المقصورة

## ٣٦٧

تأليف محمد سعيد السردري

سەرەتاکەی:

قال محمد السعيد السردري
وهو الغريب العاجز بالعسكري
وهو في الأصل جوانرودي وطن
لكنه في الحال بالسقز سكن
وما من الحروف جاء بدلاً
أنصت يوم جد طاه زلا
وتبديل الهمزة من الف و يا
والواو والعين وها غين و خا

کۆتاییەکەی:

واللام من ضاد ونون تبدل
كالطجع واملال ايضاً تقبل

قد تمت النسخة المقصورة بعون الملك الوهاب بيد أحقر الطلاب محمد الهرتلي المسمى بابدال ١٣٥٩.

دانراوەکە ٢٩ بەیتە. بەژمارە ١٨٣٩٣ د.ع پارێزراوە.

## چەند عارف حیکمەت هەن؟

### ٣٦٨

١- عارف الملقب بحكمت المشهور بعارب ابن أمين عثمان النعلبند. ناسخ رسالة الآداب للقاضي عضدالدين. في سنه ١٣٠٣هـ. دەستخەتی ژمارە ١/١٣٩٧٥ د.ع.

٢- هەر ئەم مامۆستایە ساڵی ١٣٠٥ لە سلێمانی کتێبێکی نووسیوەتەوە، لە کۆتاییەکەیەوە حاشیەیەکی لە (صرف العناية)ی بێتووشی وەرگرتووە و لە کۆتایی حاشیەکەوە نووسیویە:

راقمه: عارف حكمت المشهور بعارب بن أمين عثمان من أهل السليمانية في سنة ١٣٠٥ في مسجد الشيخ عبدالله شيخ أحمد أربيلي غفر الله لنا ولوالدينا ولجميع الطالبين آمين ٢٣ محرم.

لەم دەستخەتەدا بەیتێکی هەیە دەڵێ:

وتی: حیکمەت لەبەرچی وا پەشێوی؟
وتم: قـــوربان طەبیـــبی حـــاڵزانی!

ئەمە لە دەستخەتی ٤٩٢٦ی د.ع، دایە.

٣- محەمەد عارف حیکمەت بەرزنجیمان هەیە لە کەربەلا لێپرسراو بووە، لەوێ لەتەک محەمەد سەعیدی ڕەئیسی مەحکەمەی جەزا و، محەمەد طاهای نەقشبەندیی مودەڕیس لە کەربەلا و، عەبدوڕەحمانی خەرپووتیی واعیظ لە هەمان شوێن -هەر چواریان- (تقريظ) بەباڵابڕینییان لەسەر کتێبی (مجامع المعاني في حكم السبع المثاني) دانراوی حسەین فەوزی ئەفەندیی نووسیوە.

ئینشا و نووسینەکەی مامۆستای بەرزنجیی لە هی گشتیان بەرزترە و خەتیشی لە خەتیان خۆشترە. بەڵام بەداخەوە کەسیان ساڵیان نەنووسیوە.

٤- لە دەستخەتی ١٢٤٦٠دا وێنەی کۆمەڵێک سەرەک وڵاتان و فەرماندە و قوماندارانی عوثمانیی و شاعیر و ئەدیبانی هەیە، یەکێکیان ناوی (هرسكلی عارف حكمت بگ) جا ئەبێ ئەمیش هەر هەوبێت؟

٥- لە دەستخەتی ١١٥١٣ش باسی کۆچی دوایی عصمت زادە عارف حکمەت لە ساڵی ١٢٣٥ک دا هەیە.

٦- عارف حكمة الآلوسى ٦ رجب ١٣١١ قائمقام رواندز دەستخەتی ١٩٤٦ د.ع.
٧- عارف حیكمەت شێخ الاسلام بووە لە ئەستەمبووڵ و شێخ طاهای سنەوی و... نامەیان بۆ نووسیون و ئەبو ثەنای ئالووسیی كتێبێكی لە ستایشیدا نووسیوە.

## قاعدة في توريث ذوي الأرحام

### ٣٦٩

دانراوی مەولانا حسەینی (شیبكی).

سەرەتاكەی:

هذه قاعدة في توريث ذوي الأرحام. ذو الرحم كل قريب ليس بذى فرض.

كۆتاییەكەی:

وثلاثة لعم الميت  من الام والعمل معلوم.
مولانا حسين شيبكي  رحمه الله وايانا ببركته.

دەستخەتەكە شەمسەدینی كوڕی شێخ عەبدوڵڵا... لە حوكومەتی خان ئەحمەد سوڵتاندا لە گوندی بەرۆژە نووسیویەتیەوە، كاتێ بەتەمای سەفەركردن بۆ ڕۆم بووە.

دەستێكی چەپەڵ دوای شێخ عەبدوڵڵا هەندێ زانیاریی سڕیوەتەوە!

دەستخەتەكە لە كتێبخانەی بنەماڵەی شێخ یوسفی خاوەنی مزگەوتی شێخ یوسفی سلێمانیەوە هاتووە و، لە دەستخەتەكە وەردەگیرێ كە ئەم شێخ یوسفە لە شاری سنەوە هاتووە بۆ سلێمانی.

دەستخەتەكە كۆمەڵێ دانراوی تێدایە، حاشیەی كۆمەڵێ لە مامۆستایانی كوردی بەسەرەوەیە، لەوانە مەولانا ئیلیاسی گۆرانیی، ئیبراهیمی كوڕی ڕەسووڵی زەكیی.

بەژمارە ٥٥٥٠/٥ د.ع پارێزراوە.

## مەلا عەبدوڵڵای شێخ قادر ئەباعوبەیدیی

### ۳۷۰

ئەم مامۆستا خەڵکی گوندی ئەباعوبەیدە (عەبابەیلێ) بووە، ساڵی ١٢٩٥ لە دایک بووە، هەر لەو گوندەدا پەروەردە بووە و، لەوێ خوێندنی تەواوکردووە و بووە بەمامۆستایەکی پایەبەرز. لەتەک ئەوەیشدا (تمسک)ی بەشێخ عومەری ضیائەدین کردووە و، بووە بەیەکێک لە پەیڕەوانی ڕێبازی نەقشبەندیی و، لە مزگەوتی عەبابەیلێدا پێشنوێژیی بۆ موسوڵمانان کردووە و ڕێنومایی کردوون و، دەرسیشی بەفەقێیان گوتووە و، گەلێ مامۆستای پێگەیاندووە. لەسەر ئەم کارانەی هیچی لە کەس وەرنەگرتووە و، لەسەر کۆششی خۆی ژیاوە و، تەنانەت ئەوەندە پشت بەخودا بەستوو بووە بەخۆی گوتووە (عبدالله الإلهی). زیاد لەمانەیش پیاوێکی کۆمەڵایەتیی ڕەوشت بەرز بووە و، کاروبار و تەنگوچەڵەمەی خەڵکی ناوچەکە لەسەر دەستی ئەودا چارەسەر کراوە.

لە پەنای ئەمانەیشدا کتێبی داناوە و بەمەیش خزمەتی فەقێیانی کردووە و بەو شوێنەوارانەی ناوی خۆی پاراستووە و، دەربارەی دانراوەکانیشی ئەم زانراوانەمان دەست کەوتووە:

سەرەتای ڕیسالەی بەیانی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای عەبابەیلێی -ئەبا عوبەیدەیی-

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمدلله حمداً یوافي نعمه ویکافيء مزیده، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شریك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله. اللهم صل علی سیدنا محمد طب القلوب ودوائها، وعافیة الابدان وشفائها، ونور الأبصار وضیائها. وعلی آله وأصحابه أهل الصفا والوفا.

وبعد: فهذی رسالة في البیان، فهو علم بأنه به أحوال اللفظ الاسنادي...

کۆتاییەکەی:

والثانیة بما یحتمل فتعم حقیقة کیف وأغلب صیغ الطلاق إخبار أستعمل انشاءاً، فهما الصریح والظاهر في الاصول الذین یعمان.

تمت الکتاب بعون الملك الوهاب، المسمی باستعارة الملا عبدالله الابا عبیدي.

رحمه الله، بيد أحقر الطلاب السيد محمد السرگلوي في سليماني في شهر ربيع الآخر في مسجد الشيخ عبدالكريم. ١٣٤١هـ.

دەستخەتی (٥/٢٤٢٠٣)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و، ئاوا کۆتایی بەنووسینەوەکەی هاتووە:

«تمت الرسالة الوضعية للعالم الفاضل الملا عبدالله العبيدي. بيد العبد الأثيم ذي العصيان، محمد كريم[1] ابن محمد المريواني، يوم الثلاثاء نصف شهر شعبان. بخانقاه حضرة العلاء العثماني، في حضور الفاضل العالم السيد محمد الگيزملي. اللهم اغفر لنا ولوالدينا بحرمة الرسول الاكرم. صل على محمد ١٣٣٨هـ.

ئەم کتێبە نوسخەیەکی دیشی هەیە بەژمارە ٤١٣٤٧ پارێزراوە! محەمەد ئەباعوبەیدیی نووسیویەتیەوە.

## دەستخەتێک هەندێک فەتاوا و بابەتی هەمەجۆری تێدایە

٣٧١

٢١٠٩٤

لە سەرەتاوە نامیلکەی (فتوح الخلاق فيما لم يقع وما وقع من أحكام الطلاق)ی دانراوی محەمەدی کوڕی حسەینی کوڕی عەقلی شافیعیی تێدایە.

دوای ئەو فەتاوای چەند مامۆستایەکی کوردی تێدایە، لەوانە:

١- حاجی مەلا محەمەدی کوڕی ئەسعەدی جەلیی.

٢- شێخ لەطیفی بێدەریی.

٣- حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادە.

٤- مەلا محەمەدی خەتێ.

٥- ئیبراهیمی کوڕی زەکی.

٦- مەلا یەحیای مزووریی...

دەستخەتەکە بەخەتی محەمەد ساڵحی مەرگەییە، ساڵی ١٣٢٢ نووسیویەتیەوە.

***

(١) گومان بۆ ئەوە دەچێ ئەم نووسەرەوە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بێت.

## حاشية على نخبة الفكر لملا ابراهيم الكردي الشافعي

٣٧٢

سەرەتاکەی:

قوله: الحمدلله: الحمد هو الوصف بالجميل على الجميل الأختياري على جهة التعظيم والتبجيل. واللام فيه اما للجنس...

کۆتاییەکەی:

والمنكر هو ما ينكره الثقات وأعرض عليهم، وكذ الباقي والله أعلم بالصواب، واليه المرجع والمآب، تمت الحاشية المباركة على يد الحقير الفقير سليمان السلامي ابن يونس السلامي غفر الله له وذلك في سنة ١٢٣٥هـ.

دەربارەی ئەم مامۆستایش شتێکی ئەوتۆمان لە دەستدا نییە و هیچ لە ژیانی نازانین، مامۆستا مەلا ئیبراهیمی (کیستەیی)مان هەیە، کە ماوەیەک لەمەوبەر -کە نازانین کەی بووە- لە ناوچەی بادینان ژیاوە و، هەر ئەم مامۆستایش بەوە دەزانم کە نووسەرەوەی کەشکۆڵی ئیبراهیمی کوڕی سەیید ئەحمەد بێت کە لە بەرگی سێیەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورددا باسیم نووسیوە[1]. بەڵام ئەمەیش هەر گومانە و دەبێ چاوەڕوانی زانیاریی زیاتر بین.

بەڵام تا ئەو کاتە بەسەر ئەوەیشدا ناڕۆم کە مامۆستا مەلا ئیبراهیمی عیمادیشمان هەیە و، ئەویش دانراوی هەیە و هاوچەرخی بارامی کوڕی زوبەیرخانی میری عیمادییە بووە و، کتێبیشی پێشکەشی ئەو میرە کردووە[2].

هەروەها لە هەمان بەرگی ئەم کتێبەدا ناوی مامۆستا مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا ئەسکەندەریش هاتووە کە مەلا و خوێندەوار و نووسەرەوە بووە و، شوێنەواری لێ بەجێماوە، بەڵام لەوە ناچێت توانای کتێب دانانی بووبێت[3].

بەژمارە ٢٩٣٨٦/ د.ع پارێزراوە.

***

(١) بڕوانە الاكراد فی بهدينان ص: ١٩١، هەروەها مێژووی زانایان بەرگی ١٠٨/٣.

(٢) بڕوانە: بەرگی سێیەمی ئەم کتێبە ل: ٢٣٢.

(٣) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل: ١٤٨.

## مامۆستایەکی عەبدالانیی دی

### ٣٧٣

تا ئێستە سێ جار باسی مامۆستای عەبدالانیم کردووە، دووانیان لە بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا لە لاپەڕەکانی ١٣٠ و ٣١١دا باسی مامۆستا مەلا حەسەنی کوڕی عەلی عەبدالانیم کرد و، لە ئەڵقەی (٢٠٠)ی بەرەو پرۆژەی دەستخەتەکانیشدا باسی مامۆستا مەلا محەمەدی کوڕی ڕەسووڵی عەبدالانیم کرد، بەڵام وا دیارە مامۆستایانی عەبدالانیی لەمانەیش زیاترن و، بەیارمەتیی خودا ناو و بەسەرهاتی زیاتریان لێ دەخەینە سەر لاپەڕەکانی مێژوو.

هەر لە (دار العراق للمخطوطات)دا لە دەستخەتی ژمارە ٢٠١٩٨دا شوێنەواری مامۆستایەکی دیی عەبدالانیم دۆزییەوە، بەگوێرەی شوێنەوارەکەی -دیارە- لە سەردەمی خۆیدا کەڵەمەلا و مەلا چاکی چەرخی خۆی بووە، بەڵام بەداخەوە مێژووی ژیان و بەسەرهات و بەرهەمەکانی ئەمیش وەک دەیان و سەدان مامۆستای مەزنمان تێدا چووە و بێ ناوونیشان ماوەتەوە. ئەم شوێنەوارەی مامۆستامان پارچەیەک شیعریەتی لە سەردانیدا بۆ قاهیرە -کە نازانین کەی بووە و بۆ چی چووە- زیارەتی گۆڕی پیرۆزی ئیمامی شافیعیی کردووە و، لەسەر گڵکۆکەی پارچەیەک شیعری بەعەرەبی وتووە. دوور نییە چوونی بۆ وڵاتی میصر بۆ مەلایەتیی و دەرس گوتنەوە لە ئەزهەردا بووبێت.

مامۆستامان ناوی عەبدولقادری کوڕی شێخ عەبدوڵڵای کوڕی شێخ ئیسماعیلی عەبدالانیە. ئەمەیش شوێنەوارەکەیەتی:

٢٠١٩٨/٢ د.ع

«ولما زرت الإمام الشافعي -رضى الله عنه- وهو في مصر بمقبرة تسمى المقطم في مقبرة القرشيين، بين قبور بن عبدالحكيم(!) أنشأت فيه هذه الأبيات، منادياً له نداء العبد لسيده قائلاً:

يا إمـام الناس طرّاً ذا اجتهاد قـاطع!
شافعاً أو شافعياً شاع بابن الشافعي
يا ابن ادريس وتدريس وذا العلم النفيس
مـفتي الاسلام عـام العاشر والرابع؛

منذ أمّ العلم حقاً عن جديد أو قديم
من به اقتدى يحيى النواوي والرافعي
أنت قطب ثم فرد ثم غوث للوري
ما لغوث أن يغيث المستغيث الواقع
عمدة أو قدوة أو زهدة أو زبدة
نافع أو رافع أو جامع عن شارع
يا لحبر قعر بحرٍ جبرٍ كسرٍ للأنام
هل ترى فيما طرى مما جرى من ضائع؟
مثل هذا الملجي العبدُ الكسير العاجز
ما لعبد بعد جهد غير ودٍّ هامع

من عين رغبة الزوار في الارتحال لزيارة الأبرار. تأليف وحيد عصره وفريد دهره الشيخ عدالقادر بن الشيخ عبدالله بن الشيخ اسماعيل العبدالاني الكردي الشافعي العلواني القادري -قدس الله اسرارهم-.

دەستخەتێکی کۆنە مێژووی پێوە نییە... کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڕحمانی کوڕی خەلیلی کوڕی ئیدریسی شافیعی لە دیاربەکر نووسیویەتیەوە.

***

**حاشیەی مەلا ئەحمەدی عومەر گونبەدیی بەسەر (حكمة العين)ی (میرزا جان)ەوە**

٣٧٤

ئەم مامۆستا ناوی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیمی عومەر گونبەدیی بووە و، فەقێی مامۆستا مەلا ئەحمەدی کوڕی حەیدەر بووە و، کتێبەکەی پێشکەش کردووە بە داود پاشای والیی بەغدا. مامۆستای عومەر گونبەدیی ساڵی ١٢٣٩ لە شاری بەغدا لە دانانی کتێبەکەی بووەتەوە. دەستخەتەکە بەخەتی عەبدولغەفووری کوڕی عەبدولغەنییە، ساڵی ١٢٤٢ لەبەر نوسخەی دەستخەتی دانەرەکەی نووسیویەتیەوە. نوسخەکە بۆ مامۆستا مەلا عەبدوڕەحمانی ڕۆژبەیانیی نووسراوەتەوە.

بەژمارە ١٢٢٠١ی ئەوقافی بەغدا پارێزراوە.

***

٢٦٧٢٢ د.ع

## ئەم دەستخەتە نامیلکەیەکی بچکۆلەیە لە عەقائیددا وا پێدەچێ بەخەتی دانەرەکەی بێت

٣٧٥

سەرەتاکەی ئاوایە:

«الحمدلله الذي لم يمكن قبل إلا والقبل هو، ولم بعد وحدانيته بعد الا والبعد هو، كان ولا بعد ولا قبل ولا فوق ولا تحت، ولا قرب ولا بعد، ولا اين ولا حين ولا أوان ولا وقت. ولا زمان ولا كون ولا مكان وهو الآن كما كان، فهو الواحد بلا وحدانية وهو الفرد بلا فردانية.

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

وكتب هذه الأسطر العبد الفقير الحقير علي بن يوسف بن حمد (كذا) ابن أمير عمر ابن أمير طورخان غفرالله الغفران، في شهر رجب المرجب في يوم أحدى وعشرون الواقع في يوم الجمعة سنة أربع وسبعين وتسع ماية في شهر ترخالة (ومحلي!) حاج أومور.

وصلى الله على سيدنا محمد وآله وعلى سيدي الأولين والآخرين الطيبين الطاهرين.

دەستخەتەکە هەشت لاپەڕەیە بەخەتێکی وردی جوان نووسراوەتەوە.

خاوەنی ئەم دانراوە بەکورد دەزانم، بەڵام لەم دانراوەی زیاترمان لە دەستدا نییە و، ئەمەیش هەر ئەم دانەی دیارە و، ناوی دانراوەکەیش نەنووسراوە. بۆیە جارێ بەچاوەڕوانیی دەبێ بمێنینەوە.

## حاشیەی عەبدوللەتیف

٣٧٦

ه ٢٦٦٩٢ د.ع

حاشیەیەکە بەناوی (عبداللطیف) لەوە دەچێت دانراوی مامۆستایەکی خۆمان بێت، بەڵام نوسخەی دیبیم نەبینی تا بەتەواویی بۆم دەربکەوێت چۆنە و چییە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

«قوله: سلك طريق العمل... آه اعلم أن من دأب المصنفين...

کۆتاییەکەی:

«... أن تكون الثابتة في صدر الكلام بمعنى الموجود في الخارج سواء تعددت فيها الأكوان وتجددت عليها الأعصار أولا، فحينئذ يصدق على ما كان في آن الحدث كما لايخفى على المتأمل الذكي.

تمت الكتاب الموسوم بعبداللطيف على يد العبد الحقير الضعيف، اسماعيل بن رجب المحتاجان الى عفو الملك اللطيف، اللهم اغفر لنا. وقد وقع الفراغ من تنميق هذا الكتاب يوم الجمعة في بلدة كو وقت الاستواء سنة الف ومائة وعشرين من هجرة النبي، مات في هذه السنة ابراهيم بگ بن محمد بگ.»

وایش پێدەچێت ئەم حاشیە بێت بەسەر (الوغ بیک)ەوە کە لە پێش ئەم دانراوەوە بەهەمان ژمارە لە هەمان دەستخەتدا پارێزراوە.

دواتر ئەم نوسخانەی خوارەوەیشیم دۆزییەوە:

دەستخەتی ٣/٢٣٦٢ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە ساڵی ١٢٧١ نووسراوەتەوە، ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە. (٥٤) لاپەڕەیە. هەروەها دەستخەتی ٢/٢٣٣٧٤ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە.

ئەم نوسخە ساڵی ١٠٩٦ ئەبوبەکری کوڕی مەحموودی زێباریی نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ١٣٩٤٧ش نوسخەیەکی دیبەتی حسەینی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی یوسفی کوڕی ئیبراهیمی دەشتیی ساڵی ١٢٧٥ لە مزگەوتی حەزرەتی دانیال لە خزمەتی مامۆستا ئوەیسی عەسکەریدا نووسیویەتیەوە.

## مامۆستا مەلا عەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەسووڵ

### ٣٧٧

ئەم مامۆستا دانراوێکی هەیە بەناوی حاشیە بەسەر حاشیەی (قەرەباغی)یەوە، بەڵام - بەداخەوە- دەستی چەپەڵی بازرگانیکەر بەدەستخەتانەوە ئەم دانراوەی لە خوشک و براکانی دابڕیوە و، -دیارە- کاتی خۆی دانراوەکە لەناو چەند دانراوێکدا لە یەک بەرگدا بووە، ئەو زەلامە بەتەماعی پارە - پارە پارەی کردووە و ئەم دانراوە لاپەڕەیەکی کەوتوەتە بەر دانراوێکی مامۆستا (زید العابدین)ی گۆرانیی کە ماوەیەک لە ساڵی ١٠٦٥ک دا موفتیی بەغدا بووە. ئیتر دوای ئەو لاپەڕە نازانین چی بەسەر هاتووە و بەر چی کەوتووە.

ئەوەندە لەم لاپەڕەوە دەردەکەوێت ئەوەیە کە ئەم مامۆستا دانراوەکەی لەسەر داوای چەند دۆستێکی زیرەکی داناوە و، دوایی پێشکەشی کردووە بەمیرێکی کوردی سەردەمی خۆی، بەڵام بەکۆتایی هاتنی ئەو لاپەڕە باسەکە بە ناتەواویی دەمێنێتەوە و نازانین ئەو میرە کوردە کێیە و لە چ سەردەمێکدا بووە.

دەستخەتەکە لە (دار العراق للمخطوطات)دا بەژمارە (١٦٣٣١) پارێزراوە و هیوادارم لە گەشت و گەڕانمدا سۆراخی تەواوی ئەم دانراوە بکەمەوە.

دەستخەتەکە مێژووی ساڵی ١٠٦٥ کۆچی پێوەیە بەڵام ڕوون نییە مێژووی نووسینەوەی کتێبەکەیە، یان مێژووی سەردەمی موفتێتیی مامۆستای گۆرانییە، یان هەردووکیان!

## ترجمة طب الرحمة

### ٣٧٨

١٩٣١٩/ د.ع

ئەم دەستخەتە کتێبێکی فارسیی گەورەی تێدایە سەرەتا و کۆتایی نەماوە، لە سەرەتاوە دووپەڕەی تازە لە کاغەزی خەتداردا بەخەتێکی دی نووسراوە.

لەم دووپەڕەدا باسی ئەوە کراوە کە ئەحمەدی کوڕی مەلا سلێمانی کوڕی صۆفی چراغی کوڕی حاجی سلێمانی (الفاو)ی [ڕەنگە الفاوجی - پاوەیی بێت] شافیعیی نیشتەجێی پشتکۆ کتێبی (طب الرحمة)ی ئیمامی غەزالیی لە عەرەبییەوە کردووە بەکوردیی و، کردوویەتی بەدیاریی بۆ میر... لێرەدا پەڕە تەواوکراوەکەیش ناتەواو دیارە و نازانین میرەکە

کتێبە. کتێبە فارسیەکە بەخەتێکی جوان نووسراوەتەوە و دەستخەتێکی کۆنە و ناوی گژوگیا و ئاژەڵ و جانەوەر و... شتی تێدایە بەفارسی لەسەریان نووسراوە بۆچی دەبن و دەشێن. دوای ئەمانە جوغرافیای گەلێ شوێنی عێراق و ئێرانی تێدایە و باسی قیبلە و ئەستێرەناسیشی تێدایە. ئیتر نازانم ئەم تەواوکردنە لێرەدا پێوەندیی بەئەصڵی دەستخەتەکەوە هەیە یان نا؟

مێژووی نووسینەوە و ناوی نووسەرەوەی دیار نییە. ئەوەی ماوە (١٥٠) لاپەڕە زیاتر دەبێت.

***

## شەرحی قەسیدەی بوردیە

### ٣٧٩

٢٢٤٥٠ د.ع دانراوی فەخرەدینی کوڕی ئەبو ئەحمەدی کوڕی ئەبوبەکر.

سەرەتاکەی:

«وبعد: فيقول أقل عباد الله تعالى فخرالدين بن ابي أحمد بن ابي بكر غفر الله لهم: لما كانت القصيدة الموسومة بالكواكب الدرية المسماة بالبردة النبوية، المنسوبة الى العالم الامام العلامة شرف الملة والدين ابي عبدالله محمد بن سعيد الدلاصي ثم المصري...»

کۆتاییەکەی:

«ومفعوله العيس وفاعله حادي العيس، وبالنغم متعلق باطرب. قد وقع الفراغ من تسويد هذه النسخة الميمونة الشريفة الموسومة بشرح قصيدة البردة، على يد أضعف العباد وراجي الى رحمة الله تعالى مولانا محمود ابن ملا يوسف غفرالله لهما، تم في يوم الأثنين في وقت الضحى في شهر رجب، سنة ١٠٩٩».

دەستخەتەکە لە (دار العراق للمخطوطات)دا بە (٢٢٤٥٠) پارێزراوە، سەرەتا و کۆتایی ماوە، بەڵام تەڕبووە و شوێنەواری ئاو و دڵۆپەی پێوەیە و، تەرجەمەیەکی فارسی قەسیدەکەیشی بە شیعر بەسەرەوەیە. شیعر بە شیعر لەتەکیدا نووسراوە.

شایانی باسە دوو مامۆستای دیکەیشمان شەرحیان بەسەر ئەم قەسیدەوە هەیە.

## حاشیەی عەبدوڕەحمانی کوڕی خضری گەناوی ڕازانیی (کلیرمانی)

### ٣٨٠

ئەم حاشیە یەک پەڕەی لە کۆتایی دەستخەتی (٢٠٣٥٠)یە و، نازانین کاتی خۆی چەند بووە و چیتری بەدواوە بووە یان نا؟ دەستخەتەکە ناتەواوە و وا دیارە پارچەی دەستخەتێکی گەورە بووبێت و لێی جیاکرابێتەوە. ئەوەندەی لێ دەزانین کە بەخەتی دانەرەکەیەتی.

دانەرەکەیشی سالّی نووسینەوەی دەستخەتەکە کە سالّی (١١٩٣)یە لە ژیاندا بووە. ئەمەیش کەمێک لە سەرەتای حاشیەکە:

«وبعد: فيقول العبد الفقير الى الله الهادي الغني عبدالرحمن بن خضر بن حسن الگناوي الرازاني: لما كانت الرسالة التي ألفها المحقق الدواني في كلمة التوحيد محتوية على كنوز المعاني، بالغة في الايجاز وتشييد المباني، الى حد لايمكن الزيادة عليها لمتحري التحقيق والتدقيق... أردت أن أضيف اليها ما عثرت عليها وفزت بها، من الفوائد الحقيقة، والفرائد الخليقة، باغتنامها لمن فارق التقليد، وجبل طبعه على الإنصاف والتفريق، بين اللباب والقشر الرقيق، وبين النخالة والدقيق...»

ماوەیەک دوای نووسینی ئەم وتارە ڕێکەم لە دەستخەتی ژمارە (٢٠٣٤٤ د.ع) کەوت کە دەستخەتێکی گەورەیە و ١٦ دانراوی جۆراوجۆری تێدایە، سەرجەمی ئەم دەستخەتە بەقەڵەمی ئەم مامۆستای گەناوییە نووسراوەتەوە و، بەپێی ئەو دەستخەتە ئەم مامۆستا سالّی ١١٥١ لە ژیاندا بووە.

ئەم دەستخەتەی مامۆستای گەناویی پڕبەتی لە زانیاریی و بابەتی بەسوود و یەکێکە لە دەستخەتە کەموێنەکانی مامۆستایانی کورد.

***

٢/١٠٩٠٥

## البوارق الالهامية

٣٨١

لەسەری نووسراوە:

رسالة ابراهيم الكردي المسماة بالبوارق الالهامية في النفس وسعادتها وشقائها، للشيخ برهان الدين ابي محمد ابراهيم الگوراني الشهرزوري السهراني المتوفي ١٨ جمادي الأولى سنة ١١٠١هـ ١٦٩٠م

بەڵام لە کۆتاییەوە نووسراوە:

«وكان خلاصة جوابهم اذا سألوه عما لم يقتبسوه من مشكاة النبوة: لانعلم. وليكن هذا آخر ما أردت ذكره في هذه الأوراق. والحمدلله والمنة، والصلاة والسلام على آله الطيبين الطاهرين. وكان الفراغ من تأليفه في سلخ رمضان المبارك سنة تسع عشر وسبعمائة ببلدة سنجار، صانها الله وسائر بلاد الاسلام عن الآفات، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم»

لەمەوە دەردەکەوێ کە دانراوی مامۆستای شارانیی نییە و، دانراوی مامۆستایەکی سنجارییە، بەڵام لەمە زیاتر هیچمان دەربارەی لە دەستدا نییە، سەرەتاکەیشی ئاوایە:

«بجلالك اللهم ياذا المجد الأسنى نفتتح بالتقديس والتمجيد. وبسبحات جمالك المتفرد بخصائص الأسماء الحسنى، نخص بانواع الشكر وأصناف التحميد.»

دەستخەتەکە مێژوو و ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە و، بەیەکێک لە دەستخەتە نایاب و زەرکەفتکراوەکان دادەنرێت، دوو کتێبی تێدایە، کتێبی یەکەم بەدانراوی (صفي الدين المدني) دراوەتە قەڵەم. بەڵام بەگوێرەی کۆتاییەکەی دەبێ دانراوی مامۆستای شارانیی بێت چونکە وەک گەلێ جار مامۆستای شارانیی دەنووسێت لە کۆتاییەکەیدا نووسراوە:

«تم تسويده ضحى يوم الأثنين الثاني والعشرين من ذي الحجة من سنة ثمان وثمانين وألف بمنزلي بظاهر المدينة المنورة على خير ساكنها أفضل الصلاة والسلام - عدد خلق الله بدوام الملك العلام.»

***

## تەعلیقاتی ئەبوبەکری کوڕی ئەحمەدی سۆرانیی بەسەر هیدایە و حاشیەی (لاری)یەوە

٣٨٢

سەرەتاکەی:

وبعد: فيقول أفقر الخلق الى الله الصمد الغني الباري، ابوبكر بن أحمد السهراني، تغمدهما العلي العالي: لما كنت برهة من الزمان، متحركاً في البلدان، ودورتني هموم الدوران، وتلاعب علي الملوان، وترامي! الورطة أحزاب الأحزان، بحيث قد يفوقني بحار الهموم وغشاوة النقصان...

دوای پێشەکیەکی درێژ پێشکەشی ئەکات بە (ابو اسحاق اسماعيل شيخ الاسلام).
کتێبەکەی لە (ادرنه) ساڵی ١١٢٨هـ تەواوکردووە. سێیەم شەوی (الليالي التشريق) واتە جەژنی قوربان.
بەژمارە ٤٢٤٤٢/ د.ع پارێزراوە.

***

## حاشیەی محەمەدی کوڕی عەباسی کوردی بەسەر حاشیەی لاریی بەسەر شەرحی هیدایەوە

٣٨٣

سەرەتاکەی:

«أما بعد فيقول الفقير الى لطف الله السرمدي محمد بن عباسي الكردي منهم برادوستي الانتساب، الناشي في المحمودي النامي بالخوشاب:

إن الحواشي اللارية الانصارية على شرح الهداية لما كانت عاصياتها في الغاية، ومعضلاتها في النهاية، بإطباق مشاهير العلماء، واتفاق جماهير الفضلاء، لما في بعض مواضعها من الاغماض والإعضال، بل كثير مواقعها من الاغلاق والاجمال...»

کۆتایی نەماوە و بازرگانیکەران بەدەستخەتەوە بەهەڵە هاتوون کۆتایی دیباجەی حاشیەی (ابن الحجر)ی ناسراو بە (ابن القاسم)یان پێوە لکاندووە!
١/٢١٠٤٧ د.ع پارێزراوە

***

## حاشیەی کەوانە دۆڵیی

٣٨٤

سەرەتای دەستخەتی ١٩٢٥١ د.ع دانراوێکە لەسەری نووسراوە:

من تعليقات الكوانه دولي على القاضي وبه الاستعانة.

دوای ئەمە بێ پێشەکیی و قسەوباس دەڵێت:

«قوله: اعلم ان الحكمة علم بأحوال أعيان الموجودات على ما هي عليه في نفس الأمر بقدر الطاقة البشرية... العلم هنا تصديقي بقرينة تعلقه بالأحوال التي هي محمولات في المسائل على الموجودات الخارجية.»

ئەم دانراوە ناتەواوە و ئەوەی ماوە ١٦ لاپەڕەیە.

دوای پشکنین و گەڕانێکی زۆر بەشێکی دیکەی کۆتاییەکەیم دۆزییەوە لەناو کۆمەڵە دەستخەتی (١٩٢٤٣/أ)دا و دەرکەوت هەردوو کۆمەڵەکە کاتی خۆی کاک ...... هێناونی بۆ (دار العراق) و خۆیان شپرزە و پارچە - پارچە بوون و ئەمیش -بەنەزانیی- چۆنی بەلاوە باش بووە کۆی کردوونەتەوە و هەر کۆمەڵێکیانی لە بەرگێک هاویشتووە. کۆتایی ئەم بەشەی دوایی ئاوایە:

«قد وقع الفراغ من تسويد الدرر المنسوبة الى من شرح الله صدره للحكمة والكلام، وأوضح له الذرات بنور سر الالهام، سلطان العلماء المتأخرين، قرة أعيان عيون المحققين، برهان المطالب والمآرب، سلطنة المشارق والمغارب، وهاب عظام النعم والدقائق، كوانه دولي المشتهر بين الخلايق، ادام الله ظله على الطالبين. كي وصلوا بحقيقة الدقائق واليقين. على يد من هو من يد الهجران أنين، المطروح على مزبلة حجرة خانقين، المفتخر بتلثيم غبار تحت قدم الطالبين، وهو ابن طيب الملقب ببهاءالدين. تعلم فرحه بماذا ولماذا وعلى ماذا ياذا القوة المتين، أنت المقوم لما في ضمير الطالبين. قوّم مآربنا يا أرحم الراحمين ويا أكرم الأكرمين...»

لەمە زیاتر هیچم لە دەستخەتەکان وەرنەگرت.

دوایی جارێکی دی گەڕامەوە سەر ئەو زانیاریيانەی کۆمکردوونەتەوە، بینیم مامۆستایەکمان هەیە بەناوی محەمەد کوڕی حەسەنی کەوانە دۆڵی، کە دەستخەتی ژمارە: ٢٢٥١٨ی نووسیوەتەوە و بەم شێوە کۆتایی پێ هێناوە:

تمت الحاشية الواقعة على المصري، المنسوبة الى شيخ الشيوخ البرزنجي، شيخ حسن ألمعي، بعون الملك القوي، من يد الحزين الغريق في بحر الذنوب، محمد بن حسن الكوانه دولي، غفرالله لي وله ولمن دعانا بالخير، لأجل أخي الفاضل الامجد محمد ادام الله بركات أنفاسه علينا آمين.»

***

## تحفة الاماثل شرح الشامل للعوامل

### ٣٨٥

ئەم کتێبە دانراوی ئیبراهیمی کوڕی ئەبوبەکری کۆیی (صدیقی)یە، لەسەر (شامل العوامل)ی مامۆستا شێخ مەعرووفی نۆدێیی دایناوە و، سەرەتاکەی ئاوایە:

«وبعد: فيقول الفقير الى الله الغني ابراهيم بن ابي بكر الكويي الصديقي: هذا شرح لطيف وضعته على شامل العوامل، منظومة الشيخ الامام والحبر الهمام، السيد السند السيد محمد المعروف بمعروف، تغمده بألطافه الرؤوف. يحل ألفاظه ويبرز دقائقه، ويبين حقائقه، ويوضح مرامه، ويتمم مفاده، على سمط لطيف. ونمط طريف، من غير إطناب ممل، ولا ايجاز مخل، وسميته: (تحفة الاماثل في حل الفاظ شامل العوامل).

لەم دەرفەتەدا لەوەند زیاتر دەربارەی ئەم مامۆستا نازانین کە هاوچەرخی شێخ مەعرووفی نۆدێیی بووە و مێژووی دانانی کتێبەکەی ساڵی ١٢٦٠ک کە بەحسابی (جمل ولقد كمل تحفتي للطالبين)ی بۆ داناوە، واتە شەش ساڵ دوای کۆچی دوایی شێخ مەعرووف دانراوە.

دەستخەتەکەیش لە (دار العراق للمخطوطات)دا بەژمارە ١٩٩١٠ پارێزراوە.

هەروەها نوسخەیەکی ئەم دانراوەی مامۆستای کۆیی لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی سلێمانیدا بەژمارە ت/ مجاميع/ ٢١٢٥ - ٢١٢٨ هەیە[١].

***

(١) بڕوانە: فهرس مخطوطات مكتبة الأوقاف المركزية في السليمانية ج: ٤، ص: ٢٠٧.

## شەرحی ڕیسالەی وەضعی مەلا عەلی قەوشەجیی

٣٨٦

١٧٤٢٥ دانراوی ئەبوبەکری کوڕی مەحموودی کوڕی سواری کوردی، یا گەردیی.

ئەم مامۆستایش یەکێکە لەو زانایانەمان کە ناوی نەکەوتوەتە سەر لاپەڕەکانی مێژووی ناودارانی کورد و، لە سەرچاوەکانی بەردەستماندا هیچم دەربارەی نەخوێندوەتەوە و نازانین دانراوی دیکەی بووە یان نا و، نایشزانین چی بەسەرهاتووە؛ چونکە ئەم کتێبەی لە کاتی لاویی و تەمەنی هەرزەکاریی و کاتی فەقێتیدا داناوە و، خۆی دەڵێ: لە تەمەنی ٢٠ ساڵیدا ئەم کتێبەی داناوە. جا ئەمێک لەو تەمەنەدا کتێبی دانابێت و هەروا و زیاتریش لە خوێندەواریدا پێشکەوتبێت، دوور نییە بەرهەمی دیکەی زۆر بووبێت، بەڵام جارێ با بزانین لەمەولا چۆن دەبێت.

کتێبەکەی لە ساڵی ١١٠٣دا داناوە و ئەوکاتە بووە بە ٢٠ ساڵ، واتە لە دەوروبەری ساڵی ١٠٨٣دا لە دایک بووە.

خۆی دەڵێ: عەبدوللای کوڕی حەیدەر باپیری بووە، واتە لە بەرەی دایکییەوە.

دەستخەتەکەیش ساڵی ١١٢٥ بەدەستی محەمەدی کوڕی ئاقدەڵ نووسراوەتەوە لە کاتێکدا کە تەمەنی ٢٥ ساڵ بووە. ئەمەیش کەمێک لە سەرەتای کتێبەکە:

«اما بعد: فيقول الضعيف الأضعف، والنحيف الاعقف، أقل الانام، وقتام الأقدام، ابوبكر بن محمود بن سوار الكردي... شنامي: لما كنت من عواصف الحوادث متفيفاً...»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«... ما اشتعل في القلوب نار الفراق، وما اشتاق الى اللقاء عاشق مشتاق. سنة الف ومائة وثلاث حين ما شرع العمر في العشرين، في الجمعة الأخيرة من شهر رمضان، الذي يفتح فيه ابواب الفيض والرحمة والغفران. اللهم اغفر برحمتك لمؤلفه غريق الخطايا، وتجاوز بجودك عن مصنفه أعصى البرايا. تم خط الكتاب بعون الملك الوهاب على يد أحقر الطلاب أنا الارزل محمد بن آقدل، سنة الف ومائة وخمسين، حين دخل العمر في أربعة وعشرين. كتبتها من نسخة المصنف لمصنفه: أنا المفتقر الى غفران ربه الغفار، ابوبكر بن محمود بن سوار».

خەتی نووسەرەوەکەی خۆش نییە و هەڵەیشی لە نووسینەوەدا هەیە.
لە چەند جێگەیشدا لە پەراوێزدا شیعری فارسی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەری نووسیوە.
دوای ئەم دانراوەیش دانراوێکی دیکە هەیە خاوەنەکەی نازانرێ.
لە (دار العراق للمخطوطات)دا بەژمارە (١٧٤٢٥) پارێزراوە.

***

## تركيب العوامل

٣٨٧

٢/٧٦٣٤ دانراوی: مەلا شێخی (گردوانی)

سەرەتاکەی:

«قال المصنف روح الله روحه: بسم الله: الباء حرف من حروف الجارة، اسم مجرور، بها الله مجرور على انه مضاف اليه...»

کۆتاییەکەی:

«تمت النسخة الشريفة المسماة بتركيب العوامل، من مصنفات ملا شيخ الگردواني. تمت. كاتبه علي بن يعقوب. بن علي بن يعقوب، بن يعقوب، بن علي بن اسماعيل بن شروين...»

دەبێ ئەم (شروين)ە ئەو (شروين)ە بێ کە لە زنجیرەی ئیجازەی مامۆستایانماندا هەیە و ئیجازەکان دەگەڕێنەوە سەری.

***

## حاشیەی مەلا ئەحمەدی (کرویسی)

٣٨٨

٢/١٦٦٢٢

لەناو ئەم دەستخەتەدا چەند کتێبی بچکۆڵە تێکەڵاو کراون، یەکێکیان عەوامیلی جورجانیە، دوای ئەو کتێبێ دێت سەرەتاکەی نەماوە، دیارە حاشیەیە بەسەر کتێبێکی نەحوەوە، لەوە زیاتر هیچی لێ وەرناگیرێت، دوایی ئاوا کۆتایی دێت:

«فلا يضاف في صورة الالتباس حذراً عنه، وفي غيرها ايضاً حملاً عنها لاطراد الباب ملا احمد كرويسي»

مێژووی نووسینەوە و ناوی نووسەرەوەیشی دیار نییە.

***

## دانراوێکی عەبدوصەمەدی مەرگەیی

### ٣٨٩

لە دەستخەتی ٤٧٧٢ی (دار العراق للمخطوطات)دا دانراوی دووهەم بریتییە لە کتێبێکی مامۆستایەکی کورد کە لە سەرچاوەکانی بەردەستماندا شتێکی دەربارە نابینین و، وا دیارە مامۆستایەکی ناسراو نییە:

سەرەتای دانراوەکەی ئاوایە:

بسم الله الرحمن الرحيم وبه نستعين

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وآله أجمعين.

اما بعد: فيقول الفقير المحتاج الى الله الغني، عبدالصمد بن ملا محمد المركي -مەرگەیی- (رحمة الله عليه): لما كان للكتاب المسمى بالعوامل في علم النحو شروح كثيرة لكن ليست مفيدة للغبي، فأردت أن أشرح له (كذا) شرحاً آخر تسهيلاً وتوضيحاً للغبي وللذكي بالاولى. ومعيناً لكتب هذا الفن بالجملة. وسميتها (توضيحاً للعوامل)[1] فاستعنت بالله لأنه المعين. وأشتغلت بذلك...

دەستخەتەکە سێ دانراوی تێدایە: یەکەمیان حاشیەی مامۆستا مەلا ئیسماعیلی بانەییە بەسەر سەعدوڵڵای بچووکەوە. دووەم: ئەم (توضيح العوامل)ەیە.

سێیەم: تەصریفی مەلا عەلییە.

هیچیان مێژووی نووسینەوەیان پێوە نییە.

***

(١) ڕەنگە هەڵەی نووسەرەوە بێت و (توضيح العوامل) ناوە ڕاستەکەی بێت.

## قواعد التجويد

٣٩٠

نامیلکەیەکی بچکۆلەی شەش لاپەڕەییە دانراوی مامۆستا مەلا محەمەدی مەیدانییە.
تەنها ئەوەندەی دەربارە دەزانین لە سەرەتاوە نووسراوە:
(هذه قواعد التجويد لمولانا الشيخ محمد الميداني رحمه الله تعالى).
لە کۆتایشیەوە نووسراوە:
(تمت بعون الله تعالي ليلة الاحادد (!) في شهر جمادي ثاني في بلد دمشق سنة ١١٤٣هـ).
گومان نییە کە (مەیدان) ناوی گوندێکی کوردستانە وەک لە دەستخەتی ١٩٩٩٠ دایە. بەڵام زیاد لە مەیدانێکمان هەیە، دەبێ مامۆستامان خەڵکی کام مەیدانیان بێت.
دەمینێتەوە باسی دەستخەتەکە دەستخەتێکی گەورەی کۆنە (٧٠٠) لاپەڕە زیاتر دەبێت، هەمووی بەخەتی مامۆستایەکی کوردە کە ناوی ئەحمەدی کوڕی صۆفی ئیبراهیمی تەوێڵەییە، ساڵی ١١٣١ و دوای ئەو ساڵە لە مزگەوتی تەوێڵە نووسیویەتیەوە. کۆمەڵێک دانراوی دیکەی تێدایە، پێناچێ ئەوانی دیکە دانراوی مەلای کورد بن.
دیارە ئەم نووسەرەوە لە کاتی فەقێیتیی و سەرەتای خوێندنیدا کتێبەکانی نووسیوەتەوە، چونکە عەرەبییەکەی لاوازە و هەڵەی زمانی زۆری هەیە.
بەژمارە ٢٤٣٨٠ د.ع پارێزراوە

***

## البرهان الحق في رد من تمسك بعد وقوع الطلاق الثلاث ببطلان نكاح سبق

٣٩١

٢/٢٦١٦٥

ئەم نامیلکە دانراوی مەحموودی کوڕی ڕەسوولە و، لە وەڵامی پرسیارێکدا لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیددا ساڵی ١٣٢٤ بەفەرمان و لەسەر داوای شێخولئیسلام داناوە.
سەرەتاکەی دوای پێشەکیەکی یەک لاپەڕەیی:
«وبعد: فيقول الفقير الى مغفرة الله الغني، محمود بن رسول أوصل دعاه له

ولاخوانه المؤمنين بحفظ الدنيا والدين، الى درجة القبول: لما رأيت بعض الأخوة المتفقهة...»

کۆتاییەکەی بەم دێڕە بێت:

«واما ثانياً فقول البلقيني ما لم يظهر بطريق شرعي يحمل على نظير ما مر.

لەوە دەچێت ناتەواو بێت، ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە و، شتێکی دیمان دەربارەی دانەرەکەی دەست نەکەوت.

ئەوەندەیش هەیە دەڵێ: لەبەر خاتری عەلی کوڕی حاجی حەرەمەین عەبدولوەهاب دایناوە.

***

٤١٦٦٣

## نتائج الأفكار شرح اظهار الأسرار

٣٩٢

ئەم کتێبە دانراوی مامۆستایەکە بەناوی مستەفای کوڕی حەمزە، لە شەرحی ئیظهاری بەرکێویدا دایناوە.

بەداخەوە هیچم دەربارەی ژیانی دانەرەکەی دەست نەکەوت ئەوەندە نەبێ کە خۆی لە سەرەتای کتێبەکەیەوە نووسیویە و، دەڵێ: فەقێیان زۆر داوایان لێ کردم کە شەرحی کتێبی ئیظهاریان بۆ بکەم، منیش بۆم نەدەکرا و هەر داواکەیانم دوا دەخست. تا ئەنجام گوتم: ئەگەر خودا کوڕێکی پێ بەخشیم ئەوا داواکەتان بەجێ دێنم، ئەوە بوو خودا کوڕێکی پێ بەخشیم، ناوی نا محەمەد، دواتر خودا بەمیهرەبانیی خۆی برایەکی پێ بەخشی ناوم نا عەبدوڵلا، ئیتر بیانووم نەما داواکەیان بدەمە دواوە، بۆیە ئەم کتێبەم دانا بۆ ئەوانیش و بۆ کوڕەکانی خۆیشم، دواتریش هەردوو کوڕەکەم مردن.

ئەم کتێبە کتێبێکی گەورەیە و تێکڕا (٦١٢) لاپەڕەیە. بەخەتێکی خۆش نووسراوەتەوە و باش و، پوخت هەڵگیراوە و هەمووی بەخەتی عەلی کوڕی محەمەد ڕەضا نووسراوەتەوە. مێژووی نووسینەوەکەی ساڵی ١٢٩٦ھ.

لە سەرەتاوە دەڵێت:

«اما بعد: فيقول العبد الفقير الى لطف ربه القدير، الشيخ مصطفى بن حمزة اسكنهما الله بفضله في الجنة: إن كتاب اظهار الأسرار، للفاضل صاحب امعان الانظار، وبديع الفضل في الأعصار، ما رأت مثله الأبصار، خلف السلف الأخيار، سند خلف الأحبار، مولانا الشيخ محمد المحقق الحقاني، النحرير الحبر المدقق الرباني. الشهير المعروف بالبركوي، الفائز بالنوال الوفي...»

بەژمارە ٤١٦٦٣ د.ع پارێزراوە.

## نتائج الأفكاري مستەفای کوڕی حەمز...

نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەم دۆزییەوە هەندێک لە مێژووی دانەرمان نزیک دەکاتەوە، چونکە بەگوێرەی کۆتایی ئەم نوسخە مامۆستا مەلا مستەفا ساڵی ١٠٨٥ ئەم کتێبەی داناوە. ئەم نوسخە مستەفای کوڕی عەبدولفەتاحی پاپلانیی ساڵی ١٢٩٥ نووسیویەتیەوە.

***

## شەرحی (أربعين) واتە شەرحی چل فەرموودەی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- بە عەرەبی

٣٩٣

١/٢٢٥٤٦

سەرەتاکەی:

«وبعد: فان العبد المذنب محمد بن أبي بكر رحمة الله عليه، بعد طول خوضه في بحر الذنوب والعصيان، طلب رضاء الرحمن ومخالفة الشيطان والنجاة من النيران والدخول في دار الجنان، ولم تسمع له نفسه، غير انه وجد...»

کۆتاییەکەی:

«قد تمت كتابت(!) التي زين القلوب في المجالس بعون الله تعالى وحسن التوفيق، في يد العبد الفقير الضعيف المحتاج الى رحمة الله الملك القدير،

محمد بن محمد خان بن سهراب الجوانرودي... قد تمت في يوم الخميس من يوم ستة وعشرون(!) من شهر الصفر المظفر من ناحية السليمانية في المسجد الحاج بيك في سنة ثلاث وتسعين ومائتين والف.»

نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبە بەژمارە ٤٣٣٩٤ پارێزراوە، بەڵام ئەمیش زانیارییەکی ئەوتۆی تێدا نییە کە شتێک دەربارەی دانەری کتێبەکە ڕوون بکاتەوە.

***

## نامیلکەیەک لە نیکاح و تەڵاقدا

٣٩٤

٤١٩٣٢

نامیلکەیەکە بەزمانی فارسیی دانراوی موفتیی سلێمانیە، بەڵام نە ناوی موفتیەکە نووسراوە، نە مێژوویشی پێوەیە

سەرەتاکەی ئاوایە:

«برادران دینی کسانیکه اقدام وارتکاب نکاح حنفی میکند بعد از رعایت که از مذهب خودش که شافعیست رحمه الله، که در نسب ورضاع و...»

کۆتاییەکەی:

«واجب را بدین تبلیغ از عهده ء خود بیرون نمودم، وبالش را بگردن کسانی که عمل بأو نکنند انداختم، بلکه روز قیامت ان شاء الله گناهبار و شرمسار و معاتب ومخجول حضرات نشوم. بلغ ما علیک فإن لم یفعلوا فما علیک، والسلام علی من اتبع الهدی واجتنب الردی.»

أنا الحقير المفتی بلواء السليمانيه

***

٥/١٩٠٩٤

## کلام ملا محمد هوابادی(١)، [واوی وەست!] از ولایت سردشت

٣٩٥

حسام الدین هورامی بهاء نیسبەتی سامی
نەدیمی رازی ئیلهامی بکە لوطفێکی بەملاوە

بەها خەصلەت حیسامەدین — جەوان و پیری با تەمکین
ئەسیری نەفسی پڕ نەفرین — ڕەهاکە تا ڕەمەق ماوە
دڵی پڕ غەم لە دەردی تۆ — ئەبا پڕ بێ لە نووری تۆ
کە دووریی و حوضووری تۆ — موساویی بێ لە هەر لاوە
ئەگەر (کلی) موریدانی — (بهاء الملە)ی ثانی
نەکەی دەرمانی لوقمانی — ئیتر من چیم لە تۆ داوە؟
حەبیبی حەبیبی ڕەحمانی، — وەصیی شاهی عەدنانی
لە دەست وەسواسی ەیطانی — ئەوا هاتم بەشەکاوە
دڵی پڕ ظوڵمەت و قەسوەت — ئەگەر بوو طالیبی نیسبەت
ئەتۆش لوطفێ بکە حیسبەت — لە ڕێگەی وی بەتۆی داوە
برینداری بەها خوارە — وەها بێحەد شەکەریارە
لە جێی [تروی!] هەڵداوە — کە زەخمی وی هەر ئەوجارە
(باللە) شەهادەت بووم — بە تیری شاهیدی مەردوم
لەوێ گەرچی بییم مەحرووم — وەلێ (نعم البدل) ماوە

***

(١) ئەم پارچە شیعرە جگە لەوەی کە لە سەری نووسراوە شیعری (مەلامحەمەدی هەوابادی)یە هیچی دیکەی لێ وەرناگیرێ، بەڵام وا دیارە بۆ شیوەن و سووکوار بۆ حیسامەدینی هەورامی کە دیارە شێخی تەریقەت بووە نووسیویەتی.

١/٤٢١٥٩ ئەم دەستخەتە دانراوێکی تێدایە لە سەری نووسراوە:
هذا لفتح الله بن محمود الموصلي

سەرەتاکەی:
«اما بعد: فهذه رسالة في بيان حكم القراءة على أرواح الأموات. تسبب لها بعض أرباب المقالات، ونسل الله الهام التوفيق وإصلاح النيات.»

کۆتاییەکەی:
«وقع الفراغ من تأليفها يوم الاثنين آخر يوم من شهر صفر الخير في درنده، في وادي الاشودي، في البستان والحمدلله وحده، وصلى الله وسلم على من لا نبي بعده. ١١٤١.»

وەک دەبینی دەبێ دانەرەکەی کورد بێت و، دووریش نییە بەختەتی دانەرەکەی بێت.

***

## (مائده الخطب)ی وانیی

## ٣٩٦

مامۆستایەکمان هەیە بەناوی یەحیای کوڕی نووحی وانیی، لە هەندێ سەرچاوەدا ئاماژەیەکی بچووکی بۆ کراوە و دەڵێن: ناوی یەحیای کوڕی نووحی کوڕی عەبدوڵڵای وانییە و برای بەدرەدین عومەرە کە لە سەدەی دوازدەی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە. مامۆستا مەلا یەحیا پیاوێکی زانا بووە و خەریکی ئامۆژگاریی و خوطبە خوێندنەوە بووە، لە شوێنەواری ئەو کتێبێک هەیە بەناوی (المباحث الدرية في بيان السنة الشمسية والقمرية)[1].

لە ئەنجامی پشکنینی دەستخەتەکانی (د.ع)دا یەکێکی دی لە شوێنەوارەکانی ئەم مامۆستام دۆزیوەتەوە، لێرەدا ناوی دەخەینە ناو ناوان و زانیارییەکەی دەخەینە پاڵ زانیارییەکانی پێشوو.

کتێبەکە ناوی (مائدة الخطباء)ە و سەرەتاکەی ئاوایە:
«وبعد: فإن العبد الضعيف الفقير الى رحمة ربه المولى القدير يحيى بن نوح

(١) مشاهير کرد، بەرگی دووەم ل: ٢١١.

الخطيب بوان، بالجامع الكبير صانهما الله تعالى من خطاب الوعيد وعذاب السعير...»

دوايي باسی ئەوە دەكات كتێبەكەی لە پێشەكییەك و (مقالة) وتارێك و كۆتاييەك پێكهێناوە و، لە يەكێك لە خوتبەكانيەوە دەردەكەوێ كە لە سەردەمی ژيان و فەرمانڕەوايی ئەحمەدخانی كوڕی محەمەدخانی عوثمانيدا ژياوە و، مەلا بووە و بابەتەكانی ئەم كتێبەی نووسيوە.

دەستخەتەكە بەخەتی دوو كەس نووسراوەتەوە، بەڵام تەواوبوونی پێوە ديار نييە و، مێژووی نووسينەوەی پێوە نييە و، تێكڕا ٨٢ لاپەڕەيە، بەژمارە (٢٠٠٤٢) لە (د.ع)دا پارێزراوە.

***

٢/٢٧٠٨٧ د.ع

## الدرر النحويه

### ٣٩٧

دانراوی مامۆستا مەلا فەتحوڵڵای (ورقانسی)

سەرەتاكەی:

«أما بعد: فان العوامل في النحو مائة عامل على ما الفه الشيخ عبدالقاهر الجرجاني: لفظية، ومعنوية.»

كۆتاييەكەی:

«نحو زيد يضرب، فانه في موضع زيد ضارب، لأن الأصل في الخبر الإفراد مع كونه مشتركاً في الزنة والابهام بحسب الوضع، والتخصيص بحسب القرينة. وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين آمين.

تمت النسخة المسماة بدرر النحوية من تأليفات الشيخ فتح الله الورقانسي، في شهر الطباخ، في قرية مزري، في سنة الف وثلاثمائة وتسعة وعشرين...»

دەربارەی ئەم مامۆستايش شتێكی دی نازانم.

***

**ام القرآن وسبع المثان، شفاءً وسروراً لأهل الايمان وحزناً لأهل العصيان، وبشراً للمؤمنين، وانذاراً للمخالفين**

٣٩٨

دانراوی: خالد الوانی.

له کۆتاییەوە نووسراوە:

«وقد حرر والف هذه الرسالة خالد الواني بحسن توفيق ربه الوالي المتعالى، في شهر مبارك ربيع الاول، في سنة الف ومائة واربع وأربعين.»

مێژووی تری پێوە نییە. دوور نییە نوسخەی دانەر خۆی بێت.

زمانی عەرەبییەکەی دانەر لاوازە ئەمەیش کەمێک لە سەرەتاکەی:

«وإنه في زماننا هذا قد اندرس مدارس العلوم الحقيقية، ومعالم التعليم لعلمي! بان العلم في هذا العصر قد خبت ناره، وولت الأدبار انصاره، ولاشتغال بال قد استولى على سلطانه، واختلال حال قد تبين لدى برهانه، سيما علم التفسير والحديث والرياضي من بينها، فان الرياضي قد ظلت ناضبة الماء(!) وذاهبة الرواء، مصفرة النجوم والأزهار، مغبرة الارجاء والأقطار...»

دوایی پێشکەشی کردووە بە وەزیر ئەحمەد پاشا. کتێبێکی گەورەیە ٦٠٠-٧٠٠ لاپەڕە دەبێت، خەتەکەی خۆش نییە بەڵام خۆشخوێنە.

ئەم دەستخەتە لە (د.ع)دا بەژمارە (١٣٧٧)

***

**تەفسیری قورئان**

٣٩٩

٢١٢٩٧

تەفسیری قورئانی پیرۆزە بەزمانی فارسی لە سەرەتای سوورەتی (الواقعە)وە دەستپێدەکات تا کۆتایی سوورەتی (عم).

تەفسیرێکی کورتە، لەگەڵێ شوێنیدا وەک تەرجەمە وایە. سەرەتا و پێشەکییان بۆ

نەنووسراوە یان نەماوە، بەخەتێکی جوان و بەمەرەکەبی سوور و ڕەش نووسراوەتەوە، ئایەتەکان بەسوور و تەفسیرەکە بەڕەش، چواردەوری لاپەڕەکان زەرکەفت کراوە.

بەزۆریی بەدانراوی مامۆستایەک لە مامۆستایانی کوردی دەزانین. کۆتاییەکەی ئاوایە:

«باتمام رسید وباختتام انجامید، تفسیر این چند سور فرقانی وآیات قرآنی، بتأریخ روز مبارک دوشنبه میان ظهر و عصر در ثلاثین ماه رجب الفرد الحرام، حسب الفرموده عالیجاه والاجایگاه سلاله سلسله آل عباس، مصداق خیر الناس من ینفع الناس، أعنی حاجی لطف الله بیگ بن المرحوم بهرام پاشا، یسرالله له من الخیر ما یشا، مأمول ازکرم أخلاق کریمانه‌اش که مقبول ومطبوع گظر کیمیا اثر کرد د. تمام شد در سنه ١٢٠٥.»

دەستخەتەکە چوارسەد لاپەڕەیەک دەبێت.

***

## شەرحی ڕیسالەیەک بەسەر (جهة الوحدة)ەوە

٤٠٠

٤/٢٠٨٨٥

سەرەتاکەی:

«يا من لا وحدة حقيقة لما سواك. وطالب الكثرات انما يطلب منها اياك. صل على من ضبط بجهته لولاك لولاك لما خلقت الافلاك. وبعد: يقول افقر العباد، بل أحقر الأكراد، متحفاً للمبتدئين بمثل رجل الجراد: لما ترك المصنف...»

کۆتاییەکەی:

«... اللهم سهل علينا الشروع في منطق فازت به النفوس عن الافحام، ويسر لنا الفلاح والنجاح من محض فلك الشامل للخواص والعوام، عن مضيق توادعت فيه الأيدي عن الأوراق والأبصار عن الأرقام، (نجومن!) هو سحاب رحمتك المطير مزارع آمال الانام... قد كتبه تراب أقدام العلماء على مبحث جهة الوحدة، في رمضان سنة ست وثمانين والف.

كتبه محمود سنة ١١٢٢.»

بەداخەوە دەربارەی دانەرەکەی کە جگە لەوەی خۆی بەدەمی خۆی هاوار دەکا دەڵێ: کوردم. هیچی دی نازانین، ئەوەندە هەیە لە دوا دێڕدا کە دەڵێ لە ڕەمەزانی ١٠٨٦دا نووسیم. دەردەکەوێ لەو سەردەمەدا لە ژیاندا بووە.

دەستخەتەکە کۆمەڵێ دانراوی تێدایە هەمووی بەخەتی ئەم مامۆستا مەحموودەیە کە کوڕی محەمەدە و ساڵی ١١٢٢ نووسیویەتیەوە، لەوە بەولاوە هیچ دەربارەی خۆی و شوێن و جێگای نازانین.

***

٤/٣١٣٠٩ لەسەری نووسراوە:

شرح جهة الوحدة للامام زين الدين رحمه الله تعالى

بەڵام وەک لە سەرەتای کتێبەکەوە دیارە تەعلیقاتە بەسەر ئەو باسەوە.

سەرەتاکەی:

«اما بعد: فهذه تعليقات علقتها بالمبحث المتداولة(!) بين المحصلين الموسوم بجهة الواحدة(!) فأقول وبالله التوفيق: إن عادة المؤلفين أن اوردوا في أول تصانيفهم...».

کۆتاییەکەی:

«ذكرناها في النكتة الموعودة سابقاً في تقديم الظرف على متعلقه. ثم المعلوم إن هذا آخر ما وفق الله سبحانه وتعالى في حل المقام، والله سبحانه وتعالى جل شأنه خير الميسرين، والموفقين. وقد تمت الحاشية الواقعة على الرسالة الموسومة بجهة الوحدة، لمولانا الملا زين الدين في نهار الجمعة في شهر رجب الاصم ١٢١٦.»

## تەعلیقاتی زەینەدین لەسەر باسی (جهة الوحدة)

٤٠١

٣/٢٠٨٨٥

سەرەتاکەی:

«الحمدلله رب العالمين، أما بعد: فهذه تعليقات علقتها بالمبحث المتداول بين المحصلين، الموسوم بجهة الوحدة، فأقول وبالله التوفيق...»

کۆتاییەکەی:

«... متفرعاً على النتيجة. آخر ما يدل على صغرى القياس، وهذه هي النكتة الموعودة سابقاً في تقديم الظرف على متعلقة. هذا ما وفق الله لي في حل المقام، والله خير الميسرين. تمت الرسالة الواقعة على جهة الوحدة من مصنفات زين الدين. اللهم اغفر له ولنا ولسائر المسلمين آمين. نمقه محمود ١١٢١».

ڕەنگە ئەم زەینەدینە زەینەدینی پیزانیی بێت.

دەستخەتەکە:

ئەم دانراوە بەشێکە لە دەستخەتێکی گەورە، کە هەمووی بەخەتی هەمان نووسەرەوە مەحموودی کوڕی محەمەدە. (١٠) دانراوی تێدایە بەشێکیان دانراوی مامۆستایانی کوردە. وەک ئەمەی نووسیمان و، کتێبی دوای ئەمە و حاشیەی زێباریی بەسەر عیصامەدینی ئیستیعارەوە.

دیارە ئەمەو نامیلکەی پێشوو - ژمارە ٤/٣١٣٠٩ - یەک دانراوی یەک مامۆستان.

## دەستخەتێک و هەندێک زانیاریی

٤٠٢

دەستەخەتی ژمارە ١٧٦٦١ی (دار العراق للمخطوطات) وا دیارە بەشێکە لە دەستخەتێکی گەورەی نایاب [...] پارچە پارچەی کردووە و کردوویەتی بەچەند بەش بۆ چەند پوول! ئەوەی کە ئێستە لە دەستدایە و بەو ژمارە پارێزراوە پاشماوەی چەند دۆعایەکی تێدایە لەوانە دۆعای (حزب البحر)ی شاذلیی و دوای ئەوە تەرجەمەی کتێبی

(الحصن الحصين)ی ئیمامی جەزەرییە، ئەم تەرجەمە تەرجەمەی مامۆستا جەمالی حسەینییە، نووسەرەوە بەرێزەکەی دەڵێ: دانەری ئەم کتێبە مامۆستای دانەری کتێبی (روضة الاحباب)ە، کە هەردووکیان بە فارسین.

دوای ئەمە ئەوەیە کە ئێمە زیاتر مەبەستمانە کۆمەڵێک نامەی فارسیی مەولانا خالیدی تێدایە کە بۆ موریدان و دۆستان و هاوەڵانی نووسیوە.

لەمەوپێش لە چەند بۆنە و شوێندا سەرچاوەی نووسراو و نامەکانی مەولانا خالیدم دیاریی کردووە، بۆ نموونە لە لاپەڕە (١٤٨)ی بەرگی یەکەمی کتێبی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوەدا باسی (کەشکۆڵی شێخ مەحموود)م کردووە کە سەرچاوەیەکی پوخت و دروستی ئەم بابەتەیە، ئەم سەرچاوەیش کە ئێستە لە دەستدایە -هەرچەند ناتەواوە و ڕەنگە زۆری لەناو چووبێت- ئەوەی کە ماوە پتر لە ٣٠ سی نامەی مامۆستای مەزن مەولانا خالیدە و، نووسەرەوەیەکی زیرەک و وریا و خەتخۆشی کورد کە مامۆستا فەضلوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای سەردەشتییە ساڵی ١٣٠٤ک نووسیویەتیەوە.

## دوو دانراوی دیکەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی

### ٤٠٣

دەستخەتێکی بچکۆلەی شڕ کە بەژمارە (٢٧١٢٥/ ١ و ٢ د.ع) پارێزراوە دوو نامیلکەی بچکۆلەی عەقائیدی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی تێدایە. وا لێرەدا سەرەتا و کۆتایی هەردوو نامیلکەکە و مێژووی نووسینەوە و ناوی نووسەرەوەکەیان تۆمار دەکەین.

کفاية الاسلام مشهور بفرض وسنة

دانراوی: شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریی

سەرەتاکەی:

حمد بی حد خدای یکتارا  آنکه جان داد عقل و دین مارا
ذات پاکش ز عیبُ عار بریست  خالقِ آدمیّ دیوُ پریست
هر چه ظاهر شد از ارادت او  نیست مقصود جز عبادت او

کۆتاییەکەی:

همه را یـــا مفتح الابـــواب بنمـــا راه خَـــیرْ جند ثواب
یارب از فضل خویش رحمت کن جـــاي سيّد مقام جنت کن
هـــزاران درود هـــزاران سـلام زمـــا بر مـــحمد علیه وسلم

***

## كتاب عقائد اسلامية

٤٠٤

٢٧١٢٥

سەرەتاکەی:

بسم الله الرحمن الرحيم

تو بدان ای مسلم ایمان گزین واجب آمد بر تو کسب علم دین
دانـــش ارکان اســـلام ایمان أقـــدم از هر واجبات دین بدان
هست اقدمتر زهر واجب برت دانـــــش ارکـــان دیـــن رهبرت
گر بهر ارکان تو عالم نیستی نـام تو مؤمن تـــو مؤمن نیستی
عـفو کن یارب بجاه مرسلین ناظـــم جـــامع برین ارکان دین
عبد مذنب عـبدالله کـــریم چشـــم غفران دارد از رب رحیم
صد چو اعداد حروف این کلام بر رســل بادا صلواة هم سـلام

تمت شد عـقيـدة نامـةء شيـخ عـبيـدالله نهري اللهم حول حاله بأحسن الحال ١٦ رمضان ١٢٩٩.

اللهم اغـفر لكاتبه عـبدالمذنب عـبدالرحمان الزيارتي القـادري الاحمدي طريقة. والشافعي مذهباً والـ... محملي نصباً(!) [نسباً]. كتبه في ديوان شقلاباد وقت الظهر يوم الاربعاء.

به ناهمواری خط را مکن توبیخ مـاجانا
غـرض تنسـیخ مـیـود پی أطفـال نادانا»

***

١٧٩١٩ د.ع

٤٠٥

دەستخەتێکە ٢٦ لاپەڕەیە، لاپەڕەی ١٣ بەیت و کەمتر و زیاتری تێدایە. ئەمەی لێ وەردەگیرێ:

من مقولة الحقير طاهر در مرثيه پدرش
اعلاه الله درجته في الجنة گفته است

دیاریی ئەییام ...............
صاحیب طەریقەت دیاریی ئەییام
عالیم عامیل (محبوب الانام)
ذاکیری جەلیل بە صوبح و بە شام
پەی چێش بەی زوودی دنیات کەرد خەراب؟
دڵەی ئەهل بەیت وێت کەردی بەکەباب
ئەرواح پاکت بەردی بەجەننەت
پەی ئێمە ئاستی چەند سزا و میحنەت
کۆن دەنگی ئەوراد ئەووەل صەباحت
صەدای صەلەوات داخ پەرێو داخت

ئەوەکەی تری بووە بەژێر پینە و سرێشەوە و تێدا چووە.

دەستخەتەکە زۆر کۆنە و لەمە زیاتر هیچم لێ نەزانی، پاشماوەی شیعری دیکەیشی تێدایە بەڵام ناخوێنرێتەوە.

## دەبێ ئەم (یوسف)انە یەک یوسف بن؟

٤٠٦

لە ئەنجامی گەڕانم بەناو دەستخەتەکانی (د.ع)دا ڕێگەم لە شوێنەواری چەند یوسف ناوێکی کورد کەوتووە، وەک ئەوە وایە -بەلای کەمییەوە- تێکەڵاویی لە ناو و مێژووی دوانیاندا هەبێ و، کەمێک تەمومژ ڕێگەی دۆزینەوەی ژیانی گرتبێ. چونکە (جمال الدين

یوسف الگورانی)ی کوڕی عەبدوڵلامان هەیە و، خاوەنی (معجم المؤلفین) ساڵی (٧٦٨ه)ی بۆ کۆچی دوایی ئەم مامۆستا داناوە.

بەگوێرەی دەستخەتی (٣/٢٠١٩٨ د.ع)ش دانراوی (سوانح الكتب) دانراوی مەولانا مەلا یوسفی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای ناسراو بە مەلا زادەی کوڕی مەلا محەمەدی ناسراو بە (شیخ صغیر - شێخە گیچکە)یە.

مەلا شێخێکمان هەیە کە لە زانایانی سەدەی ١١ی کۆچییە و لە بەرگەکانی یەکەم و سێیەمی (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی...)دا شتێکی لەسەر نووسراوە[1]، لەوە ناچێ ئەو مەلا شێخە پێوەندییەکی ئەوتۆی بەم (شیخ صغیر)ەوە هەبێت.

بەهەرحاڵ لەوە دەچێت -بەلای کەمییەوە- ناوی دوو یوسفی کوڕی عەبدوڵڵای گۆرانیی لە دەستدا بێت، کە مێژووی ژیانیان -بەگوێرەی ئەوەی لە دەستدایە- لە یەکەوە نزیک نین.

هەرچۆن هەبێت چیمان دەربارەی ئەم یوسف ناوانە دەستکەوتووە لێرەدا دەخەینە ڕوو، بەڵکو لەمەولا زیاترمان بۆ ڕوون ببێتەوە.

**مامۆستا مەلا یوسفی گۆرانیی:**

هەر لە (دار العراق للمخطوطات)دا ناو و دانراوی مامۆستا مەلا یوسفێکی دیبم دۆزییەوە کە دەڵێن: (جمال الدین یوسف الگوراني) دانراوەکەی کتێبە بچکۆلەکەیەتی لە شەرحی چوار فەرمایشتی پێغەمبەردا. کاتێک گەڕامەوە بۆ سەرچاوەکانی سەر بەم باسە لە (معجم المؤلفین)دا ئاوای لەسەر نووسراوە:

یوسفی گۆرانی: (... - ٧٦٨هـ، ... - ١٣٦٧م) یوسفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی عەلیی کوڕی خضری کوردی بەڕەچەڵەک گۆرانیی، عەجەمیشی پێ دەڵێن. (جمال الدین، ابو المحاسن) صۆفیی بووە، لە قەرافەی میسردا گۆشە و خانەقای هەبووە، وەک لەگەڵێ ولاتی دییشدا بوویەتی. لە میسر کۆچی دوایی کردووە و، لە خانەقاکەی خۆیدا نێژراوە، ئەمانەی خوارەوە لە دانراوەکانین:

١- ریحانة القلوب في التوصل الى المحبوب.

٢- بیان أسرار الطالبین في التصوف.

---

(١) بڕوانە: بەرگی یەکەم ل: ٣٤٣ و بەرگی سێیەم ل: ٢٨٣.

له (د.ع)دا لەسەر بەرگی دەستخەتی (٢٦٤٦٩) نووسراوە:

(بيان الأسرار للطالبين الأبرار، تأليف يوسف بن عبدالله الكردي الگوراني) بەڵام ناو بەرگەکە شتێکی دییە و، وەک ئەوە وایە ئەو دەرهێنرابێت و ئەمی لە شوێن دانرا بێت.

٣- بديع الانتقاش في شرح القوافي الثلاث[1].

ئەمە ئەو دانراوانەیە کە مامۆستای (کەحالە) باسی کردوون، بەڵام، وەک لە سەرەوە باسمان کرد، ئەم دانراوەیشی هەیە کە باسی دەکەین. ٢/٢١٠٤٥ د.ع

سەرەتاکەی:

بسم الله الرحمن الرحيم

فصل في كلام الشيخ الرباني في الأربعة الأحاديث التي رواها عن النبي -صلعم- وشرحها قدس الله سره ونفعنا بهمته وبركته، الشيخ يوسف الگوراني رحمه الله. الحمدلله مالح (كذا) العطايا وكاشف الغطايا، والصلاة على نبيه المصطفى، وحبيبه المجتبى، وعلى آله أهل الوفا، وأصحابه أصحاب الصفا.

أما بعد: فهذا مختصر من كلام الشيخ العارف المرشد المحقق المدقق الشيخ جمال الدين يوسف الگوراني -قدس الله سره- في بيان كيفية علم المريد التائب الى الله تعالى بالأحاديث الأربعة المروية عن النبي صلى الله عليه وسلم.

الأول قوله عليه السلام: إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل امرئ ما نوى...

کۆتاییەکەی:

... مع أبناء الدنيا وكثرة المريدين، وزيارة النسوان، أعوذ بالله من الشيطان، وإذا أراد الله بعبد خيراً بصره بعيوب نفسه. أللهم بصرنا عيوب نفوسنا، ووفقنا مجاهدتهما وترك مناهيك، ولما تحب وترضى انك على كل شيء قدير، وبالإجابة جدير، ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم. تمت.

دانراوەکە ٢٤ لاپەڕەی بچکۆلەیە. لاپەڕەی ١٣ دێڕی تێدایە، ناو و مێژووی تێدا نییە.

ئەم دانراوە ناویشی بۆ دانەنراوە و نازانین هەروا بێ ناو بووە یان ناوێکی لە شوێنی دیدا هەیە و لێرەدا نەنووسراوە؟

---

(١) معجم المؤلفين: ١٣، ص: ٣١٣.

## سوانح الکتب

٢/٢٠١٩٨

دانراوی: مەولانا مەلا یوسفی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای ناسراو بە مەلا زادە کوڕی مەلا محەمەدی ناسراو بە (شیخ صغیر - شێخە گچکە).

سەرەتاکەی:

«کتاب سوانح الکتب، قد جمعه العالم العامل الصالح المحقق أعني أخنا، أخانا (نسخة) في الدارين ومولانا ملا یوسف بن ملا عبدالله الملقب بملا زادة بن ملا محمد الملقب بشیخ صغیر، من الکتب المعتبرة، اي: من الاحیاء وابن حجر وجمع الجوامع وشرحه للمحلی والدواني...

کۆتاییەکەی:

«وهذه العبارات کلها متقاربة المعنی، متلازمة المفهوم.

انتهی والحمدلله... تمت الرسالة في الوصیة والسلام علی خیر البریة. أقل خلق الله المنان تراب أقدام المسلمین ابن احمد عبدالرحمن...»

دەستخەتی ژمارە (٢/٢٧٢٥٥ د.د)یش نوسخەیەکی دیکەی پوختی ئەم کتێبەیە، محەمەد ناوێک ساڵی ١٢٨٥ لە (مسجد الأحمر - مزگەوتی سوور)، کە دیاریی نەکردووە لە کوێیە، نووسیویەتیەوە.

لە خوارییەوە دەڵێ:

چه غم دارم اگر نیکم و گر بد    بحمدالله که نامم محمد؟

دەستخەتی (٢/٢٢٥٢١ د.ع)ش نوسخەیەکی دیی ئەم کتێبەیە، بەڵام لێرەدا سەرەتاکەی ئاوا نووسراوە:

«هذا الکتاب المسمی بأسامي الکتب، قد جمعه العالم العامل الصالح المحقق، أعني أخینا في الدین ومولانا ملا یوسف...»

ئەم نوسخە سولەیمانی جوانڕۆیی لە بەغداد نووسیویەتیەوە. دەستخەتەکەی ١٠ دە دانراوی تێدایە لە دوای هیچیانەوە مێژووی نووسینەوەی نەنووسیوە.

دەستخەتەکە پێش ١٢٩٥ نووسراوەتەوە؛ چونکە لە شوێنیکدا بەخەتێکی دی مێژووی لە دایکبوونی دوو سێ کوڕی پێوەیە کە لە ١٢٩٥ و دوای ئەو مێژووەدا بووون.

تا ئێستە شتێکی دیم لەسەر ژیانی ئەم مامۆستا نەدۆزیوەتەوە.

لە کۆتایی دەستخەتی (٢١٢٩٧ د.ع)ەوە شتێکمان دەربارەی مامۆستا یوسفی گۆرانیی دیوە لێرەدا دەیخەینە ڕوو:

فائدة تنفع من الصداع من نظم قطب الوجود يوسف الگوراني:

إني حملت اليك كل كريمة
حوراء عن حظ المتيم ما جنت
فأوائل الكلمات منها مقصدي
لصداع راسٍ يا فتى قد جربت

## مامۆستا مەلا یوسفی صالاریی

مامۆستایەکی دیمان هەیە بەناوی یوسفی کوڕی عەلی صالاریی دەربارەی ئەم مامۆستا شتێکی ڕوونمان لە دەستدا نییە، ئەوەندە هەیە لە چەند سەرچاوەیەکدا ناو و باسی هەندێ لە دانراوەکانی هەیە، کە دیارە کاتی خۆی مامۆستایەکی دیار و زانا بووە و، دەورێکی بەرچاوی لە گەشەکردنی ڕۆشنبیریدا هەبووە. بەڵام ئەمیش وەک مامۆستایانی دیمان ژیانی نەنووسراوە و، بەرهەمەکانیشی لە شوێنی باشدا نەپارێزراون، بۆیە وا لە عاستیدا دەستەوسان داماوین!

هەرچۆن هەیە ئەوەی ئێستە لە دەستدایە دەیخەنە ڕوو بەڵکو لەمەولا زیاتری دەربارە بدۆزینەوە.

لە فیهرەستی کتێبخانەی ئەوقافی قادریەدا نووسراوە:

٤- شرح على الاسئلة: ئەم کتێبە دانراوی یوسفی کوڕی عەلیی صالارییە.

سەرەتاکەی: «ينتقص كل تعريف، كل منها، اي من حدود الدلالات الثلاث».

٥- حاشية على شرح الأسئلة: دانراوی یوسفی کوڕی عەلی صالاریی.

سەرەتاکەی: «قوله ولاخفاء في حصول اعتبار قيد الحيثية في حدود تلك الدلالة. اي الدلالة الحاصلة.

کۆتاییەکەی: «فأجاب بقوله: كيف، اي كيف يكون اللزوم الخارجي، شرطاً. تمت حاشية يوسف».

ئەم دەستخەتە ساڵی ١٢٧٦ك نووسراوەتەوە[١] بەڵام وەک لە دانراوەکانی دوای ئەمانەدا دێت، یەکێک لە دەستخەتەکان ساڵی ١١٧٣ نووسراوەتەوە، واتە مامۆستامان پێش ئەو مێژووە لە ژیاندا بووە.

## تەعلیقاتی یوسفی کوڕی عەلیی صالاریی بەسەر شەرحی سەمەرقەندییەوە لە ئادابدا

سەرەتاکەی:

«اما بعد: فيقول المفتقر الى الملك الباري يوسف بن علي الصالاري: هذه تعليقات تضاهي الفرائد على عبارات كالخرائد، شرح الامام الهادي المهتدي مولانا خواجه على السمرقندي، أردت بها كشف النقاب، لتجلى لدى الأحباب (كذا) وتقر بها عيون الطلاب. ووشحتها باسم من كنت في حضرته ونعمت بلطافة صحبته، حاوى الفضائل والمناقب، سمى ابن ابي طالب، ذوي الفضل الجزيل، سلالة نسل عبدالجليل...»

واتە کتێبەکەی بۆ عەلی ئاغای کوڕی عەبدولجەلیل داناوە. لە پەراوێزدا لەسەر «سمی ابن ابي طالب» نووسیویە: (الاسم علي آغا).

کۆتاییەکەی:

«تمت الحاشية الواقعة على شرح الرسالة العضدية بعون الملك العلية(!) على يد أضعف البرية، أعني أحمد المسرف في الخطية،... الى مغفرة ربه الجلية، في رأس العمادية، لأجل أستاده الماهر في علوم الآلية، أعني الاستاذ المفخم مولانا عبيدالله الغالي على (كذا) مدرسة الجديدية السلطانية، أعني السلطان... بكية. في سنة ألف وتسع...[٢] بعد المائة.

دەستخەتی ژمارە (٣/٤٢٢٦٢ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم دانراوەیە، ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە.

دەستخەتی ژمارە (٣٦٤٢٨ د.ع) نوسخەیەکی دیکەی تەعلیقاتی مامۆستا یوسفی صالارییە بەسەر شەرحی سەمەرقەندییەوە.

---

(١) بڕوانە: الآثار الخطية في المكتبة القادرية، تأليف: الدكتور عماد عبدالسلام رؤف، ج/٥، ص: ١٣٦، مطبعة المعارف - بغداد ١٩٨٠.

(٢) ئەمە دەسکاریی کراوە و، دەکرێ (خمسين) بێ و بۆ (تسعين)ش دەگونجێ...

ئەم نوسخە هەندێک تیشک دەخاتە سەر ژیانی دانەرەکەی، بۆیە کۆتاییەکەی وەک خۆی دەنووسم:

«وقد وقع الفراغ من تأليفها مع تبييضها ضحوة الأربعاء، اثنين وعشرين من شهر رمضان من سنين(!) أربع وأربعين بعد المائة والألف. والحمدللة رب العالمين.

قد وقع الفراغ من تنسيخها ضحوة يوم الاثنين من شهر جمادي الأول سنة ثلاث وسبعين من الهجرة النبوية على صاحبها أفضل الصلاة وأكمل التحيات. آمين ١١٧٣».

لە دەستخەتی (١٥٥٩٧ د.ع)شدا باسی مامۆستا مەلا یوسفی دهۆکیی هەیە بەدووری ناگرم هەر ئەم مامۆستای (صالاریی)یە بێت؛ چونکە مێژووەکانیان لە یەکەوە نزیکە، بۆیە لێرەدا ئەو زانیارییانە وەک خۆیان تۆمار دەکەم:

الحمدلله على ما وفقنا وهو خير الحاكمين، أن صرنا بعد الابتداء من المنتهين لكتاب الچغميني، عصر الجمعة في تاريخ ثلاث مضين من نيسان على حساب الشهور الشمسية. وثلاث بقين من محرم على حساب الشهور القمرية، في المدة التي انتقل حاكم الوقت (بهرام پاشا) من دار حكومتهم عمادية الى قصبة دهوك، على زعم أن يجعله دار حكومة وإقامة. ومثل ذلك انما يترتب على الأفعال الحسنة، والحركات المستقيمة، والدوران التعديلية، دون الأعمال السيئة، والتحركات المعوجة. هداهم الله ولا يجعلنا من الظالمين بميمنة حبيبه محمد عليه من الصلاة والسلام عدد النجوم الدائرة، على سطوح الأفلاك مستمراً الى يوم الدين. وذلك سنة ١١٥٤.

دوای ئەمیش (عبدالقهار) ناوێک ساڵی ١١٩٢ لە گوندی (کلیرمان) ئەو حاشیانەی بەسەر چەغمینیەوەن نووسیونی.

نووسەرەوەی دەستخەتەکە کە ناوی خۆی لەبیر چووە، پارچەیەک شیعری عەرەبی لە پیاهەڵدانی مامۆستا مەلا یوسفی دهۆکیی مامۆستایدا نووسیوە، کە ئەمە شیعرەکانیەتی:

«لكاتبه وقت قراءته هذا الكتاب على الأستاذ مولانا يوسف الدهوكي، لينبئ عن بعض كمالاته التي امتاز بها عن رجال زمانه. عفاه الله وإيانا، وأبقاه للمسلمين آمين.

يا خير من أفاد ما كان مستفاد أو مُسْمَعُ
أعطاك الإله من الخير ما به في الدارين تُرفَعُ
قد فُقْت فضلاً كل من كنت تعاصرهُ
جهراً جلياً ليس عليه البرقع
قد فزت بفضائل من الفنون وقد
حزت من العلوم ما كاد أن يكون أجمع
لولا أن كان الجهل على الورى متسلطاً
لكنت اليوم أنت الأرفع
لكن الله نرجو أن يبلغك العلى
فإنه قد كان يوسف من العلى لم يمنع
لو انبنا على بعض ما خصصت به فضلاً
لكان كلاماً طويل الذيل وحروفا تشبع
لكن الشمس اذا استضاءت ضحوة يومها
فماذا الذي يستزيدها الوصف وينفع؟
غير أني حاولت شكر بعض ما وافيتنا
فنرجو أن يكون الأستاد بذاك يقنع

## ئەنواری مەزن

### ٤٠٧

کتێبێک هەیە لە (فقه)ی شافیعیدا بەناوی (الانوار) کە دانراوی (الاردبیلی)یە.

گەلێ جار لە مامۆستایانم بیستووە بەم کتێبەیان وتووە (ئەنواری مەزن)، بەڵام نەمبیستووە بڵێن ئەم کتێبە بەزمانی فارسییە، ئەوەی ناوی بردووە یان باسی کردووە هەر باسی ئەو دانراوەی مامۆستا جەمالەدین یوسفی کوڕی ئیبراهیمی ئەردەبیلیی شافیعی کردووە کە بەزمانی عەرەبییە و کۆمەڵێک شەرحیشی بەسەرەوەیە بەزمانی عەرەبی.

لە (دار العراق للمخطوطات)دا کتێبێکی دیم دۆزییەوە بەناوی (انوار) بەزمانی فارسی. دەڵێ: دانراوی (یوسف بەگ)ە. لە دەستخەتەکەوە شتێکی دی وەرناگیرێ و

نازانین یوسف بەگ کێیە و، ئەوەیش بەدوور نازانرێ کە ئەمیش هەر دانراوی مامۆستای ئەردەبیلیی بێت.

ئەمەیش باسێکی کورتی ئەم دانراوە:

٢١٧٧٦ د.ع

**ئەنواری مازن - مەزن- بەزمانی فارسی:**

دانراوی: یوسف بێگ

ساڵی ١٢٨٧ک عەبدولقادری فەقێ ئەحمەد لەبەر خاتری مەولانا ئەحمەد نووسیویەتیەوە.

لەو کاتەدا یوسف بەگی دانەری لە ژیاندا نەبووە؛ چونکە نووسەرەوەکەی دەڵێ: (طاب الله ثراه).

دەستخەتێکی گەورەیە بەخەتێکی ورد نووسراوەتەوە.

سەرەتاکەی بێ پێشەکیی و شت دەڵێ:

بسم الله الرحمن الرحيم

«قال الله تعالى: وأنزلنا من السماء ماءً طهوراً: گفت خداي تعالى: فرو فرستاديم از اسمان آبي پاك كننده. بدانكه حدث وخبث...

کۆتاییەکەی:

«اگر قاضی را گمان آید که ایشان از مشهود له جزی گرفته واتفاق بران كرداند گواهی ایشان قبول نکنند، واگر گمان نباشد قبول کنند. والله أعلم بالصواب، واليه المرجع والمآب.

تمت شد كتاب أنوار مازن من مصنفات قدوة المتقدمين يوسف بيك طاب الله ثراه، که مشهور بصاحب انوار است. در دست حقیر روسیا. عبدالقادر پسر فقه احمد غفرالله له لأجل استادي معظم مكرم مولوي مولانا احمد مبارك باد. باتمام رسيد دربيست و دوهم شهر ذوالحجة در روز جمعة ١٢٧٨».

بەدووری نازانم ئەم مامۆستا و مامۆستا یوسفی صالاریی و یوسفی بازلیی یەک کەس بن، بەڵام ئەمە هەر گومانە و چاوەڕوان دەبین بەڵکو زانیاریی نوێمان چنگ بکەوێت.

جگە لەمانەیش وەک ئەو گومانەمان هەیە دەبێ گومانمان بۆ پیاوێکی دیکەیش بچێت کە ناوی یوسفی کوڕی شێخە بەگ بووە و، مامۆستا مەلا عەبدوڵلای بێتووشیی قەسیدەیەکی بەرزی بەزمانی فارسی بۆ ساڵی لە دایکبوونی داناوە و، ساڵی ١١٥٥ی بۆ داناوە و[١]، دواتر ئەو مامۆستا یان ئەو بەگە مەدرەسەیەکی گەورەی لە بێتووش هەبووە و، خۆی حاکمی ئەو ناوچە بووە. بۆیە ئەو گومانە بۆ ئەمیش دەچێت و، دوور نییە کتێبی ئەنواری مەزن دانراوی ئەم بێت. دەربارەی ژیانی ئەم یوسف بەگەیش جگە لەوەی مامۆستا بێتووشیی نووسیویەتی شتێکی دیمان لە دەستدا نییە و، جارێ ئەم گومانانە دەدرکێنین تا بزانین چۆن دەبێت و چی دەبێت.

لەم وتارەدا زیاتر لام لەو مامۆستایانە کردوەتەوە کە شوێنەواریان لە (د.ع)دا هەیە، چونکە بەدرێژایی مێژوو یوسف ناوی دیکەمان هەبووە و، هەریەکەیشیان لە دەور و سەردەمی خۆیدا شوێنەوار و دەوری کاریگەری هەبووە، بەڵام کە شوێنەوارەکان لە دەست ئێمەدا نەبن ئێمە چیی بکەین و بڵێین چی؟ بۆ نموونە مامۆستا (یوسف بن الملا عبدالجلیل الکردی الخضری الموصلی) کە لە ساڵی ١٢٤١ک دا کۆچی دوایی کردووە دوو دانراوی زانراوی هەیە:

١- الانتصار للأولیاء الأخیار.

٢- الاستشفا بأحادیث المصطفی[٢].

جگە لە مامۆستا مەلا یوسفی سالاریی و مامۆستا مەلا یوسفی دهۆکیی، مامۆستا مەلا یوسفێکی دیکەمان هەیە، بە یوسفی عەقراویی خۆی دەناسێنێ و، ئەم مامۆستایش یادگارێکی نەوازە و پڕ زانیاریی نایابی بۆ بەجێهێشتووین، ئەم مامۆستامان ساڵی ١٢٨٤ لە ژیاندا بووە، ئایا دەبێ پێوەندیی لەنێوان ئەم و ئەو دوو مامۆستاکەی دیدا هەبێت؟

لە بەرگی دووەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایاندا شتێکم دەربارەی دەستخەتێکی ئەم مامۆستا نووسیوە.

---

(١) (بڕوانە: البیتوشی. ص: ٨٧...).

(٢) بڕوانە: فهرس المخطوطات العربیة في مکتبة الأوقاف العامة في بغداد، الجزء الأول، ص: ١٨٨. وفهرس مخطوطات مکتبة الأوقاف الموصل، ج/٥، ص:١٠٥.

## چەند بازلییێکی دی

هەر لە (د.ع)دا ناوی چەند مامۆستای دی و شوێنەواریانم دیوە کە سەر بەهۆزی -یان ناوچەی- (بازلی)ن، لەم هەلەدا ناوی ئەوانیش تۆمار دەکەم بەڵکو سوودیان هەبێ:

١- لە کۆتایی دەستخەتی (٢٢٠١٤ د.ع)ەوە کە کتێبی (الصواعق المحرقة)یە نووسراوە:

(كتبت لأجل ملا عبدالله البازلي، المتوطن في قرية أسى).

لە کۆتایشیەوە نووسراوە:

(قد اشترى شريف بن محمود [سروسي!] هذا الكتاب المسمى بصواعق، من تأليفات احمد بن حجر من ابن ملا عبدالله المزبور بقروش واحد! في سنة تسع بعد الالف والمائة وثمانين، في ايام سلطنة اسماعيل پاشا في العمادية، ابن ابراهيم پاشا في العمادية، ابن زبيرخان الحاكم في بلدة زاخو في العمادية.

(٢- تمت النسخة الخلافية الواقعة بين الامامان(!) على يد أضعف الانسان وأحوج الى رحمة الرحمان، أعني به يوسف البازلي. في وقت الأحزان، من فراق المحب والاخوان، في قصبة السلماس. سنة أربع والف من الهجرة).

ئەمە لە کۆتایی دەستخەتی (٣٥١١٦ د.ع) وە نووسراوە.

٣- دەستخەتی (١/١٩٠٩٥)ش (شرح قواعد الأعراب)ە لەسەری نووسراوە: عەبدولعەزیزی کوڕی حامیدی کوڕی حاجی نەبیی کوڕی وەیسی کوڕی مەلا داودی بازلینی لە گوندی گەلاڵە لای مەلا داود و مەلا ڕەسووڵ ساڵی ١١٦٦ نووسیویەتیەوە.

٤- (٤٣٢٤١ د.ع) حاشیەی خەیاڵیی بەسەر شەرح عەقائیدەوە.

محەمەد نامورادی کوڕی حاجی عەبدوڕەحیمی بازلیی لە ڕەمەزانی ساڵی ٩٧٤دا نووسیویەتیەوە.

مامۆستا شێخ محەمەدی بازلیی حەمەویشمان هەیە، حاشییەی بەسەر (جمع الجوامع)ەوە هەیە پێش ئەوەی دەست لەم باسە هەڵگرم بەکورتیی ئاماژە بۆ دوو خاڵ دەکەم:

یەکەمیان: لە بەرگی چوارەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کوردا شیعری (بازلی)م

بڵاوکردەوە، بەڵام نازانم دەبێ شیعری یەکێک لەم (بازلی)یانەی ئێرە بێت، یان شیعری (بازلی)یەکی دی بێت؟

دووەم: لە سەرەتای ئەم وتارەدا ناوی مامۆستا مەلا یوسفی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای ناسراو بەمەلا زادەمان خوێندەوە، دوای نووسینی ئەم وتارە و لەم ماوەدا دەستخەتێک هات بۆ (د.ع) دانراوی مامۆستا (مەلا زادەی کوردی سۆرانیی)یە، جا نازانین دەبێ پێوەندیی لە نێوان ئەم دوو مامۆستادا هەبێ یان نا؟

## دەستخەتی بەندەنیجیی

٤٠٨

٥٢٧٧ د.ع

ئەم دەستخەتە کۆمەڵێک شیعر و بابەتی جۆراوجۆری مامۆستا مەلا عەلی بەندەنیجیی تێدایە بەم شێوە:

یەکەم: بەشێک لە دیوان و شیعرەکانی بەعەرەبی و کەمێکیشی بەفارسی.

دووەم: المناسك الالهية. ساڵی ١١٩٧ نووسراوەتەوە.

سێیەم: منظومة اسماء البدر. مێژووی دانانەکەی ساڵی ١١٦٧ھ.

دوای ئەمانە کۆمەڵێک حاشیەی صیبغەتوڵڵای تێدایە بەسەر چەند ئایەتێکی قورئانی پیرزەوە.

دوای ئەمانە و چەند شتێکی دی کتێبی (اتمام الدراية لقراء النقابة) دێت و بەمە دەستخەتەکە کۆتایی دێت، کە عەبدولقادری کوڕی سەیید طاهای موسڵی ساڵی ١١٦٨ نووسیویەتیەوە.

## هذه [ارجوة(!)] من كلام مولانا محي الدين الجزري

٤٠٩

پێشتر لە بۆنەگەلی جیاجیادا دەقی چەند ئیجازەی جۆراوجۆرم بڵاوکردووەتەوە، لەم هەلەیشدا ئەم دەقە بڵاو دەکەمەوە، بەهیوای ئەوەی تیشکێک بخاتە سەر ڕەوتی ڕێبازی ئیجازەی خوێندن و دەرسوتنەوەی مامۆستایانی کورد.

بسم الله الرحمن الرحيم

١/١٧٥٧٦

الحمدلله الذي تفرد وبالملك والجلال، وتنزة عن الاشباه والأمثال، وتفضل علينا بالهداية والصفات الكمال، وخلصنا من الضلال وسوء الفعال، والصلاة والسلام على نبينا محمد المنعوت بالأوصاف الحميدة وأحسن الخصال. وعلى اله وأصحابه خير صحب وآل.

اما بعد: فهذه أرجوة في بيان ما بلغنا من العلماء الذين نحن أخذنا العلم منهم من جهة ختم المادة. فاعلم يا أخي قد ختمت المادة بعون الله الملك العلام عند المشتهر في عصره، مولانا چلي الجزري، وهو من تلاميذ ملا محمد شروين، وهو من تلاميذ ملا احمد المجلى، وهو من تلاميذ ميرزا جان الشيرازي. وهو من تلاميذ ملا جمال الدين محمود الشيرازي، وهو من تلاميذ ملا جلال الدين الدواني، وهو من تلاميذ ملا محمد ايجي وملا علي ايجي الملقب ببركشادي [أو ببركشاوي] وملا محي الدين الكوشكناري. وهم من تلاميذ السيد شريف التلميذ لمولانا الأبهري، ثم أنتقل قدس سره بعد ختم المادة لتكرار شرح المطالع الى مولانا مباركشاه. وهما تلميذان من تلاميذ قطب الدين الرازي، وهو من تلاميذ العلامة الشيرازي، وهو من تلاميذ نصيرالدين الطوسي، والكاتب القزويني التلميذين لامام(!) فخر الرازي، وهو من تلاميذ محمد الغزالي، وهو في تلاميذ من تلاميذ امام الحرمين، وهو من تلاميذ والده. وهو من تلاميذ عبدالله بن أحمد القفال المروزي، وهو من تلاميذ ابن زيدويه احمد المروزي، وهو من تلاميذ الشيخ ابو اسحاق المروزي، وهو أخذ العلم عن قاضي أحمد بن عمر بن شريح عن الامام ابي القاسم الانماطي، عن الامام بن اسماعيل المزني. والربيع

المرادي، وكلاهما عن الامام المحقق محمد بن ادريس الشافعي، وهو أخذ العلم عن امام حرمل بن مسلم بن خالد بن زنجي(!) عن ابن جريج عن عطاء عن ابن عباس رضى الله عنهم، وعن امام حرم رسول الله مالك، عن نافع، عن ابن عمر، رضى الله عنهم كلاهما عن النبي صلى الله عليه وسلم وعلى آله وأصحابه والتابعين أجمعين.

كتبه عبدالله ابن الجلي لأجل ملا ابوبكر سنة ١٢١٣.

## سووچێکی مێژوویی حەیدەرییەکان

### دەربارەی حەیدەرییەکان

یەکەم: ئەوەی کە من لێرەدا کۆمکردوونەتەوە هەموو بەرهەمەکانی زانایانی ئەو بنەماڵە یان ئەو زانیاریانە نین کە دەربارەی ئەوان لە کتێبخانەی (دار العراق للمخطوطات)دان.

دووەم: ئەوەندە هەیە ئەم کارەی من جیاوازیی لە ڕووی چەند و چۆنیی زانیاریی دەربارەی ژیان و بەرهەمی ئەو بنەماڵە و زاناکانیانەوە هەیە؛ چونکە ئەو سەوچاوانەی - کە من دیومن و- تا ئێستە لەسەر زانایانی حەیدەرییان نووسیوە، بەزۆریی لایەنی پیاهەڵدان و ستایشکردنی توانا و پلەی زانیاریی ئەو زاتانەیان گرتۆتەوە و، بایەخێکی ئەوتۆیان بەچۆنیەتی ژیانیان و، ناوی بەرهەمەکانیان و، شوێنی ژیانیان و، ساڵی لە دایکبوون و کۆچکردنیان لە جیهان و، شتگەلی دیکە لەم بابەتانە نەداوە. وەک دەبینی لەم چەند لاپەڕەدا چەپکێک زانیاریی پەرتەوازەمان کۆکردووەتەوە، لەوانەیە زانیاریی دیکەیشیان وەسەر بخرێت و، لە ڕوویانەوە، مێژوویەکی پوخت و دروستتر لەسەر ئەم بنەماڵە بنووسرێت.

سێیەم: بەهۆی ئەوەوە ئەم بنەماڵە دوایی بەغدا جێگەیان بووە و لەوێ نیشتەجێ بوون بەشێکی باش لە بەرهەم و شوێنەواریان پارێزراوە و لە لەناوچوون قوتار بوون.

چوارەم: وا دەردەکەوێ کتێبەکانی ئەم بنەماڵە تا سەردەمی دەروێش ئەفەندیی حەیدەری پارێزراون، بەڵام دوای کۆچی دوایی ئەو -ئیستر لەبەر هەر هۆیەک بێت- کتێبەکانیان هەڕاج کراون و لە مەزاددا فرۆشراون و، لەسەر گەلێ دەستخەت دیومە نووسراوە کە لە مەزادی کتێبەکانی دەروێش ئەفەندی حەیدەریدا کڕاون.

پێنجەم: هۆی بڵاوبوونەوەی شوێنەوار و بەرهەمەکانی زانایانی ئەم بنەماڵە ئەوەیە خۆیان مامۆستای ناودار و زانای گەورە بوون و، هەر خۆیان -بەزۆریی- حاشیە و کتێبیان لە زانیارییە جۆراوجۆرەکاندا بۆ فەقێ و قوتابیانی خۆیان داناوە و، بەدەرس پێیان گوتوونەتەوە، واتە دانراوەکانیان هەر زوو بوون بەکتێبی (جادە - مەنهەج) بەرنامەی خوێندن و، فەقێیان دوای خوێندن و نووسینەوەیان شارە و شار و وڵاتە و وڵات بردوونیان و بڵاویان کردوونەتەوە.

لەناو زانایانی کورددا کەم بنەماڵە و کۆمەڵە زانا هەیە کە بەئەندازەی زانایانی حەیدەریی ناویان کەوتبێتە ناو ناوان و، شوێنەوار و بەرهەمەکانیشیان لە کتێبخانەکاندا جێگەیان بووبێتەوە و لەنگەریان گرتبێ. بۆیە تا ئەندازێک لەسەر زانایانی ئەم بنەماڵە نووسراوە و، لە سەرچاوەکاندا ناویان هەیە، ئێمە لەم دەرفەتەدا نامانەوێ بەدووپاتکردنەوەی ئەو نووسراوانەی پێشوەوە خۆمان خەریک بکەین و لاپەڕەیان پێ پڕ بکەینەوە، بەڵکو دەمانەوێ شتێکی نوێ بخەینە سەر ئەو باسانەی پێشوو، بۆ ئەم مەبەستەیش سەرچاوەگەلێکی نوێمان هەڵبژارد کە تا ئێستە دەستی لێکۆڵینەوە و لێکۆڵەرەوانیان پێ نەگەیشتووە. ئەو سەرچاوانە بەزۆریی دەستخەتی دانراوەکانی زانایانی ئەم بنەماڵەن کە -بەداخەوە نازانم بۆچی- پێشتر بایەخێکی ئەوتۆیان پێنەدراوە و، پیاوی وەکو ئیبراهیم فەصیحی حەیدەری کە خۆی زانایەکی ئەو بنەماڵە بووە کاتێ لەسەر زانایانی باوباپیری خۆی نووسیوە، ئەم لایەنەی پشتگوێ خستووە و، زیاتر خۆی بەپیاهەڵدان و وشەئارایی و ڕازاندنەوەی دیمەنەوە خەریک کردووە و، نەهاتووە لەپاڵ ناو و مێژووی ژیانی هەریەکێکیاندا دانراو و بەرهەمیشی چی هەبووە هەمووی تۆمار بکات، بێگومان مامۆستای فەصیح لە هەموو کەس باشتر ناو و ژمارەی بەرهەمەکانیانی زانیوە، هەروەها بێگومان فرەیشیانی لە دەستدا بووە و، توانیویەتی زۆر چاک و بەدرێژی لەبارەیانەوە بنووسێ، بەوەیش کە ئەم کارەی نەکردووە زیانێکی قەرەبوونەکراوەی لە مێژووی ئەم بنەماڵەیە داوە.

بەهەر حاڵ -ئێمە لەباتیی ئەو- پاش گەڕان و پشکنینێکی زۆر توانیمان سەر و سۆراخێکی، تا ئەندازێک باشی، گەلێ لە دانراوەکانی مامۆستایانی حەیدەری بکەین، جارێکی دیکەیش دەڵێینەوە بێگومان ئەمانەی ئێمە ناونووسیان دەکەین و شوێنەکانیان دیاریی دەکەین هەموو بەرهەم و، دانراوی مامۆستایانی ئەم بنەماڵە نین، بەڵام - وا ئەزانم - کەس پێش من ئەوەندەی کۆ و ناونووس نەکردووە و، بەم پێیەیش ئەمەی ئێرە

هەنگاوێکی نوێ و قۆناغێکی باشە دەبڕێت و، ڕوویەکی دیکەی ژیانی پیاوانی ئەم بنەماڵەیە لە سەرچاوەی دروست و دەوڵەمەندەوە تۆمار دەکرێت.

بەکورتیی من لەم چەند لاپەڕەدا بەزۆریی لا لە دانراوەکانی زانایانی بنەماڵەی حەیدەری دەکەمەوە و، ئەو ڕووە گەشەی ڕۆشنبیریی کوردستان -بەگوێرەی ئەو سەردەمە- لە ئاسۆی هەوڵ و کۆششی ئەو زانایانەوە ڕوون دەکەمەوە. جا ئەگەر لە پەنای ئەو دانراوانەیشدا مێژووگەلێکم دەست بکەوێت -کە دەستیشم کەوتووە و زۆریشم دەست کەوتووە- ئەوا بەگوێرەی ئەو مێژووانە هەڵە و نادروستییەک کە لە مێژووی ئەو زانایانەدا تۆمار کراوە ڕاست دەکەمەوە و، بەبەڵگەوە شێوە ڕاستەکە تۆمار دەکەم.

لێرەدا بەسەر ئەوەدا ناڕۆم کە مێژووی ژیان و بەرهەم و دانراوەکانی بنەماڵەی حەیدەری کەرەستەیەکی زۆر و، مادەیەکی دەوڵەمەندی لێکۆڵینەوەی زانستییەو، دەکرێ قوتابی ژیر و کارامە بەکاوەخۆ لە گەلێ ڕووی ئەم بنەماڵە بکۆڵێتەوە و، لەو ڕوانگەیشەوە فرە ڕووی کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیریی و ئابووریی و تەنانەت سیاسی و... تاد دەسنیشان بکرێت و، پەردە لە ڕووی گەلێ دیاردەی شاراوە و نەزانراوی ئەو سەردەمە و دوای ئەویش هەڵبماڵرێت.

لەم هەلەدا ئەوە دەڵێینەوە مێژووی سەدەها ساڵی دەیان زانا و مامۆستای پایەبەرز کە لە گەلێ شوێندا دەوریان بووە و، لە گەلێ وڵاتدا زانا و خوێندەواریان پێگەیاندووە و، دواجاریش بۆ ماوەیەکی زۆر بەکتێب و کەرەستەی خوێندن و زانیارییانەوە پاش ئەوەی هەواریان گواستوەتەوە بەغدا، زۆری پێنەچووە، ئەستێرەیان لە ئاسمانی زانیاریی بەغدادا درەوشاوەتەوە، فەقێ و مەلای بەغدا -کورد و غەیری کورد- بەهرەیان لە تیشکی ئەو زانیارییانە وەرگرتووە و، مەلا چاک و قازیی و موفتیی بەغدا بوون و، ئالای زانیاریی بەبڵندیی بەدەستی ئەوانەوە شەکاوەتەوە... زاناگەلێک ئەمە حاڵیان بووبێت و خۆیان مێژووی ڕەوتی ژیان و خوێندنی خۆیان نەنووسیبێت و، خەڵکی دیش ئەمەیان بۆ نەکردبن، ئێستە ئێمە -دوای تێداچوونی بەشێکی زۆری کەرەستەی نووسینەوەی ئەو مێژووە- دەبێ چیمان پێ بکرێت؟ وەک گوتم ئەمەی ئێمە لێرەدا کۆمان کردووەتەوە بەشێکی دییە لە کەرەستەی نووسینەوەی ژیانی ئەم بنەماڵەیە و، هیوابڕاویش نەبووین و، بەئومێدی ئەوەوە دەژین لەمەولا زیاتر و باشترمان دەست بکەوێت و، بتوانرێت وەک پێویست ژیانی مامۆستایانی ئەم بنەماڵە بخرێتە سەر لاپەڕەکانی مێژووی زانیاریی کورد و، لەناو مێژووی زانایانی جیهاندا جێگەی شیاوی خۆیان بدرێتێ.

## ئاڵۆزییەک لە مێژووی حەیدەرییاندا

لە زۆر کۆنەوە باوبووە - و ئێستەیش شوێنەواری ماوە - کە کاتێ کوڕ شانازیی بەباوکی خۆیەوە کردووە، کوڕی خۆی بەناوی باوکییەوە ناو ناوە، واتە گەلێ جار کوڕ بەناوی باپیری خۆیەوە ناونراوە، بۆ نموونە: ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەحمەد. جاری وایش هەبووە لە بنەماڵەیەکدا بەپانیی و درێژیی ئەم یاسا چاودێریی کراوە. دیارترین بنەماڵە ئەم یاسا و دیاردەم تێدا دیبێت بنەماڵەی حەیدەرییەکانە، کە دەگەڕێنەوە بۆ حەیدەری یەکەمی کوڕی محەمەد، لە پیاوە زانا و گەورە و ناودار و خاوەن دانراوەکانی ئەم بنەماڵەدا دەبینین ناوەکانی: حەیدەر و، ئەحمەد و، عەبدوڵلا و، صیبغەتوڵلا و، عوبەیدوڵلا... چەندین جار دووپات دەبنەوە، ئەم دووپاتبوونەوە، کە مایەی شانازیی و شانازیی پێوەکردنی نەوەکانی ئەو بنەماڵەیە، بۆ ئێمەمانان کە بمانەوێ لەسەر ژیان و بەرهەمیان بنووسین، بەبۆنەی ئەوەوە پێشتر و زوو لە سەردەمی خۆیاندا ژیانیان نەنووسراوە و، بەرهەمەکانیان جیانەکراوەتەوە، ئێستە ئاڵۆزیی و سەردەرگومیی ڕوویداوە و، بەگەلێ ئەرک و دەردی سەریش بەرهەمەکانیان بەدروستی لە یەک جیا ناکرێنەوە و، ناتوانین وەک پێویست بەرهەمی هەرکەسێکیان بدەینەوە بەخاوەنەکەی؛ چونکە گەلێ جار ناوی دانراوێک دەبینین لەسەری نووسراوە ئەحمەدی کوڕی حەیدەر، یان صیبغەتوڵلا، یان عوبەیدوڵلا، ئەمانەیش هەموو یەکەم و دووەمیان هەیە و، نازانین بەدروستی دانراوەکە بدەینەوە پاڵ کام ئەحمەد، یان کام صیبغەتوڵلا یان...

## شەجەرەی حەیدەرییەکان

بەگوێرەی ئەوەی باوە و بیستراوە و نووسراوە ڕشتەی بنەماڵەی حەیدەرییەکان -هەروەها صەفەوییەکانیش- دەچێتەوە سەر ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام مووسای کاظم، کە گۆڕی پیرۆزی لە گوندی تەکیەی قەرەداغدایە و، گەلێ ڕشتەی دیکەیش دەچنەوە سەر ئەم ذاتە و بەکوردستاندا بلاوبوونەتەوە.

ئەمە لە گەلێ سەرچاوەدا تۆمار کراوە و-وەک گوتمان- ئێمە ناگەڕێینەوە بۆ وتنەوە و کاوێژکردنەوەی ئەو زانیارییە کۆنانە بێ ئەوەی شتی نوێی بخەینە سەر. مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە (بنەماڵەی زانیاران)دا[١]

(١) بروانە: بنەماڵەی زانیاران. ل: ٢٢٤.

لەسەر ئەم بنەماڵەی -تا ئەندازێک- بەدرێژیی نووسیوە و شەجەرەی نەسەبیشیانی نووسیوە، بەڵام لە (د.ع)دا شەجەرەیەکمان بینی کە لە عاصیمی کوڕی ئیبراهیمەوە دەستپێدەکات هەندێک جیاوازیی لەتەک ئەو شەجەرەدا هەیە کە مامۆستا تۆماری کردووە، بۆیە لێرەدا ئەو دەقی شەجەرەیش تۆمار دەکەین، بەڵکو لە یەک بدرێن و، بەلێکۆڵینەوە ڕاستییان دەربخرێت.

شەجەرەکە لە عاصیمی کوڕی حەیدەرەوە دەستپێدەکات و بەم شێوەیە: «عاصم بن ابراهيم بن حيدر بن احمد بن حيدر بن محمد بن حيدر بن پيرالدين بن علاءالدين بن صدرالدين بن موسى الشيخ صفي الدين ابو الفتح اسحاق بن الشيخ امين الدين بن جبرائيل بن الشيخ الصالح ابي بكر بن قطب الدين بن صلاح الدين رشيد بن محمد الحافظ بن عوض بن فيروزشاه بن محمد شاه بن شرفشاه بن محمد بن حسن بن محمد بن ابراهيم بن جعفر بن محمد بن اسماعيل بن محمد بن احمد الاعرابي بن ابي محمد القاسم حمزة بن امام الهمام موسى الكاظم رضى الله تعالى عنهم اجمعين.

از منقول مدون تأريخ هفت اقليم كتبت من خط عاصم».

## کتێبخانەی حەیدەرییەکان

ئەوەتەی کتێبخانان دەگەڕێم و، شوێنەوار و دەستخەتی مامۆستایان و زانایانی کوردم دیوە، بەسەریەکەوە بەئەندازەی پاشماوە و شوێنەواری بنەماڵەی حەیدەری لە کتێبخانەیەکدا دەستخەت و کتێبم نەدیوە. دوایی کە سەرنجی سەرچاوە و شوێنی ئەم دەستخەتانە و، ئەو دەستانەی دواجار ئەم دەستخەتانەیان دیوە و لەوانەوە گەیشتوونەتە (د.ع)، دەبینین ئەم شوێنەوارانە لە پەرتەوازەیی و ئاوارەییەکی زۆرەوە گەییونەتە(د.ع) و، هەر چەند دانەیەکیان لای زەلامێک و لە کتێبخانەیەکەوە هاتوون، وا دیار نییە باش پارێزرابێتن و، شوێنێکیان بۆ تەرخان کرابێت.

ئەوەی سووسەی بەڵگەیەکی لێوە بکرێت ئەوەیە کە بەشی زۆری کتێبەکانی ئەم بنەماڵە دەستاودەست و پشتاوپشت گەیوەتە دەست دەروێشی حەیدەری، بەڵام دوای خۆی کتێبەکانی هەڕاج کراون و، هەرکەسێک چی بەدڵ بووبێت - بەنرخی پیاز و کەمتریش!- بۆ خۆی کڕیویەتی و بردوویەتی.

ئەمەیش یەک دوو بەڵگەی ئەم قسە:

دەستخەتی ژمارە (٥٠٨٨ د.ع) کە (المحاكمات)ە دانراوی ئەحمەدی کوڕی حەیدەرە

لەسەری نووسراوە:

«قد اشتريته من مزاد درويش افندي الحيدري بثلاثين غروشا.

انا الحقير أحمد الناجي رئيس محكمة بدايت بغداد... سنة ۱۳٦۰!»

لەسەر دەستخەتی ژمارە (۷۰۷۸ د.ع) کە (خيالي)یە و محەمەد شەریفی کوڕی مەلا مەحموودی کوڕی مەلا محەمەد ساڵی ۱۲۰٦ نووسیویەتیەوە، ... نووسراوە کە محەمەد ڕەشید ساڵی ۱۳۰۷ لە مەزادی کتێبەکانی محەمەد دەروێش ئەفەندیی حەیدەری کڕیویەتی...

**مەدرەسەی ماوەران:**

ئەوەی دەربارەی گوندی ماوەران بیسراوە و کەمێکیشی لەسەر نووسراوە، ئەوەیە ئەو گوندە ماوەیەکی زۆر مەڵبەندێکی زانیاری گەورە بووە و، زانکۆیەکی باڵای کەموێنەی کوردستان -و بگرە گەلێ ناوچەی جیهان- بووە، بەڵام گەلێ جار بەر چەپۆکی چەرخی چەپگەرد کەوتووە و، لەوە دەچێت داری بەسەر بەردیەوە نەمابێت و، دوایی سەرلەنوێ بنیاتنرابێتەوە، وەک لە وتاری (بیرەکەی ماوەران)[1]دا ئاماژەم بۆ کردووە.

هەروەها ئەوەیش زانراوە کە زانایانی ئەم بنەماڵەیە هاتوونەتە بەغدا و لەوێ جێگیربوون و، دەوری کاریگەریان لە ڕەوتی ڕۆشنبیریی بەغدادا دیوە و، گەلێ جار موفتێتی و سەرۆکایەتی زانیاری بەغدا لە دەستی زانایانی ئەو بنەماڵەیەدا بووە. بەڵام ئایا دوای بارکردن و گواستنەوەی بارگەی زانایانی ئەو بنەماڵەیە بۆ بەغدا گوندی ماوەران چی بەسەر هاتووە؟

لە دەستخەتی ژمارە (٦۱۳۸ د.ع)وە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە زانایانی حەیدەری ماوەیەک دوای ئەو کۆچ و بارە ئەو گوندەیان چۆڵ نەکردووە و، زانا و مامۆستایان لەو شوێنەدا ماونەتەوە و زانا و مامۆستا و مودەڕیس بوون. دەستخەتەکە کۆمەڵێک دانراوە لە مەنتیقدا مستەفای کوڕی ئەحمەدی زەهاویی[2] [هەندێ جاریش لەباتی زەهاو (دیجاب) دەنووسێ] لە مانگی (ربيع الثاني)دا ساڵی ۱۲۲۳ لە گوندی ماوەران لای مەولانا محەمەد ئەفەندی کوڕی مەولانا فەزلوڵڵا ئەفەندی حەیدەریی نووسیویەتییەوە.

---

(۱) بڕوانە بەرگی چوارەمی ئەم کتێبە، ل: ۳۲٦.

(۲) ئەم مامۆستا برای محەمەد فەیضی -موفتی- زەهاویی بووە.

**سەرچاوەگەلێک دەربارەی حەیدەرییەکان:**

مامۆستایانی حەیدەریی بەبۆنەی ئەوەوە دەوری دیار و کاریگەریان بووە لە گەشەپێدانی خوێندن و ڕۆشنبیریدا و، ژمارەی زۆریان لەوەدا نەبووە بشارێنەوە یان ون بن و، پەلیان بۆ گەلێ ناوچەی عێراق و جیهان کوتاوە و، گەییبنە هەر شوێنێک زوو ناو و شۆرەتیان بەدەوری خۆیاندا بڵاوبووەتەوە... کەم تا زۆر لەسەریان نووسراوە و، ناوی هەندێکیان کەوتووەتە سەر لاپەڕەکانی مێژوو و، ئەو ناوانە دەستاودەستیان پێکراوە و لەگەلێ سەرچاوەدا دەبینرێت، بەڵام نەئەو ناوانە ناوی هەموو زانایانی بنەماڵەی حەیدەریین و، نە ئەوەیش کە لەسەریان نووسراوە بەئەندازەی ئەو زانیاریی و خزمەتانەیانە کە پێشکەشی گەل و وڵات و ئەو ناوچانەیان کردووە کە تیایاندا بوون.

وەک چەند جاری دیش گوتوومە بەداخەوە زانایانی خودی بنەماڵەکەیش کە لایەکیان لە مێژووی ژیان و بەسەرهات و ڕەوتی ڕۆشنبیری زانایانی بنەماڵەکە کردووەتەوە لا کردنەوەکەیان، نە وەک پێویست و شیاوی ئەو زانایانە بووە و، نە لە ئاستی قەوارە و بارسایی ژمارە و ئەندازەی زاناکانیان و ئەو خزمەتانەیاندا بووە، کە پێشکەشیان کردووە و، بەمەیش زیانی گەورەی قەرەبوو نەکراوە لە مێژووی زانیاریی بەگشتی و مێژووی بنەماڵەی حەیدەریی بەتایبەتی کەوتووە.

ئێمەیش چەند هەوڵمان داوە و چەندیش هەوڵی زیاتر بدەین نە ئەتوانین ئەو مێژووە بەدروستیی و وەک پێویست بنووسین و، نە دەیشتوانین قەرەبووی ئەو زیانە بکەینەوە کە لە مێژووەکەمان کەوتووە!.

لەم بوارەدا گەشتێکی بچووک بەو ڕەنجانەدا دەکەین کە لەم بوارەدا دراون و، نموونەیان لێ وەردەگرین لەتەک ڕێنومایییکردنی خوێنەردا بۆ لای سەرچاوەکان:

مامۆستا ئیبراهیم فەصیحی حەیدەریی لە (عنوان المجد)ەکەیدا لەپاڵ ئەوەدا کە ناوی هەندێک لە مامۆستایانی بنەماڵەکەیان و چەردەیەک لە ناوی قوتابیی و دانراوەکانیانی تۆمار کردووە دەفەرموێ: تەرجەمەی هەموو زانایانی ئەم بنەماڵە و دانراوەکانیان لێرەدا جێگەیان نابێتەوە و بەرگێکی سەربەخۆی دەوێت و، ئەو زانایانە دەگەنە سێسەد زانای خاوەن دانراو و کتێب و، ناوی هەندێکیان و هەندێک لە دانراوەکانیانم نووسی، تا خوێنەر و تەماشاکەر پلە و پایەبەرزیی ئەم بنەماڵە و خانەوادە بزانێت و، بزانێت خزمەت و هەوڵیان لە چ ئاستێکدا بووە...

هەر لێرەدا ناوی ئەو زانایانە تۆمار دەکەین کە مامۆستا ئیبراهیم ناوی بردوون و شێوەی نووسینەکەیشی لەسەر یەک دووانێکیان دەگوێزینەوە ئێرە و، وەک گوتوومانە دەیڵێینەوە: مامۆستا ئیبراهیم لای لە مێژووی ئەو زانایانە وەک مێژوونووس نەکردووەتەوە و، لەناو ئەو هەموو زانادا لەسەری نووسیون و لێرەدا دەیانخوێنیتەوە مێژووی لەدایکبوونی یان کۆچی دوایی کەسیانی نەنووسیوە!

ئەمە یەکێک لەو مامۆستایانەی لەسەری نووسیون:

یەکێک لەوانەی بەخزمەتی گەیشتم و گوتن و نووسین بەژماردنی ڕەوشت و خوە بەرزەکانیدا ناگەن، ئەسعەد سەدرەدینی موفتیی حەنەفیی لە بەغدا، کوڕی زانای پایەبەرز عەبدوڵلای حەیدەریی بەغدادیی کە لە پیاوە بەڕێز و خاوەن شکۆ و کەموێنەکان بوو، لەلای والیی بەغدا گەیشتبووە پلەیەک کەسی ناگاتێ و، گوێی لە قسە و تانەی کەس نەبوو، چل ساڵ لەسەر یەک دەرسی عەقلّی و نەقلّیی گوتووەتەوە و، نزیکەی هەشتا ساڵ ژیاوە و، گەلێ لە زانا ناودارەکان لەلای خوێندوویانە، لەوانە:

حاجی داود پاشای والیی بەغدا، پێش ئەوەی کاری وەزارەت بگرێتە دەست، حەڤدە ساڵ سەرومڕ لە خزمەتیا خوێندوویە تا لە هەموو هاوەڵەکانی پێشکەوتووە.

یەکێکی دی لەوانە باوکم بوو -خودا لێی خۆش بێت- زانیاریی لەو و لە زانایانی دیکە وەرگرت و، باوکم لە پیاوچاکان و بەڕێزان بوو، هیچی لە دنیا نەدەزانی، خەڵک هەموو خۆشیان دەویست. ساڵانێکی زۆر موفتیی شافیعییەکان بووە لە بەغدا، نزیکی نەوەد ساڵ ژیاوە.

هەروەها زانای بەڕێز عەبدوڵلای کوڕی زانای پایەبەرز غیاثەدینی حەیدەریی بەغدادیی، ئامۆزای باپیری ناوبراوم، زانیاریی لێ وەرگرت و لەلای خوێندی، چونکە کە غیاثەدین مرد عەبدوڵلای کوڕی شیرەخۆر بوو ئەو پێی گەیاند و پێی خوێند و کردی بەزانا.

هەروەها لەوانەی لەلای زانای ناوبراو خوێندوویانە زانای بەتوانا مستەفا (علقبند)ی نائیبی بەغداد.

هەروەها سەلمانی سوێدیی بەغدادیی.

هەروەها زانای گەورە و لێکۆڵەرەوە مستەفای خۆرانیی کوردیی.

هەر لەو زانایانە زانای پایەبەرز صیبغەتوڵلای کوڕی زانای گەورە ئیبراهیمی کوڕی زانای گەورە خاوەنی حاشیە بەسەر خەیاڵیەوە باوکی باپیرم عاسیمی حەیدەریی.

هەروەها زانای بەتوانا محەممەدی قەلەوی مووسڵیی.

هەروەها زانای وەلی و زانای مەعقوول و مەنقوول مامم عوبەیدوڵڵای حەیدەریی نەقشبەندیی بەغدادیی موفتیی حەنەفیە لە بەغدا.

هەروەها زانا و ئەدیبی بەتوانا عەبدولقادر صدیقی بەغدادیی.

هەروەها زانای پایەبەرز و بەڕێز محەمەد سەعیدی بەغدادیی موفتیی حەنەفییە.

هەروەها زانای بلیمەت عەبدئاغای تۆپاڵی کوڕی محەمەد ئەمین ئاغای بەغدادیی.

هەروەها زانای پیاوچاک حاجی ئیدریس ئاغا.

هەروەها زانای ئەدیب سەلیم بەگ.

هەروەها لەوانەی لەسەر دەستی زانای ناوبراودا فێری زانیاریی بوون مەحموود پاشای کوڕی عەبدوڕەحمان پاشای کوردیی بلباریی.

هەروەها زانای بەتوانا و پیاوچاک ئەحمەدی زەندیی کوردیی.

هەروەها زانای شاعیر محەمەد ئەسعەدی عوثمانیی کەرکووکی ناسراو بەنائیب زادە.

هەروەها زانای بەڕێز عەبدولغەفووری کەرکووکی.

هەروەها زانای بەڕێز عومەری ئەربیلی.

هەروەها زانای پایەبەرز عەبدولعەزیزی شەوافی بەغدادیی.

هەروەها ئەدیب عەبدولغەنی جەمیلی موفتیی حەنەفییە لە بەغدا.

هەروەها زانای دانای مەنقوول و مەعقوول محەمەد ئەمینی حیللی موفتیی حیللە... و گەلێکی دیکەیش کە لەبەر زۆرییان لێرەدا جێگەیان نابێتەوە، ئەمانە هەموویان زانیارییان لە باپیری ناوبراوم وەرگرتووە.

هەروەها باپیرم گەلێ دانراویشی هەیە لەوانە:

١- حاشیەی بەسەر (تحفه المحتاج)ی ئیبنوحەجەری هەیثەمیی مەککییەوە، دادوەریی تێدا کردووە لە نێوان ئەو زانایانەدا حاشیەیان بەسەر توحفەوە هەبووە و، توانیویەتی داگری کارەکانیان بێت و لێیان بکۆڵێتەوە.

٢- حاشیەی بەسەر حاشیەی عەبدولحەکیمی هیندیی بەسەر خەیاڵییەوە.

٣- حاشیەی بەسەر حاشیەی زانای گەورە لیقانیی میسریی بەسەر شەرحی عیززیی تەفتازانییەوە لە سەرفدا.

٤- حاشیەی بەسەر حاشیەی قەرەباغییەوە لە مەنتیقدا.

٥- حاشیەی بەسەر حاشیەی طەحاوی بەسەر (الدر المختار)ەوە.

٦- شەرحی لەسەر (لغز)ی بەهائیی کە داگری چەند زانیارییە.

هەروەها چەند تەعلیق و حاشیەی دیکەی بەسەر کتێبەکانەوە.

ئەم زاتە تاقانەی چەرخی خۆی بوو، یەکێک بوو لەوانەی لەڕووی زانیاریی و کردەوەی باش و ڕێز و تێگەیشتن و چاکە و خێرومەندیی و بەخشندەیی و... پەنجەی بۆ درێژ دەکرا.

زۆر منی خۆش دەویست، نۆ ساڵ پەروەردەی کردم قورئانی پێ وتم، چونکە ئەو ماوە باوکم لە بەغدا دووربوو، لە چیاکانی کوردستان بوو بۆ فێربوونی زانیاریی.

بەم شێوە مامۆستا ئیبراهیم فەصیح کاتێ ناوی باوباپیران و مامەکانی دەبات باسی ڕێز و پایەی خوێندەوارییان دەکات و، ناوی حاشیە و تەعلیقات و دانراوەکانیان دەنووسێ. بەڵام بەلای ئەوەدا ناچێت کە بڵێ: فلان باپیرەی، یان فلان مام و ئامۆزای، کەی لەدایکبوون، چ ساڵێک کۆچی دواییان کرد.

هەروەها لێرەدا جێگەی سەرنج و سەرسووڕمانە کە دەڵێ: باوکی نۆ ساڵ لە چیاکانی کوردستاندا خەریکی خوێندن و فێربوونی زانیاریی بووە، یەکێک دوای ئەوەی ببێ بەخاوەنی ژن و منداڵ و ماڵی بەیەکەوە نابێت، نۆ ساڵ لە بەغداوە هاتبێت بۆ کوردستان بۆ فێربوونی خوێندن دەبێ خوێندن چ برەوێکی بووبێت لەو سەردەمەدا؟ دەبێ کوردستان چ کۆڕ و کۆمەڵێکی خوێندنی تێدا بووبێت؟ مامۆستایەک کە باوک و باپیر و خاڵ و مام و ئامۆزای هەموو کەڵەمەلای بەغدا بووبن، بەسەر ئەوانەدا هاتبێ بۆ کوردستان دەبێ کوردستان چ مەڵبەندێکی خوێندەواریی بووبێت؟

خۆزگە مامۆستا ئیبراهیم فەصیح ناوی چەند مامۆستایەکی لەو مامۆستایانەی کوردستان بۆ بنووسیایەین کە باوکی زانیاریی لێ وەرگرتوون!

لێرەدا کە باسی زانایانی ئەم بنەماڵە دەکەین هەموو ئەو باسانە ناگێڕینەوە کە مامۆستا ئیبراهیم فەصیح نووسیونی؛ چونکە کتێبەکەی لەدەستدایە و کاتی خۆی چاپ بووە و، ئێستەیش ئافرەتێک خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبەیە لە زانکۆی سەلاحەدین لە هەولێر، بەڵام بۆ دەرخستنی ڕووی پرشنگداری پیاوانی ئەم بنەماڵە هەندێک لەو زانایانە دەنووسین کە مامۆستای فەصیح ناوی بردوون:

١- ئەحمەدی حەیدەریی ناسراو بەمەلای گەورە.

٢- ئەحمەدی ناسراو بەگەورە کوڕی عەبدوڵلای حەیدەریی.
٣- ئیبراهیمی کوڕی صیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عاصیمی حەیدەریی.
٤- ئەسعەد سەدرەدینی موفتیی حەنەفییە، کوڕی عەبدوڵلای حەیدەریی.
٥- ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.
٦- فەتحوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.
٧- عاصیمی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.
٨- فەزلوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.
٩- سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.
١٠- ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.
١١- ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.
١٢- عەبدوڵلای کوڕی حەیدەر.
١٣- ئیبراهیمی کوڕی محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدولغەفووری موفتیی شافیعیی.
١٥- حەسەنی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی حەیدەر.
١٦- شەهابەدینی حەیدەریی.
١٧- سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عاسیم.
١٨- عوبەیدوڵلای حەیدەریی موفتیی حەنەفییە.
١٩- عەبدولحەلیمی مامی ئیبراهیم فەصیحی حەیدەریی.
٢٠- عەبدولقادر سدیقی مامی ئیبراهیم فەصیح.
٢١- عەبدولوەهابی حەیدەریی.
٢٢- عەبدولعەزیزی حەیدەریی برای عەبدولغەفوور .
٢٣- عەبدوسەلامی حەیدەریی.
٢٤- عەبدولغەفووری کوڕی محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدولغەفوور.
٢٥- عەبدوڵلای کوڕی غیاثەدینی ئامۆزای باپیری ئیبراهیم فەصیح.
٢٦- عوبەیدوڵلای موفتیی حەنەفییە لە بەغدا، مامی ئیبراهیم فەصیح.
٢٧- عەبدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلای باوکی باپیری [باپیرە گەورەی] ئیبراهیم فەصیح.
٢٨- عەبدولعەزیز کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٢٩- عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٣٠- خدری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٣١- عەبدوڵڵای کوڕی غیاثەدین.

٣٢- حەیدەری کوڕی ئەحمەدی (خاوەنی المحاکمات).

٣٣- عومەری کوڕی ئەحمەد.

٣٤- محەمەدی کوڕی ئەحمەد.

٣٥- خالیدی کوڕی ئەحمەد.

٣٦- عەباسی کوڕی ئەحمەد.

٣٧- حسەینی کوڕی ئەحمەد.

٣٨- عەبدوڵڵای کوڕی سیبغەتوڵڵا.

٣٩- غیاثەدینی کوڕی سیبغەتوڵڵا.

٤٠- محەمەد ئەمینی کوڕی سیبغەتوڵڵا.

٤١- حەیدەری کوڕی سیبغەتوڵڵا.

٤٢- محەمەدی کوڕی خدری حەیدەریی.

٤٣- محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدوڵڵای حەیدەریی، موفتیی شافعییە لە بەغدا.

٤٤- محەمەد دەروێشی کوڕی محەمەد ئەمینی خوشکەزای ئیبراهیم فەصیح.

٤٥- محەمەدی کوڕی خدری کوڕی (محمد الاخرس).

٤٦- محەمەدی کوڕی حسەینی کچەزای ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٤٧- (محمد الاخرس)ی کوڕی خدر.

٤٨- محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی غیاثەدین

٤٩- محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدلغەفووری موفتیی شافیعییە لە بەغدا.

٥٠- نیعمەتوڵڵای کوڕی عاسیمی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

٥١- عوثمانی کوڕی عاسیمی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

٥٢-ساڵحی حەیدەریی مامی ئیبراهیم فەصیح.

٥٣- ئەسعەدی حەیدەریی.

٥٤- عەبدوسەلامی حەیدەریی.

**سەرچاوەیەکی دی:**

یەکێکی دی لەوانەی دەربارەی بنەماڵەی حەیدەریی نووسیویەتی و، دەکرا زۆر چاکی بنووسێ و، بەڵام ئەمیش هەروەک ئیبراهیم فەصیحی کردووە و، دیارە ئەو چەرخ و کاتە ئەو شێوە نووسینە باوبووە و، کەمتر گوێ بەلایەنی مێژوویی دراوە و، وشەئارایی زاڵبووە بەسەر لایەنەکانی دیدا و، ئەمیش لەو ڕچە و ڕێبازە لای نەداوە... مامۆستا عوثمان ئەفەندیی (الدفتري الموصلي العمري)یە کە لە کتێبی (الروض النضر في فضلاء العصر)دا باسی کردوون.

وا دیارە زەلامێک هاتووە بەشی زانایانی حەیدەریی لەو کتێبە دەرهێناوە بەم ناونیشانەی خوارەوە:

«تراجم علماء السادة الحيدرية قدس الله أرواحهم الطاهرة الزكية. منقولة من كتاب الروض النضر في فضلاء العصر، لعثمان افندي الدفتري الموصلي العمري عليه الرحمة. وهو من جملة الكتب الموقوفة في المدرسة المرجانية ببغداد».

لە (د.ع)دا بەژمارە ٣٣٥٨٣ پارێزراوە.

مامۆستای عومەریش هاوچەرخی گەلێک لە زانایانی حەیدەریی بووە و، پێوەندی پتەوی بەزۆریانەوە هەبووە و، نامە لە نێوانیاندا ئاڵوگۆڕ کراوە و، لە بۆنەی جیاجیادا یەکتریان بەدیدەنی و نامە بەسەر کردۆتەوە، بۆیە ئەم مامۆستا بەڕێزەیش دەیتوانی بەتێروتەسەلیی لەسەر زانایانی ئەم بنەماڵە بنووسێت و، مێژووی ژیانیان و، شێوەی خوێندنیان و، مامۆستایانیان و، قوتابیانیان و، ئیجازە وەرگرتنیان و، ئیجازەدانیان بەفەقێیانیان و... گەڕان و سەردانیان لە وڵاتان و حەج و زیارەتەکانیان و... چەندین لایەنی دیکەیشی بەمتمانەوە بەدروستیی و لەسەرخۆ شیی بکردایەتەوە، بەڵام بەداخەوە ئەمیش ئەو ڕێبازەی تێک نەداوە و، ئەم لایەنانە هەموویان بوون بەقوربانی وشەئارایی!!

لەم دەرفەتەدا گوڵبژێرێک لە کاری ئەم مامۆستایش دەکەین و، ناوی ئەو مامۆستا حەیدەرییانەی لێ وەردەگرین کە ناوی هێناون و، باخچەی زانایانی حەیدەرییان پێ دەڕازێنینەوە و، یەک دوو دەقیش وەک خۆیان لە شوێنەواری ئەو مامۆستایانە دەگوێزینەوە ئێرە. لەپێشدا دەبێ ئەوە بڵێم: ئەم دەستخەتە هەشتا لاپەڕەیە و، بەزۆریی بۆ زانایانی بنەماڵەی حەیدەریی تەرخان کراوە و، ناوی دوو سێ مامۆستای دیکەی کوردی وەک: مامۆستا مەلا عەبدوڵلای بێتووشی و، مامۆستا مەلا ئیبراهیمی بەرزنجیی تێدایە.

ئەم دەستخەتە کراوە بەسێ بەشەوە:

بەشی یەکەمی ئەو ناونیشانەی بەسەرەوەیە کە ڕابورد.

بەشی دووەمی لەسەری نووسراوە:

ترجمة العالم العلامة والفاضل الفهامة السيد صبغة الله افندي الحيدري، فقلا من مطالع السعود في مناقب الوزير داود، تأليف العالم الفاضل الشيخ عثمان ابن سند النحوي البصري، عليه الرحمة.

ئەم بەشە لە لاپەڕە ٣١وە تا لاپەڕە ٤٤ دەگرێتەوە. لە کۆتایی ئەم بەشەوە نووسراوە کە محەمەد سەعید لە ٢٤ی سەفەری ساڵی ١٣٢٠دا نووسیوویەتیەوە.

لەسەر بەشی سێیەمی نووسراوە:

تراجم السادة العلماء الحيدرية نقلا من كتاب أصفى الموارد في أحوال مولانا خالد النقشبندي قدس سره. تأليف الفاضل الكامل الأديب الشيخ عثمان ابن سند النحوي البصري، عليه الرحمة والرضوان.

ئەم زانیارییانە -وەک دیارە- لە دانراوەکانی مامۆستا عوثمان کوڕی سەنەد وەرگیراون و جیاکراونەتەوە، بەڵام نازانین کێ جیای کردوونەتەوە، دەردی وشەئارایی بارێکی گرانە بەسەر ئەم زانیارییانەوە و، گرانیی ئەم بارە هەلی تۆمارکردنی زانیاریی وردی دەربارەیان لەبار بردووە.

لێرەدا ئەو ناوانە تۆمار دەکەین لەم دەقانەدا هاتوون لەتەک زانیاریگەلی بەسوودا کە لێیان وەردەگیرێت:

١- حەیدەری گەورە.

٢- ئەحمەدی کوڕی حەیدەری خاوەنی (المحاكمات).

٣- حەیدەری کوڕی ئەحمەد (حەیدەری دووەم).

٤- ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٥- عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەر بەگەنجیی مردووە.

٦- حەسەنی کوڕی عەبدوڵڵا. بەخوداپەرستیەوە خەریک بووە.

٧- ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر. عوثمانی کوڕی سەنەد لەلای خوێندوویە و، (ملهمات) و شەرحی (بانت سعاد)ی نووسیویەتیەوە.

٨- ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر. شیعری فارسیی زۆر بەرزی هەبووە، کتێبێکی هۆنراوەی فارسیی هەبووە، ناوی ناوە: (نبات وخرما). هەروەها شیعری عەرەبیی زۆر جوانی هەبووە، نموونەی لێ وەرگرتووە.

٩- سیبغەتوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر. مامۆستا عوثمانی کوڕی سەنەد بەشانازییەوە لە خزمەتیدا خوێندوویە، لەو کاتەدا دایکی مامۆستا سیبغەتوڵڵا کۆچی دوایی کردووە ئەم بەپارچەیەک شیعری عەرەبیی تەعزیەی لێ کردووە.

١٠- فەزلوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

١١- فەتحوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر: مامۆستا عوثمان کوڕی سەنەد لە خزمەتیا خوێندوویە و، لێیەوە فێری شیعر و ئەدەب بووە.

مامۆستا عوثمان دەفەرموێ: مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا بەگەنجیی کۆچی دوایی کردووە، شوێنەواری بەبایەخی هەبووە، پەخشان و شیعری بەرزی لێ بەجێماوە.

مامۆستا عوثمان نامەیەکی ئەدەبیی بەرزی نووسیوە، دەڵێ: مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا بەبۆنەی کۆچی دوایی یەکێک لە کوڕەکانیەوە بۆی ناردووە. ئەمەیش هەندێک لەو تەعزیەنامە:

«یا باریَ الثقلین، ویا خالق الكونين، نحمدك على الوجود بين العدمين، أمتنا اثنتين. وأحييتنا اثنتين، منك الحياة واليك الرجوع في الممات. أنت المغير للقلوب، وأنت المنزه عن الشكوك والهبوب، دلّت بوحدانيتك سلسلة الموجودات، وتقطعت بعظمتك جملة الكائنات، أنت الشاهد في السّرائر، ولا يشاهدك أولو البصائر، وأصلّي وأسلم على من شرفت به بقعة الإمكان والإيجاد. وصار علة غائية لعالم الكون والفساد (!) وعلى آله وصحبه أجمعين ما خلق الإنسان من ماء وطين.

وبعد: فنخص بالأدعية المستجابة، والأثنية المستطابة، والتحياة الفاخرة، والتسليمات الضافرة، حضرة النجيب اللبيب الأفخم، وجناب الحبيب النسيب الأكرم. أمثل الأماثل، وأفضل الأفاضل، سلالة الشرف، محي ذكر السلف، بكري الإخاء، عمري الوفاء، عثماني الحياء، عليّ المضاء، بضعة الأدب، فلذة الشرف والحسب. طود الوقار، علم المجد والفخار، الأخ الأمجد الأكرم، والأديب الأسعد المكرم، العمري النسيب المحترم.

إثر ذا: فالمعروض الى الجناب الشريف، والمنهي إلى النادي المبارك المنيف، أنه من حين برهة من الزمان، ووايقات[1] من أعصر وأوان، أنقطعت بيننا المراسلات والكتب، بعد أن كانت تنهمل انهمال السحب، فصرنا نتفحص عن أحوالكم من كل وارد ونازل، ونستخبر عن أخباركم من كل راحل وواصل، اذ يسمعنا بحادثة ملأت بأكدارها السفول والحزون، فإنا لله وإنا إليه راجعون. وذلك أن مخدومكم النجيب، وولدكم الحسيب، قد ارتحل من عالم الناسوت والأشباح، ورجع الى عالم الملكوت والأرواح، وذلك لأنه لما كان معصوماً عن الأفعال الردية، متثل سهلة أمره تعالى: يا أيتها النفس المطمئنة ارجعي الى ربك راضية مرضية، فانقبض القلب بهذه الداهية العظمى، وكاد أن ينقطع لهذه المصيبة الكبرى. فما الحيلة يا ابن أمّي والآيات لنزول مثل هذه المصائب مؤكدة؟ والأحاديث لوجودها موطدة، يدرككم الموت ولو كنتم في بروج مشيدة؟ وإذا جاء أجلهم لايستأخرون ساعة ولايستقدمون. فإنا لله وإنا إليه راجعون. فنشكر الله على جميع الأحوال، إذ هو المقدِّر للأعمار والآجال، فالأحسن والأولى والأليق والأحرى أن تتأسوا بما قبلكم، ولا تأسفوا على ما فاتكم، وعليكم، وتدفعوا الكدر والآلام، فإن كل من عليها فان، ويبقى وجه ربك ذو الجلال والاكرام.

وهذه عادة الدنيا وشيمتها

فمن مضى وبقى من سائر الامم؟

فلا تقابل هذه المصيبة إلا بالشكر، ولا دواء لهذه البلية ما عدا الصبر، فنسأل الله الكريم، أن يديمكم(!) سائر مخاديمكم الكرام، ويجعل سلسلة أولادكم وأحفادكم غير منقطعة بين الأنام».

ئەم دەقەم لێرەدا لەبەرئەوە نووسی کە لەناو مامۆستایانی حەیدەریدا هیچ شوێنەواری ئەم مامۆستام نەدیوە و، دانراوی لە دەستدا نییە.

مامۆستا عوثمانی کوڕی سەنەد وەڵامی ئەم نامەی مامۆستا مەلا فەتحوڵلای بەپارچەیەک شیعری ٥٣ بەیتی داوەتەوە و، لە دوای ئەم نامەوە تۆماری کردووە.

١٢- عاسیمی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

١٣- ساڵحی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

---

(١) ڕەنگە (وأويقات) ڕاست بێت.

١٤- عەبدولغەفووری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر. مامۆستا عوثمان دەربارەی ئەم زاتەیش دەڵێ: مامۆستام بوو، زۆری لێ فێربووم و، زۆر لە کۆڕیدا دانیشتم. بەڵام بەداخەوە بەگەنجیی سەری نایەوە و، ئەو هەموو زانیارییەی لەتەک خۆیدا بردە ژێر گڵ!

١٥- خدری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

١٦- عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

١٧- عەبدولعەزیزی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

١٨- شەهابەدین کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

١٩- محەمەد کوڕی خدری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٢٠- عەبدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

٢١- حەیدەری کوڕی سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

٢٢- عیسا غیاثەدین کوڕی سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر.

لە کۆتایی ئەم تەرجەمەوە نووسراوە: نووسینەوەی ئەم نوسخە لە ١٠ی شەعبانی ١٣٢٥دا تەواوبوو.

٢٣- سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەد.

لە ماوەران لای باوکی خوێندوویە، شەجەرەی نەسەبی و، زنجیرەی مامۆستایانی ئیجازەی تۆمار دەکات. لە دەقەکانی دیدا دەڵێن:

زەینەدینی بەلاتیی، لێرەدا دەڵێ: زینەدینی هەکاریی. دوای تەواوکردنی خوێندن و ئیجازە وەرگرتن چووەتە بەغدا و بووەتە کۆڵەکەی ئەو بنەماڵە بەرزە لەبن نەهاتووە لە بەغدا.

پاش پیاهەڵدانێکی زۆری مامۆستا سیبغەتوڵلا نامەیەکی دەنووسێ کە ئەو بۆ ئەحمەد پاشای وەزیری بەغدای نووسیوە. دواتر پارچەیەک شیعری درێژی مەلا حەسەنی عەشاریی کە لە پیاهەڵدانی مامۆستا سیبغەتوڵلادا دایناوە تۆمار دەکا، دوایی دەڵێ: لە اصفی الموارددا بەدرێژیی لەسەریم نووسیوە. دوای ئەمانەیش باسی چەند کەسێک لەو فەقێ و مەلایان و والییانە دەکات لەسەر دەستیدا فێری خوێندن بوون.

محەمەد سەعید ٢٤ی سەفەری ١٣٢٠ ئەمەی نووسیوەتەوە.

دوای ئەم باسە ئەو ناونیشانە دێت کە پێشتر نووسیمان کە دەڵێ:

«تراجم السادة العلماء الحيدرية نقلا من كتاب (اصفى الموارد) في أحوال مولانا

خالد النقشبندي، قدس سره. تأليف الفاضل الكامل الأديب عثمان بن سند النحوي البصري...».

لێرەدا جارێکی دی دێتەوە سەر باسی سیبغەتوڵلای ناوبراو وە لە (اصفی الموارد)ا نووسراوە و، زۆری بەشیعر و پەخشان پیا هەڵدەدا، دواتر دەڵێ: لە سەردەمی وەزارەتی ئەحمەد پاشادا پاش ئەوەی خوێندەواریی لە بەغدادا مردبوو ئەم زیندووی کردەوە ، کەڵکەڵەی ولات کەوتە مێشکی و گەڕایەوە بۆ زێدی خۆی و، لەوێ جارێکی دی وەک مانگ لەناو ئەستێرەکاندا درەوشایەوە، تا پاش مردنی ئەحمەد پاشا گەڕایەوە بۆی بەغدا و، لە جاری پێشوو زیاتر لە هەموو لایەکەوە شەیدایانی خوێندن و فێربوون ڕوویان تێ کرد و، لە جاری پێشوو باشتر برەوی بەدەرسوتنەوە و بووژاندنەوەی زانیاریی دا و، بەو شێوەیە مایەوە تا لە بەغدا کۆچی دوایی کرد و، زانایان بۆی گریان و فرمێسکیان بۆ ڕژان و، قەڵەمان بۆ شیوەنی ڕەنگی سوور و ڕەشیان ڕشت و، مامۆستا عوثمان خۆیشی بەقەسیدەیەکی بەرز بەشداریی ئەو شیوەنەی کردووە.

٢٤- عوبەیدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلای ناوبراو. دوای پیاهەڵدانێکی زۆری توانا و زانیاریی و پیاوچاکیی و پیاوەتیی و... دەڵێ: گەورە و سەردار و ناودارانی بەغدا شانازییان بەوەوە دەکرد لێی نزیک ببنەوە و، عەبدوڵلا بەگی کوڕی شاوی حیمیەریی کچی خۆی پێشکەش کرد، تا بەهرە لە بنەماڵەی حەیدەریی بەرێت. کوڕگەلێک لەو کچە کەوتنەوە هەریەکەیان نموونەیەکی خوێندەواریی و خوداپەرستیی بوون و، لەمەولا باسیان دەکەم.

خەڵکێکی زۆر لە دەریای خوێندەواریی ئەو بەهرەمەند بوون، لەوانە شێخ عەبدولفەتاح و، شێخ مووسای کوڕی سومەیکەی بەغدادیی مەلای مزگەوتی مەرجان و، شێخ ئیبراهیمی بەرزنجەیی مامۆستای مزگەوتی گەیلانیی... و کەسانی دیکە».

ئەم زانا مەزنە وەک باوکی نووسیویە و بەگوێرەی دەستخەتی (٥١١٢ د.ع) لە شەوی هەینی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١١٨٨دا لە دایک بووە ، دواییش دەڵێ: دۆعاکەی باوکی گیرا بووە کە دۆعای بۆ کردووە خودا بیکا بەزانای پیاوچاک و نووسیویە:

«اللهم اجعله من الصالحين العاملين، واحفظه من العاهات والبليات بجاه محمد سيد المرسلين. وذلك في سنة ١١٨٨ ، وقد نال من العمر ثلاثة وسبعين، والحمدلله قد استجيبت دعوته في حق ولده. اللهم اجعلنا ممن تستجاب دعوته.

حررته في ١٢٧١. فقد توفي الولد العزيز المشار اليه في سنة الف ومائتين واحدى وستين في شهر جمادي الاولى بعد الجمعة، وقت الصلاة».

ئەم مامۆستا وەک نووسرا ١١٨٨ لە دایک بووە و، ١٢٦١ کۆچی دوایی کردووە.

ئەم محەمەد دەروێشە لە شوێنێکی دیکەی دەستخەتەکەدا نووسیویە:

«انا الفقير اليه عز شأنه محمد درويش الحيدري، وقد حررت هذه الطليعة بعد الاولى في دار السلطنة قسطنطينية سنة ١٢٩٩ حين صممت على العودة الى بغداد بعد أن سكنتها خمس سنوات ونصف».

٢٥- محەمەد ئەسعەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیم:

دەڵێ: ئەم زاتە لای باوکی خوێندنی تەواو کردووە و، هەر بەلاویی پیاو بووە و، هەر بەگەنجیی مەرد بووە و، هەر زوو پیاوان و قوتابیان لە دوورەوە هاتوون بۆ کۆڕی دەرسی و لە خزمەتیدا بەچۆکا هاتوون بۆ فێربوونی زانیاریی، باوکی لەسەری ١٢٠٠دا کۆچی دوایی کردووە.

لە ڕێگەی شام و قودسەوە حەجی کردووە، کە گەییوەتە شام گەورە و بچووک بەسەریدا داباریون، بەوپەڕی ڕێزەوە تینوانی زانیاری لە دەریای زوڵاڵی بەهرەمەند بوون.

کە گەیشتووەتە مەدینەی پیرۆز و زیارەتی مەرقەدی پیرۆزی پێغەمبەری کردووە خەڵک وەک هەنگ تێی ورووژاون و، ویستوویانە بۆ ماوەیەکی کەمیش بێ لەو کۆی زانیارییە بەهرەمەند بن، کە بەرەو مەککەی پیرۆز بەڕێ کەوتووە بەگریانەوە شوێنی کەوتوون و لێی پاڕاونەتەوە سەریان لێ بداتەوە. کە چووەتە مەککەی پیرۆز بەهەمان شێوە شەیدایانی زانیاریی و حەدیث و ریوایەت لێی گردبوونەتەوە و داوایان لێ کردووە ببێ بە (امام الحرمين)، بەڵام ئەم گەڕانەوەی بۆ وڵاتی خۆی هەڵبژاردووە و کە حەجی بەجێ هێناوە لە ڕێگەی بەسرەوە گەڕاوەتەوە. کە گەیشتووەتە بەسرەیش بەشێوەی شوێنانی دی جێگەی ڕێزی زانایان و پیاوماقووڵانی بووە و، ئەوپەڕی پێشوازییان لێ کردووە، دوایی میوانداریی لەلایەنی شێخ ئەحمەدی کوڕی دەروێشی کەوازییەوە لێ کراوە.

مامۆستا شێخ عەلی کوڕی محەمەد سەعیدی سویدیی -کە مامۆستا عوثمانی کوڕی سەنەد زۆری لە خزمەتیا خوێندووە و چەند ئیجازەی لێ وەرگرتووە -هاوڕێ و هاودەمی مامۆستا مەلا محەمەد ئەسعەدی حەیدەری بووە. لە بەسرەیش مامۆستا حەیدەریی مامۆستا مەلا عەبدوڵلای بێتووشی بینیوە و، لە کۆڕ و دیوەخانی شێخ ئەحمەدی کەوازیدا

دانیشتنیان بووە، بەڵام بەداخەوە درێژەی ئەو کۆڕانە و، ئەنجامی ئەو دانیشتنانە نەزانراون و لە دەستدا نین!

٢٦- عوبەیدوڵلای کوڕی عوبەیدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر:

دوای پیاهەڵدانێکی زۆری ئەمیش بەپەخشان و بەشیعر، مامۆستا عوثمان دەفەرموێ: لە لاوییدا بەدیداری شاد بووم، باش نەمدەناسی، بەڵام بلیمەتیی و پیاوەتیی و ڕەوشتبەرزی لێ دەتکا. ساڵی ١٢٣٣ پارچەیەک شیعری جوانم بۆ نارد، بەشێخ عەبدولقادر ئەفەندیی برایدا وەڵامی دامەوە.

٢٧- عەبدولقادری کوڕی عوبەیدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر:

مامۆستا عوثمان خۆی ئاسایی بەمیشدا هەڵدەدا بەجۆرێ لەوە جوانتر نەگوترێ، تا دەفەرموێ: ساڵی ١٢١٤ بینیم. دوای ستایشێکی زۆری ڕەوشتی بەرزی دەڵێ: دووجار کرا بەقازیی بەسرە. جاری یەکەم لە فەرمانڕەوایی سەعید پاشادا قازییەک بوو مایەی شادیی و کامەرانیی خەڵکی شارەکە بوو، کە داوود پاشا فەرمانی گرتەدەست، نەک لەبەرئەوەی عەبدولقادر ئەفەندیی خۆش نەوێ بەڵکو لەبەرئەوەی لێیەوە نزیک بێت، قازیێتیی لێ وەرگرتەوە. چەند مانگێکی بەسەربرد، بەسرە هەمووی بۆی بەداخ بوون. دوایی قازیێتیی پێ دایەوە، کە گەڕایەوە بۆ بەسرە ڕۆژی گەڕانەوەی جەژنی ئەو شارە بوو. پێش ئەو قازییم نەدیوە سەرجەمی خەڵک بۆ لادانی لەسەر کار خەفەتبار بن و، نەمزانیوە دەتوانرێ ڕەزامەندیی سەرجەمی خەڵک بەدەست بێت.

کە بۆ جاری یەکەم قازیی بەسرە بوو بەچەند پارچە شیعر و قەسیدە ستایشم کرد و، لە چەند کۆڕ و کۆمەڵدا گفتوگۆم لەتەکدا کرد، ساڵی ١٢٢٨ دیدەنیی کردم، ئەو دیدەنییەی بەپارچەیەک شیعر باس کردووە.

ساڵی ١٢٢٩ قەسیدەیەکی لە ستایشیدا گوتووە.

ساڵی ١٢٣١ پارچەیەک شیعری بۆ ناردووە دوای ئەوەی بەڵێنی ئەوەی داوەتێ بیخاتە سەر مزگەوتێک و کەمێک بەڵێنەکەی دواکەوتووە.

ساڵی ١٢٣٢یش مامۆستا عوثمان پارچەیەک شیعری بۆ ناردووە، داوای کۆمەکی لێ دەکات دژی گەلێکی ستەمکار.

قازیی ناوبراو لە کاتی دانان و تەواوکردنی ئەم کتێبەدا قازیی بەسرەیە و، قازییەکی بەڕێز و ناودارە.

٢٨- عاسیمی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر:

دەربارەی ئەم مامۆستا جگە لە پیاهەڵدان و ستایشی ڕێز و زانیارییەکانی ئەوەندە دەڵێ: کە لە ماوەراندا بووە و لەوێ خوێندوویە.

**سەرچاوەیەکی دیش:**

دەستخەتی ژمارە (١٢٥٩٦ د.ع)ش بەشێکی لە مێژووی زانایانی حەیدەری تێدایە.

دیارە ماوەیەک لەلای خوالێخۆشبوو مامۆستا عەباس عەزاوی بووە، چونکە لەسەر لاپەڕەی یەکەمی بەخەتی ئەو نووسراوە:

«تأريخ الحيدرية: مقتبس من مؤلفات كثيرة، فهو عبارة عن مقتطفات معتمدة على مصادر معروفة ومذكورة».

بەشێکی لەو خەتە دەچێت کە دەستخەتی ژمارە ٣٣٨٥٣ی پێ نووسراوەتەوە، لە چەند جێگەدا -لێرە- نووسەرەوەکەی ناوی خۆی نووسیوە کە ناوی محەمەد ئەمینی حەیدەرییە.

سەرەتای ئەم بەشە بەوە دەستپێدەکات کە لە کتێبی (شمامة العنبر والزهر المغبر)ی محەمەد ئەفەندیی غولامیی وەرگیراوە و، یەکەم کەس کە ناوی هاتووە سیبغەتوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەرە. لێرەشدا زۆر -بەوشە ئاراییەوە- بەشان و باڵی مامۆستا سیبغەتوڵڵادا هەڵدەدا.

لێرەدا چەند پارچە شیعری چەند شاعیریش دێنێ کە لە پیاهەڵدانی مامۆستای ناوبراودا گوتراون. لەناو ئەوانەدا کە لە ستایشی سیبغەتوڵڵادا شیعریان گوتووە ناوی محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدولغەفووری کوڕی محەمەد ئەسعەدی حەیدەریی دێت.

دوای ئەمانە پارچەیەک شیعری ئەدیب حەیدەری کوڕی ئیبراهیمی حەسەنیی حسەینیی لە ستایشی پێغەمبەردا (د.خ) دێت.

دوای ئەمە مەتەڵێک دێت کە وا دیارە داهێنەرەکەی لە بنەماڵەی حەیدەریی بێت، بەڵام دیاری نەکراوە کێیە، لە هەمان لاپەڕەدا وەڵامی ئەو مەتەڵە دراوەتەوە، وەڵامەکەیش کە هەڵهێنانی مەتەڵەکەیە، لەلایەنی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەری حەیدەرییەوەیە.

دوای ئەمـانەیش پارچەیەک شـیـعـری عـەبدولقـادری کـوڕی عـوبەیدوڵلای کـوڕی سیبغەتوڵلای حەیدەریی دێت کە بۆ داود پاشای والیی بەغدای نووسیوە.

دوا بەدوای ئەمـەیش پارچەیەک شیـعـری بەرزی مـحـەمـەد جەوادی کـوڕی مـحـەمـەد زەینەدینی حەسەنیی (سیـاهپۆش) دێت، کـە بەبۆنەی کۆچی دوایی مـحـەمـەد ئەسعەدی حەیدەرییەوە لە ساڵی ۱۲٤۳دا گـوتوویەتی. پارچە شیـعـرەکە بەزمانی عـەرەبییـە و، ٥٤ بەیتە.

ئەوەی لەم دەستـخـەتەدا جێگەی سەرنجـە چەند پارچە پەخـشـان و شیـعـری مـامۆسـتـا عـوبەیدوڵلای جێگری مـەولانا خـالیـد و کـوڕی عـوبەیدوڵلای کـوڕی سـیـبـغـەتوڵلای حەیدەرییە، ئەم پەخشان و شیعرانە لە قاڵبێکی ئەدەبی بەرزدا و، بەسۆز و جۆشێکی دڵ و دەروونی شەیدای پێغەمبەرەوە (د.خ) و، بۆ لای ڕەوزەی پیرۆزی نووسراون و نێرراون.

لێرەدا کەمێک لە کۆتایی یەکێک لەو نامانە بەنموونە دەهێنمەوە:

«وقد تجاسـر العبـد الفقيـر، على هذا التـحرير، اغـترارا بحلمك، وطمعاً في شفـاعتـك، لنا في الدنيـا بأن يحـفظني الله ووالديّ وإخـوتي من شـر كل طارق وحاسد، ومكر كلِّ عدقٍ معاند، وأن لايشمت بنا الحساد والأعداء، وأن يعيشنا عـيش السعداء، وأن يرعـانا بعينه التي لا تنام، ويحمينا بحماية كنفه الذي لا يرام، وأن يمتـعنا بما أنعم بـه علينا من الايمان والاسـلام، والجـوارح والحطام، وأن لايجعل لأعدائنا علينا سبيـلا، على مرّ الأيام، وفي الآخرة بأن يحشـرناالله في زمرتك، ويوردنا نعمتك، ويسبقنا بكأسك حسن الاختام(!) وصلى الله تعـالى عليك وعلى آلك وأصـحابك يـا رسـول رب العـالمين، ويا شـفـيع المذنبين، وآخـر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين».

ئەم نامانە ٦ شەش نامەن و ١٥ لاپەڕەی دەستخەتەکەیان گرتووەتەوە.

دوای ئەم نامـانە پارچەیەک شیعری شێخ مـحـەمـەدی (الدليژي) دیارە دێلێژەییـە -کە بەداخەوە نازانین کێیـە- لە ستایشی مامۆستا عوبەیدوڵلای خەلیفەی مەولانا خالید و کوڕی عوبەیدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلادا گوتوویە نووسراوە. پارچەکە ۲۷ بەیت شیعرە.

هەر لەم دەستخەتەدا پارچەیەک شیعری جوانی مامۆستا عەبدولحەلیمی کوڕی مامۆستا عوبەیدوڵلای کوڕی مامۆستا عوبەیدوڵلای کوڕی سیبغەتوڵلای حەیدەریی دەخوێنینەوە کە لە پیـاهەڵدانی عـوبەیدوڵلای باوکیـدا گـوتوویەتی و پیـرۆزبایی لێ کردووە کـە پلەی بەرز کراوەتەوە بۆ موفتێیەتی.

دوا بەدوای ئەمەیش پارچەیەک شیعری (عبدالغفار الاخرس)ی شاعیری عەرەبیی لە پیاهەڵدانی مامۆستا عوبەیدوڵلادا دەخوێنینەوە، ئەم پارچە شیعرە ٦٦ بەیتە.

دوای ئەمەیش پارچە شیعرێکی ٣٩ بەیتیی لە ستایشی هەمان مامۆستادا دەخوێنینەوە، بەڵام خاوەنی ئەم پارچە دیاری نەکراوە.

دوا بەدوای ئەمەیش حەسانی قادووش پارچەیەک شیعری لە پیاهەڵدانی مامۆستای ناوبراودا گوتووە، ٢٢ بەیتە.

دوای ئەمەیش نامەیەکی مامۆستا سیبغەتوڵلای حەیدەریی نووسراوە کە بۆ ئەحمەد پاشای وەزیری بەغدای نووسیوە. هەر بەدوای ئەمیشدا نامیلکەیەکی مامۆستا سیبغەتوڵلای حەیدەریی دێت کە لە باسی تاعووندا نووسیویە.

دوای ئەمانەیش نامەیەکی بەرزی مامۆستا ئیبراهیم فەصیحی حەیدەرییە کە لە وەڵامی نامەیەکی ئەحمەد بەگی حیمیەریی بەغدادیی ناسراو بەشاویی زادەدا ناردوویە، کاتێ لە بەغدا بووە. نامەیەکی درێژی جوانە بەپەخشان و شیعر و بەتەواوبوونی ئەم نامەیش دەستخەتەکە تەواو دەبێت.

**زانایانی حەیدەریی و داغستان:**

زانایانی حەیدەریی وەک لە ماوەران و بەغدادا بەتایبەتی و، لە عێراقدا بەگشتیی خزمەتی فراوان و جێگەی سەرنجی زانیارییە باوە جۆراوجۆرەکانی سەردەمی خۆیان کردووە و، شوێنەوارەکانیان لەوانە زیاترن بتوانین بەسەرژمێریاندا ڕابگەین... لە شوێنانی دیکەی جیهانیشدا بڵاوبوونەتەوە و، خزمەتی زانیاریی پیشە و ڕێبازیان بووە لە هەر لایەکدا بووبن.

چەند جار لە ناوی حەیدەرییەکاندا و لەپاڵ ناوەکانیاندا نازناوی یان نیسبەتی (داغستانیی)م دەبینی، بەڵام نەمدەزانی ئەم ناوە لەچییەوە هاتووە و، هەندێ جار گومانم بۆ ئەوە دەچوو کە ئەمە کاری هەڵەی نووسەرەوە بێت.

تا ڕۆژی ٢٠٠٣/٣/١ مامۆستا (تاهیر حەیدەریی) هات بۆ دیدەنیم بۆماڵەوە -ماڵی ئاوابێت لەتەک تەمەن زۆریی و ناجۆریی تەندروستیشیدا هەمیشە ئەو منی بەسەر دەکردەوە- باسی باوباپیرانی و زانایانی حەیدەریی هاتەوە ناو و فەرمووی: لە مام ناسیحم بیستووە چەند کەس لە باوباپیرانمان چوون بۆ ئەفغانستان و داغستان و، ماوەیەک لەوێ ماونەتەوە، دوایی لێیان گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و، چوونەتەوە ماوەران و

لەویَ داوای بەش و بارەی خۆیان لە زەویوزار کردووە، ئەوانیش پێیان وتوون: ئێوە داغستانین و بەشتان بەماوەرانەوە نەماوە!

جا یەکێک لەو زانایانە کە ئەو نیسبەتەی پاراستووە و لە نووسینەکانیدا بەکاری هێناوە ضیائەدین حەیدەری کوڕی عەبدوڵڵای داغستانییە، وەک لە دەستخەتەکانی ژمارە ٤٢٦١ و ٢٦١٦٨ی (د.ع)وە وەردەگیرێن.

عەبدوڵڵای باوکیشی جگە لە داغستان چووەتە ئەزهەر و ماوەیەک نازانین چۆن بووە لەویَ ژیانی بەسەربردووە. وەک لەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە.

**زانایانی دیکە:**

مامۆستا ئیبراهیم فەصیح لە (عنوان المجد)دا دەڵێ: زانایانی ئەم بنەماڵەیە - ئەوانەیان دانراویان هەیە- دەگەنە ٣٠٠ سێسەد زانا، بەڵام ناوی هەندێکیان و هەندێک لە دانراوەکانیانمان نووسی.

ئەو زانایانەی مامۆستا فەصیح نووسیونی کەمن و، دانراوەکانیشیان کەمترن، ئێمەیش ئەوەی ئەو لەو سەردەمەدا بەو هەموو کەرەستەوە بۆی نەکراوە، لەم سەردەمە دوور لەو سەردەمەوە و بێ کەرەستەییەوە ناتوانین ئەنجامی بدەین، بەڵام هەرچیمان دەست بکەویَ تۆماری دەکەین. لەوانە:

* دەستخەتی ژمارە (٥٧٥٢ د.ع) کە (مختصر تكملة التصريف)ی مامۆستا یوسف جانە، محەمەد سادقی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر ساڵی ١٢٠٦ لە شاری سنە نووسیویەتیەوە.
* دەستخەتی ژمارە (١٥٥١٦ د.ع) کە کتێبی (عبدالله يزدي)یە محەمەد نامورادی کوڕی مەلا تاها ئەفەندی حەیدەری ساڵی ١٣١٨ لە شارۆچکەی عەقرە نووسیویەتیەوە.

## زاناکانی حەیدەریی و بەرهەمەکانیان

### ئەحمەدی کوڕی حەیدەری یەکەم

٤١٠

لە سەرەتای خوێندن و فەقێتیمەوە گوێم بەناو و شۆرەتی زانایانی بنەماڵەی حەیدەری پڕ بووە و، ڕۆژ بەڕۆژیش زیاتر ڕێز و پلەی زانیاری زانایانی ئەم بنەماڵەم بۆ ڕوون بووەتەوە. بەڵام -وەک دەڵێن- بیستن شتێکە و بینین شتێکی دیکەیە. تا نەکەوتبوومە گەشتوگوزاری ناو دەستخەتەکانی (دار العراق للمخطوطات) هەرچەند بیستبووم زانایانی ئەم بنەماڵە پتر لە (٣٠٠) ساڵ -بێ پسانەوە- سەرومڕ خزمەتی زانیارییە جۆراوجۆرەکانی ئیسلامییان کردووە... نەمدەزانی قەوارە و بارسایی بەرهەم و ڕەنجی مامۆستایانی حەیدەری لە چ پلەیەکدایە.

بەڵێ لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا کە لە کتێبخانەی ناوبراودا گەڕاوم و دەستخەتم بینیوە، دەستخەت و بەرهەم و بەری ڕەنج و کۆششی هیچ کەسێکم نەدیوە کە شان لەشانی بەرهەمی حەیدەرییەکان بدات، یان بەپەرێز و جاریاندا گوزەر بکات.

بۆیە گەلێ جار ئاواتی ئەوەم خواستووە و بەکردەوە و ڕێنوماییش هەوڵم داوە کە قوتابییەکی زیرەک و کارامەی لای خۆمان ئەم مەبەستە (دەوری حەیدەرییەکان لە خزمەتکردنی زانیاریدا) بکات بەنامەی ماجستێر یان دوکتۆرا و، هەوڵی مەردانە بدات بۆ لادانی پەردە لەسەر ڕووی گەش و پرشنگداری زانایان و مامۆستایانی حەیدەری و، بەرهەم و ڕەنج و کۆششیان بخاتە ڕوو. بەڵام تا ئێستە کەس بەدەنگمەوە نەهاتووە.

جا کە ئەم ئاواتەم نەهاتەدی و کەس بەدەنگمەوە نەهات، ناکرێ خۆیشم هەروا بێدەنگ بم و شتێک -با کەمیش بێت- بەشتێ نەکەم. لەبەر ئەمە وام بەباشزانی لە چەند وتارێکدا، بەگوێرەی دەرەتانی ئێرە، لا لە چەند مامۆستایەک لە مامۆستا بەڕێزەکانی ئەم بنەماڵە بکەمەوە و، بەگوێرەی ئەوەی لە (دار العراق للمخطوطات)دا لە زانیاری کۆمکردوەتەوە چەند تیشکێک بخەمە سەر هەندێ لە بەرهەم و لایەنی ژیانی مامۆستایان و، ناویان بدەم بەگوێی خوێنەراندا، بەڵکو سا یەکێک هیمەتی مەردانە بکات و، زیاتر ئەو لایەنە زێڕینانە دەربخات و، لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بنەماڵە بنووسێت.

یەکـەم پیـاوی ئەم بنەمـاڵە کـە لەسـەری دەنـووسم و بەرهەم و دانراویم لە دەسـتـدایە ئەحمەدی کوڕی حەیدەرە، کە بەئەحمەدی یەکەمیش ناسراوە.

بەڵام پێش ئەمە ئەوە تۆمار دەکەم کە مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای قەڵاتێ لە هەولێر بۆی نووسیم[1]: کە حەیدەری یەکەم - باپیرە گەورەی حەیدەرییەکان - ساڵی ١٠٤٦ کۆچی دوایی کردووە و، لەم بارەیشەوە یەک بەیتی فارسیی بۆ نووسیم، کە مەصرەعی دووەمی بەگوێرەی حسابی ئەبجەد ساڵی کۆچی دوایی مامۆستای ناوبراو دەردێنێ و، ئەمەیش بەیتەکەیە:

فلک فـوجی ملک گفتـه اند

رفت علم عـمل از عـالم وا

دەبێ پێش ئەوەی ناوی دانراوەکـان و نموونەیان بخـەینە ڕوو بەسـەر ئەوەدا نەڕۆین کـە نوسخەکانی دانراوەکانی مامۆستایانی بنەماڵەی حەیدەری ئەوەندە زۆرن لە دەرفەتی وەک ئێرەدا لەوانەیە سەرژمێرکردنیشیـان لە وزەدا نەبێت، بەڵام هەرچۆن هەیە بەگوێرەی توانا هەوڵ دەدەین ناوی دانراوەکـانی هەر یەکێک لەو مـامۆستـایانە بەجیا تۆمار بکەین و، هەریەکەی چەند دێڕێکیشیـان لێ بخەینە ڕوو، بەم کارە دەتوانین خزمەتێکی بچکۆلە بەو مـامـۆسـتـایانە بکەین و، دەسـتی خـوێنەر و لێکۆڵەرەوەیش بۆ لای شـوێنی دانراوەکـان ڕابکێشین، بەڵکو لەمەولا هەوڵی زیاتر و باشتریان بۆ بدرێت.

١- ٩٩٠٦ رسالة غسل القدمين

سەرەتاکەی:

«بسم الله الرحمن الرحيم الحمدلله رب العالمين. والصلاة على نبيه محمد وعلى آله وصحبه أجمعين. فهذه نبذة من الأفكار، وزبدة من الأنظار، جمعها العبد الفقير الى الله الغني، أحمد بن حيدر الشافعي، لدفع أبحاث الشيعة، المتعلقة بغسل الرجلين بالتماس بعض الإخوان في الدين، والمحب على اليقين، مولانا محمد الخطيب بجامع عقرة، هدانا الله وإياه الى تحقيق ما هو الحق والصواب.»

کۆتاییەکەی:

«والثـاني، انـهم سلمـوا أن الكعـبين عبـارة عـن العظمين الثـانـيين [كـذا، وربما

(١) مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا ئەم نامەی لە ٦/ ١٠/ ٢٠٠٢دا بۆ نووسیوم.

الناتئين] من جانبي الساق، إلا انهم التزموا أنه يجب أن يمسح ظهور القدمين الى هذين الموضعين...»

ژمارە ۲۸۱۳۹یش نوسخەیەکی نایابی دیی ئەم کتێبەیە.

دەستخەتی (۲/۲۲۱۰۲ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی نامیلکەی (غسل القدمين) و کۆتاییەکەی ئاوایە:

تمت الرسالة المؤلفة في رد الشيعة في المسح على الرجلين على يد اذل الطلاب [دەستێکی چەپەڵ ناوەکەی سڕیوەتەوە!] سنة ۱۱۷٦، اول يوم من رجب بكرة يوم سبته، بعيد مراجعته من حديقته وبستانه، الموقوفة عليه، وأكل اول ما يبدو نضيجاً قليلاً من تيناته الريحانية والاحمرية، حادي عشر اربعينها، ومجيء خبر مراجعة الوزير عمر پاشا من معسكر الحرب مع الاعراب وظفر بهم، وتواتر تهنئة محمد خان پاشا والي الولايات مثل [ماوتي!] سليمان پاشا منها عليها للذهاب الى بغداد، وتوقع سائر البكزادات لولاياتهم. والامور بخواتيمها.

دەستخەتی ژمارە ۳/۱۲۷۵۳ د.ع ش نوسخەیەکی دیکەی (غسل القدمين)ە، مصطەفای کوڕی محەمەدی کوڕی مصطەفا ساڵی ۱۱۱۵ لە گوندی بەرۆڕە نووسیویەتیەوە.

۲- ۵/۲۱۰۹٤ مسألة في الطلاق

سەرەتاکەی:

«وبعد: فهذه فائدة مهمة أفادها أحمد بن حيدر الكردي الشافعي الحسين آبادي»

کۆتاییەکەی:

«تمت الرسالة لأفضل المتأخرين أحمد بن حيدر على يد أحقر الطلبة محمد صالح»

شایانی باسە ئەم مەسئەلە یەک پەڕەیە لە دەستخەتێک کە بەشی زۆری باسی تەڵاقی کوردان دەکات و، ناو بەناو لەناو باسەکاندا دێڕ و دوو دێڕ بەکوردیی دەنووسرێت، ئەم دەقانە بۆ لێکۆڵینەوەی زمان و زاراوەی کوردی سوودی زۆریان هەیە. بۆ نموونە لە دەقێکدا مامۆستای حەیدەری دەفەرموێ:

«تەڵاقم بە سێ تەڵاقە دەکەفتەبن (او) تەڵاقی دەفلانوکی لە منی تەناسەن بە سێ تەڵاقە کەفتەبن (او) یەکی (او) دوو (او) هەر سێ تەڵاقی دە فلان کەسی ژەنی مەن [ئەمە بەپێی ئەوەی سەر و بۆر بۆ نووسینەکە کراوە.].

٣- ٢/١٥٤٢٦ هذه رسالة لأحمد بن حيدر القديم في أشراط الساعة.

سەرەتاکەی:

«بسم الله الرحمن الرحيم الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين. وبعد: فقد نقل عن بعض الجفارين أنه استخرج من جفر الشيخ محي الدين العربي...»

کۆتاییەکەی:

«واما بعد طلوع الشمس من مغربها الى النفخة الأولى، فالناس يتهارجون فيه كأمثال الحمر، ويرفع الأحكام والقرآن. تمت الرسالة لأحمد بن حيدر القديم. كتبه الحقير شيخ عبدل في إمرة محمود پاشا ابن خالد پاشا، بعد موت أحمد پاشا أخيه ٢ شعبان ١١٩٣. وقت ذهاب اسماعيل آغا وجماعة الذريين(!) الى خدمته، وذهاب أحمد چاوش مع أقاربه ايضاً اليه».

٤/١٢٧٥٣ أخرى. بعنوان رسالة في بحث المهدي المنتظر. ناسخها: مصطفى بن محمد بن مصطفى، سنة ١١١٦هـ في قرية بروژه: بعد وفاة المؤلف.»

٤- ١٤٤٩٠. مختصر الفتاوى للفاضل النحرير أحمد بن حيدر الكردي الماوراني.

سەرەتاکەی:

«بسم الله الرحمن الرحيم وبه نستعين

الحمدلله المانح الفاتح العليم، والصلاة المقرونة بالتعظيم، والسلام الموسومة بالتعميم، على رسوله الكريم. وبعد: فقد رأيت فتاوى المحقق أحمد بن حجر المكي ثم الهيتمي كثير النفع، وكان كنزاً للمسائل النفيسة، بحيث لم يكن أكثرها موجودة في الكتب التي عندنا، لكن كان فيه تطويل بالأسولة وجوابها... وسميته (مختصر الفتاوي)...»

کۆتاییەکەی هیچی دەربارەی تەواویی و ناتەواویی کتێبەکە تێدا نییە.

لە هیچ سەرچاوەیەکی دیدا باسی ئەم کتێبەم نەدیوە و، ڕەنگە ئەمە تەنها نوسخەی بێت.

هەر لە (د.ع)دا نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەم دۆزییەوە، بەژمارە ١٣٩٢٦ پارێزراوە، حارثی کوڕی پیربالْ لەبەر خاتری مەلا ئەبوبەکری مودەڕیس لە ئەربیل سالْی ١١٣١ نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ژمارە (٤٩٣٦ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و ئیسماعیلی کوڕی عومەر نووسویەتیەوە.

٥- ٩٨٢٦ المحاكمات:

سەرەتاکەی:

«وبعد: فهذه تعليقات بل تنبيهات على تحقيقات مختفية في صفحات شرح العقائد العضدية للعلامة المحقق، والنحرير المدقق، برهان الحكمة، وسند المعرفة، قبلة الكلام، وكعبة المرام، أفضل المتأخرين، وأكبر المتبحرين، جلال الملة والدين، محمد بن أسعد الصديقي الدواني، روح الله روحه، وزاد في أعلى غرف الجنان فتوحه، ألفها احوج الخلق الى الله الغني، أحمد بن حيدر الكردي الحسين آبادي، إيضاحاً لكنوز إشاراته...»

کۆتاییەکەی:

«قد وقع الفراغ من ترقيم هذه النسخة الشريفة على نسخة المؤلف، في رمضان المبارك، من شهور سنة ست وستين ومائة وألف. من الهجرة النبوية على صاحبها أفضل التحية، على يد أضعف الطلاب بكتاش بن مصطفى بن عوض غفرالله له ولوالديه ولأستاذيه ولجمع المسلمين.

نوسخەیەکی دی دەستخەتی ژمارە (٢/٥١٢٢. د.ع) تەعلیقاتی ئەحمەدی کوڕی حەیدەرە بەسەر عەقائیدی عەضودیی جەلالەدینی دەووانییەوە.

کۆتاییەکەی:

فالحمدلله الذي جعلنا ممن القى محبة الصحابة في قلبه، اذ صح أن الله اذا اراد الخير بأحد ألقى في قلبه محبة الصحابة. رضوان الله تعالى عليهم أجمعين.

دەستخەتی ژمارە (٦٨٠٤ د.ع) نوسخەیەکی دی فرەنایابی ئەم کتێبەیە.

دەستخەتی (٤٢٣٥٢ د.ع) نوسخەیەکی دیکەی (المحاکمات)ە، حامیدی کوڕی حەمزەی کوڕی حەیدەر لە شاری کەرکووک لە خزمەتی سەید محەمەدی ناسراو بەکوڕی سەید فەرهاد لەبەر خاتری مەلا محەمەدی ناسراو بە (ابن الخال) ساڵی ١٢٤٥ نووسیویەتیەوە. لە کۆتاییدا هاتووە:

«وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين. قد وقع الفراغ من قراءتها على الفاضل النحرير وحيد عصره وزمانه أستاذ الكل في الكل صبغة الله مدّ ظله سنة ١١٦٧ ٢٤ دي الحجة».

لە کۆتایی دەستخەتی ژمارە (٥٤٣١)شدا کە نوسخەیەکی نایابی ئەم کتێبەی تێدایە نووسراوە:

«قد وقع الفراغ من تحرير هذه الحاشية المسماة بالمحاكمات، للمولى المحقق، والفاضل المدقق، مولانا أحمد بن مولانا حيدر السهراني، على شرح العقائد العضدية للمولى المحقق، رئيس العارفين، جلال الدين الدواني، فيما كنا ساكنين في قرية (وژنانه) وتحصنّا فيها قائمين، في خدمة الأستاذ الفاضل الكامل الأوحدي الألمعي، مولانا صبغة الله أصبغه الله بنور جماله، ويسر له طريق آماله، بعدما هربنا وارتحلنا من قرية ما وراء النهر، خوف شراير طهماسپ قليخان، حين نزلوا بكركوك وحواليها، وأظهروا الفضايح بأهاليها، على يد أقل العباد محمد، في شهر شعبان المعظم سنة ١١٤٥.

كتبته من نسخة المؤلف وقرأته في خدمة ابن ابنه»

شایانی باسە ئەم محەمەدە مەلا محەمەدی سیوچیی خاوەنی (تذکرة العوام)ە و، ئاوا لە شوێنێکی دیدا ناوی خۆی و باوباپیری نووسیوە:

«نمقه محمد جفايي، بن محمود بن محمد بن عبدالله الباني، السيوچي، في سلخ شهر ذي الحجة الحرام، في قرية ما وراء النهر في مدرسة مولوي المعنوي مولانا ابراهيم بن مولانا حيدر، في وقت التحصيل، في خدمته الشريفة، وخدمة ابنه الفاضل الكامل الأوحدي الألمعي المولوي الأولوي مولانا صبغة الله، أصبغه الله بنور الفضل والإحسان الى آخر الزمان سنة ١١٤٤».

٥- ٤٢٠٣ - لە بەرگی دووەمی فیهرەستی کتێبخانەی ئەوقافی بەغدادا لەناو کۆمەڵێ

دنراودا باسی دانراوێکی دیکەی مامۆستای حەیدەری هەیە کە لە شوێنەکانی دیدا نەمدیوە. ناوی ئەو دانراوە ئاوایە:

(نبذة من الأفكار وزبدة من الأنظار)

بەگوێرەی فیهرەستەکە سەرەتاکەی ئاوایە:

(الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام علي نبيه محمد وعلى آله...)

هەروەها بەگوێرەی فیهرەستەکە چوار لاپەڕەیە[1].

وەک گوتم مەبەستم لەم وتارانە تەنها ناونووسکردن و دیاریکردنی شوێنی دانراوەکانی ئەم مامۆستایانەیە و، بێگومان ئەمانەیش کە من لێرەدا نووسیومن تەواوی دانراو و بەرهەمەکانیان نین، بەڵام وەک بڵێین هەنگاوێکە لەسەر دۆزینەوە و تۆمارکردنی دانراوەکانیان، ئەگەر ئەم کارە لە تواناادا بێت، ئەوەندەی دیش هەیە ئەم وتارانەی ئێمە هەر قسەی ڕووت نین و بەبەڵگەوە شتەکان دەنووسم و تۆماریان دەکەم.

لە سەرچاوەکاندا باسی گەلێ دانراوی ئەم مامۆستا کراوە، بەڵام لە کوێن؟ نەک ئەمە بەڵکو ناوی دانراوەکانیشی نابەن و، تەنها دەڵێن دانراوی لە (فقه) و (تفسیر) و...دا هەیە.

زیاد لەوانەیش لەم وتارەدا ناوی دانراوی (مختصر الفتاوى)ی مامۆستای حەیدەریمان بەبەڵگەوە نووسی و، وا بزانم ئەمە یەکەمجارە ناوی ئەم بەرهەمە تۆمار دەکرێت.

جگە لەمانەیش لەم بوارەدا هەندێ لەو ژمارانە تۆمار دەکەین کە لە (دار العراق للمخطوطات)دا دانراوەکانی مامۆستا ئەحمەدی حەیدەری بەوان پارێزراون:

١- المحاكمات: ١٩٤٧٤، ٩٨٢٦، ١٣٧٩٨، ١٧٤٠٧، ١٧٢٩٠، ٢٤٥٦٧، ٣١٥٠٥، ٢/٧٩٢٣، ٧٨٢١، ١٧٢٤٠، ١٨٧٨٠، ٢٦٨٨، ٧٩٢٣، ٢٣١٤٠...
فهرست مخطوطات مكتبة القادرية ٢/٤١٢. فهرس مخطوطات مكتبة الأوقاف العامة بغداد، ٢/٢٤٥.

٢- حاشية على الاستعارة السمرقندية: ١٩٧٩٦، ٧٨٨٨، ١٨٩٣٠، ٢٦٠٩١، ٧٥٣٨، ٢١٩٠٢، ٧٢٠٧، ١٦١٠٦، ٢٠٨١٧، ٢١٠٣٣، ١٠٣٠٢، ٨٤٢٩، ٢٤٤٨٥...

(١) (فهرست المخطوطات العربية في مكتبة الأوقاف العامة في بغداد. الجزء الثاني ص: ٥١٤).

٣- حاشية على العقائد لجلال الدين الدواني: ٧٨٢١، ٢٤٧٩١.

٤- مسألة الطلاق: ٢١٠٩٤.

ئەو ژمارانەی دیش کە لە وتارەکەدا نووسران.

دوای بڵاوبوونەوەی وتارەکە هەر لە (دار العراق للمخطوطات)دا ئەم دانراوەی مامۆستا ئەحمەدی کوڕی حەیدەری یەکەمم دی کە بە ژمارە ٤٣٤٤ پارێزراوە و سەرەتاکەی ئاوایە:

«قوله مبالغة: علة للتنزيل. قوله: اعتناء علة للمبالغة...»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«والفعل والحرف اذا استعملا في أنفسهما لايكونان فعلاً وحرفاً، فلا يحتاج الى التنبيه لتصحيح الحكم. تمت الحاشية اللطيفة للحبر المدقق مولانا احمد بن حيدر القديم الحريري، الواقعة على شرح الرسالة العضدية، للبرهان المحقق عصام الملة والدين أعلى الله درجته في أعلى عليين... في سنة ١٢٠٦».

جگە لەم دانراوانەی مامۆستا ئەحمەدی حەیدەریی یەکەم بەگەڕان و پشکنینی فیهرەستەکان ناوی چەند دانراوێکی دی ئەم مامۆستامان دۆزییەوە، بۆ تەواو و تەسەلترکردنی باسەکە لێرەدا ناوەکانیان وەک لە فیهرەستەکاندان تۆمار دەکەم، حەزم دەکرد دەستخەتەکان خۆیانم ببینیایەت بەڵام ئەو ڕێگەم بۆ نەڕەخسا.

دەستخەتی ژمارە ١٣/ح ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە.

هەروەها دەستخەتی ٤٢٣٦٢ش نوسخەیەکی دییەتی، محەمەد نووری کوڕی ئەمین ئەفەندیی کوڕی مەلا سولەیمان نووسیویەتیەوە.

### فیهرەستی کتێبخانەی ئەوقافی بەغدا:

بەرگی یەکەم:

١٦٤- تعليق على التفسير البيضاوي. ١/٦٢.

١٦٨- تفسير آية الكرسي. ١/٦٣.

٢٠٦٩- رسالة في رد مذهب الشيعة فيما يتعلق بغسل الرجلين في الوضوء. ١/٦٠٩.

بەرگی دووەم:

٢٧٦٩- تعليق على شرح العقائد العضدية للجلال الدواني. ٢/١١٥.

٣٢٤٦- محاكمات على شرح العقائد العضدية للجلال الدواني. ٢/٢٤٥.

٤٢٠٢- نبذة من الأفكار وزبدة من الأنظار. ٢/٥١٤.

**فیهرەستی ئەوقافی موسڵ:**

بەرگی یەکەم:

٦/٢- تعليقات على شرح العقائد العضدية لجلال الدواني المتوفي سنة ٩٠٨هـ. ١/٦٥.

بەرگی شەشەم:

١٧/٢٢ مجموع ٣- حاشية على شرح الدواني على العقائد العضدية. ٦/١١١.

بەرگی هەشتەم:

١٨/١٧ مجموع ١- تعليق على شرح العقائد العضدية للدواني. ٨/١٢٠.

**فیهرەستی مەکتەبەی قادرییە:**

بەرگی دووەم:

٥٧٢ المحاكمات. ٢/٤١٢.

بەرگی پێنجەم:

١٣- رسالة في مسألة غسل الرجلين. ٥/٣٧.

**فیهرەستی مەکتەبەی ئەوقافی سلێمانی:**

بەرگی سێیەم:

٤/٣ تعليقات على شرح العقائد العضدية. ٣/٣٢.

بەداخەوە دوای سەرنجدان بۆمان دەردەکەوێ فیهرەستنووسەکان جیاوازییان لە نێوان دانراوەکانی ئەحمەدی یەکەم و ئەحمەدی دووەمدا نەکردووە و، تێکەڵاویان کردوون. بۆ

نموونە مامۆستا عەبدوڵلای جبووریی لە بەرگی سێیەمی فیهرستەکەیدا دەڵێ: أحمد بن حیدر المتوفی ١٠٧٠هـ دوایی لە باسی دەستخەتەکەیدا دەڵێ:

فرغ منه مؤلفه في سنة ١١٠٣هـ!! ص: ٢٠٦.

هەروەها دەربارەی ئەم مامۆستا ئەوەیش نابوێرم کە لە دەستخەتی ١٧٠٩٢دا نووسیویە: لە ڕۆژی ١١ شەوالی ساڵی ١٠٣٨دا کوڕێکم بوو بەناوی باوکمەوە -واتە حەیدەر- ناوم نا. دوو ساڵ ٤٢ ڕۆژ کەم پێش ئەوەیش شەوی پێنج شەمەی ٢٣ی مانگی زیلقەعدە کوڕێکی دیم بوو ناویم نا محەمەد.

بەگوێرەی دەستخەتی ٤٣٩٩٣ د.ع کە (میرزا جانە) مامۆستا ئەحمەدی کوڕی حەیدەر ساڵی ١٠٧١ کۆچی دوایی کردووە و، نووسەرەوەی دەستخەتەکە کە محەمەدی کوڕی خان ئەحمەدە ساڵی ١١١٣ نووسیویەتیەوە و لەلایەکیدا نووسیویە: مصطەفا بەگ ساڵی ١٠٩٧ کوژرا. عەبدوڵلا بەگی کوریشی ساڵی ١١٢٠ کوژرا. ئەحمەدی کوڕی حەیدەر لە ساڵی (الغم)دا مرد و، حەیدەری کوریشی ساڵی (جاءنا الغم) مردووە.

بەگوێرەی دەستخەتی ١٧٩٠٩یش عەبدوڵلا بەگ و مصطەفا بەگ لە گوندی (دیوین)ی سەر بە(حەریر) بوون.

## ئەحمەدی کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی بەناوبانگ بە ئەحمەدی دووەم

### ٤١١

دوای پشکنینی زۆری دەستخەتەکانی (دار العراق للمخطوطات) و کۆکردنەوەی ناو و زانیاریی پرژوبڵاوی چەندین نوسخەی جۆراوجۆری، یەک دانراوی ئەم مامۆستام دۆزییەوە، کە یەکێکیان دەستخەتی دانەر خۆیەتی و، بەهەڵە لە وتاری پێشووتردا کە لەسەر ئەحمەدی یەکەم نووسی بووم شتێکم لەمیش وەرگرتبوو[١]، بەڵام لەم وتارەدا - کە جێگەی خۆیەتی - هەندێک بەدرێژیی لەسەر ئەم دەستخەتە دەنووسم و، کۆتایی نوسخەکانی دیکەیش - کە هەریەکەیان بایەخی تایبەتیی خۆی هەیە - تۆمار دەکەم.

بەڵام بڕوا ناکەم ئەم مامۆستا تەنها ئەم دانراوەی هەبووبێت و، بەدووریی ناگرم هەر لە

(١) بەتەما بووم لەسەر زنجیرە ئەم بابەتانە لە هاوکاریدا بڵاو بکەمەوە، بەڵام لەبەرئەوەی هەڵەی زۆر دەکەوتە وتارەکان لە کاتی چاپدا، بڵاوکردنەوەم وەستاند و بۆ ئێرەم دانان.

(دار العـراق للمـخطوطات)دا دانراوی دیکەی هەبێت، من پێ لەوە دەنێم کـە هەمـوو دانراوەکـانی بنەماڵەی حەیدەریم - لەبەر زۆرییـان و زۆریی نوسـخەیان- سـەرجەم تۆمـار نەکردووە و، لەوانەیە ئەو نوسخانەی تۆمار نەکراون لە تۆمارکراوەکان کەمتر نەبن.

دەربارەی ژیانیشی خۆشبەختانە ساڵی کۆچی دوایم بەدروستیی دۆزییەوە، ئەوەیش لە ڕێگەی پارچە شیعرێکەوە کە عاصیمی برازای نووسیویە، ئەمەیش شیعرەکانە:

آه و فـغـان و حـسـرتم از جـور چرخ بی نظام

صـد داغـهـا را لالـهسـا بنهـاده بر دلهـا مـدام

این داغ هم از جـور او، مـوت عم تدریس خـو

عـالم بموتش کنده رو، در مـاتم وی صـبح و شـام

علمی چو علمش بیـمـثـال در این رباط پر مـلال

کس را نباشد آن کمال، بیشک یقین است این کلام

لطف الهی سـرمـدی، امـداد تاریخم شـدی

امـداد تاریخم شـدی، لطف الهی سـرمـدی[1]

زیر لوای احـمـدی، جـایش نمای اندر قـیـام

١١٤٩هـ

بەسەر ئەم پارچە شیعرەوە نووسراوە:

«لكاتبه في تاريخ وفاة العم احمد افندي»

واتە لە مێژووی کۆچی دوایی ئەحمەد ئەفەندیی مامیدا.

مـامۆسـتا حەیدەری یەکـەم کـوڕی مـحەمەدی کـوڕی پیرەدین بووە، حەیدەری دووەم کـوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری یەکەمە. مێژووی ژیانی ئەم دوو مامۆستا لەگەڵێ سەرچاوەدا تێکەڵاو کراوە، بەڵام ئەوەی ڕوونە ئەوەیە مـامـۆسـتـا حـەیدەری حەیدەریی -کـە بەزۆریی دەبێ دووەم بێت- لە ساڵی ١٠٩٧دا لە جیهاندا بووە.

---

(١) شاعیر خۆی ئەم دوو نیوە بەیتەی نووسیوە و هیچیانی لانەبردووە.

(٢) دەربارەی ئەم مامۆستا -عاصیمی حەیدەریی- جگە لەو پیاهەڵدانەی مامۆستا ئیبراهیم فەصیح - کـە پێشـتر باسمـان کرد- شـتێکی ئەوتۆمـان دەست نەکـەوتووە، ئەمـە نەبێ کـە دەسـتـخەتی ژمـارە ٤٢٣٤١ د.ع حاشیەی ئەم مامۆستایە بەسەرخەیاڵییەوە.

ئەو دانراوانەی دەستم کەوتوون و لێرەدا ناونووسکراون تێکڕا دانراوی حەیدەری دووەمن و دانراوی حەیدەری یەکەمیان تێدا نییە.

١- حاشیته علی الاستعارة: ٣/٨٤٢٩

یەکێک لە دانراوەکانی مامۆستا مەلا ئەحمەدی (دووەمی) حەیدەریی حاشیەیەکیەتی بەسەر ئیستعارەوە کە خۆی بەم شێوە باسی دەکات:

«اما بعد: فيقول افقر الخلق الى الله الهادي احمد بن حيدر بن احمد الكردي الحسين آبادي: لما كان الشرح المنسوب الى الفاضل الرباني، والكامل الوحداني، عصام الملة والدين، ابراهيم بن محمد بن عرب شاه الاسفراني، الواقعة علي الرسالة المصنفة في الاستعارة، للمولى المحقق والحبر المدقق، مولانا أبي القاسم السمرقندي، مع وجازة لفظه، ورشاقة نظمه، مشتملاً على فرائد لطيفة، محتجبة تحت الاستار، وفوائد شريفة سمحت بها يد الأنظار... اردت أن أعلق عليها تعليقات...»

کۆتاییەکەی:

«... ووجه الشبه في الكل لايخفى على من ليس على بصره غشاوة، ووقع في بصيرته إضاءة. تمت الحاشية المسماة بملا أحمد على يد أضعف العباد عمر بن حاجي المشهور بآجقلايي، في شهر رمضان. في وقت الظهر بعد الأذان، في مدرسة ملا عبدالقادر بن ملا محمد...»

ئەم دەستخەتە دەستخەتێکی گەورەیە و وا دیارە لە کۆیە نووسراوەتەوە و بەشی یەکەمی ئاوا کۆتایی هاتووە:

«... على يد أحقر الراجين ابراهيم المذنب الحزين، بن محمد المشهور بگومشيني، في وقت الضحى، في يوم الجمعة، في شهر جمادي الآخر المبارك، المسجد الجامع في الكوي، عند مولانا محمد المشهور بكيلزنداني».

ژمارە (٧٥٣٨) نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و نوسخەیەکی تازەیە بەدەستی خدری (شاملی) ساڵی ١٣٥٢ نووسراوەتەوە.

نوسخەیەکی دیکەیشی ئەمەیە کە لەمەولا باسی دەکەین:

٢- حاشية احمد بن حيدر علي عصام الدين الاستعارة: ٥ ٢/١٥٩٠

کۆتاییەکەی:

«... وقع في بصيرته إضاءة، وعلى لفظه الاضاءة، قد تم كتابنا، ونرجوا من الله أن يجعل خاتمتنا مع اضاءة القلب.الحمدلله على التمام، وعلى نبيه أكمل التحية وأفضل السلام، في يوم الاثنين الثالث والعشرين من شهر رمضان سنة ثلاث ومائة والف من هجرة سيد الانام. قد وقع الفراغ من كتابته على يد مؤلفه، رحم الله امرءاً دعا له بالغفران، والخلاص من عذاب النيران، ونرجوا من الناظرين النظر بعين العناية دون عين السخط والخذلان».

ئەم دەستخەتە -وەک دەبینی- یەکێکە لە دەستخەتەکانی خودی بنەماڵەی حەیدەریی و، گەلێ زانیاریی و، شیعر و بابەتی بەسوودی تێدایە، ئێمە لەم دەرفەتەدا چیمان بۆ بکرێت لە تەکیانا دەیکەین.

یەکەم: چەند پارچە شیعری کوردی کرمانجیی ژووروو کە ئەگەر بەتەواویی بزانرێ هی کێن جێگەی بایەخی تایبەتین.

شیعرەکان پارچەیەکیان شیعری (قانیع نازناوێکە) زووتر لەم پرۆژەدا لە سەریمان نووسیوە(١).

دووەم: پارچەیەک شیعرە نازانم هێ کێیە سەرەتاکەی -کە وا پێدەچێت ناتەواو بێت- ئاوایە.

گــر پڤی درد فنابم لطبــیــبــان غنیم
ملحما قلب لنک وان نیه والجسم صحیح

پێنج بەیتە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

مــفــتی عــشق بخــونی ژ ازل فــتــوی دا
[هشرر دلصوژ بـ جلاوی وتقبیلی شحیح!]

سێیەم: پارچەیەک شیعرە شەش بەیتە، ئەمیش نازانرێ هی کێیە و سەرەتاکەی ناتەواو دیارە و ئاوا دەستپێدەکات:

(١) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، ٢ ل: ٤٢٢.

بىن قبـاى شمـال بو خط عنبر و شـميم!!
هرچه كـو أهل حـالبـو ژى اترك كـهـايى

ئەم پارچە شەش بەیتە و کۆتاییەکەیشی ئاوایە:
طبع سليس ڕوان اى كـولبـو عـبـد...ـان
لى تى كـه اهل عـرفـان، ببنه مـدح ثنايى

دوای ئەمانەیش نووسراوە:
(ما وصل بالتقسيم الى عبدالله بن احمد بن حيدر)
ڕەنگە مەبەست ئەوە بێت کە ئەم کتێبە بەمیرات گەیشتبێت بەم پیاوە.
لە لاپەڕەی دوای ئەمـەیشـدا دوو پارچە شـیـعـر نووسـراوە بۆ کـۆچی دوایی دوو زانا یەکێکیان دیاریی نەکراوە کە کێیە. دووەمیان نووسراوە:
«تاريخ وفات مولانا خضر لكاتبه عبدالعزيز أخوه»(*)
پارچە شیعرەکانی بەفارسی و نایشزانین مەولانا خدر کێیە.
هەروەها نازانین عەبدولعەزیزی برایشی کە شیعرەکانی بۆ نووسیوە کێیە.
هەروەها باسی لە دایکبـوون و کـۆچی دوایی یەک دوو کـەسی دیکەی تیـایـە، ئەوەی جێگەی بایەخی تایبەتیی بێت تیایاندا ئەوەیە کە نووسراوە:
(وفاة محمد بن آدم سنة ١٢٣٧) ئەمەیش ئەوە دەسەلمێنێ کە برای بەڕێز فائیزی مەلا بەکر دەربارەی ساڵی کۆچی دوایی ئیبنوئادەم لە گۆڤاری (کاروان)دا نووسیویە.
چوارەم: لە حاشیەکانی ئەم کتێبەدا لە کۆتایی هەندێکیانەوە نووسراوە:
(عـبدالغفور ابن المحشي) يان (عبدالغفور ابن احمد المحشي) بەمەیش دەزانرێت کە مـامۆسـتـا مـەلا ئەحمەدی حەیدەریی کـوڕێکی زانای بەناوی (عبدالغفور)ەوە هەبووە و، جارێ نازانین بەسەرهاتی ژیانی و بەرهەمەکانی چۆن و چیی بوون.
پێنجـەم: هەر لـەم دەسـتـخـەتەدا پێش کـتـێـبـەکەی مـامـۆسـتـای حەیدەریی کـتـێـبی عیصامەدین نووسراوە و، کۆتاییەکەی ئاوایە:
«قد وقع الفراغ من تسويد هذه الرسالة المنسوبة الى مولانا عصام الدين، في

(*) دوایی دەرکەوت هەردووکیان لە بنەماڵەی حەیدەرین.

سنة الف ومائتين وسبع وعشرون(!) من هجرة النبوية المصطفوية من يد احقر العباد واحوجهم عبدالله بن احمد بن عبدالله بن أحمد بن حيدر بن احمد بن حيدر بن محمد الكردي الحسين آبادي غفرالله لهم ولجميع المؤمنين...»

لەم دەقەیشەوە - جگە لەوەی کە ناوی کوڕ و باوک و باپیر چەند پات دەبنەوە و، کوڕ شانازیی بە باوکی خۆیەوە دەکات - ناوی زانایەکی دیکەی ئەم بنەماڵەمان بۆ دەردەکەوێت کە ناوی (عبدالله)یە و، دەکرێ بە (عبدالله)ی دووەم ناوی بەرین.

نووسەرەوەیەکی بەڕێزیش - کە لەوانەیە هەر لە زانایانی ئەم بنەماڵە بەڕێزە بێت - لە پاڵ ئەم دەقەدا نووسیویە: «قد توفي كاتب هذه الرسالة عبد[الله] بن احمد في آخر شهر ذوالقعدة يوم الجمعة سنة ١٢٣٧».

واتە: دە ساڵ دوای نووسینەوەی دەستخەتەکە و لە ساڵی کۆچکردنی ئیبنوئادەمدا ئەم مامۆستا کۆچی دوایی کردووە.

(١/٢٧٦٢٤ د.ص) نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە بەم ژمارە پارێزراوە، ئەم نوسخەیش نوسخەیەکی پوختە، بەڵام دەستی چەپەڵی بازرگانیکەر ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەکەی دڕاندووە!!

(٢٤٤٨٥ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە ساڵی ١٢٧٥ سەید عەلیی کوڕی سەید محەمەد ئەفەندی نەقیب و موفتیی موسڵ نووسیویەتیەوە.

نوسخەیەکی دیشی بەژمارە (٢/٧٨٨٨) پارێزراوە و، نوسخەیەکی ناتەواوە.

ژمارەیەکی دیشی بە (٢/١٨٩٣٠) پارێزراوە و، نوسخەیەکی تەواوە، بەڵام نووسەرەوەکەی نەناوی خۆی و، نە ساڵی نووسینەوەی دیاریی نەکردووە.

نوسخەیەکی دیشی بەژمارە (٢/٧٢٠٧) پارێزراوە و، کۆتایی بەم جۆرە هاتووە:

«تمت الحاشية المسماة بأحمد بن حيدر علي الشرح المسماة(!) بالاستعارة لعصام الملة والدين ابراهيم بن محمد بن عربشاه الأسفراني، على الرسالة المصنفة في الاستعارات للمولى المحقق مولانا أبي قاسم السمرقندي، على يد أحقر العباد قلندر زاده مصطفى بن سعيد افندي، غفرالله لهما آمين يا رب العالمين».

لێرەدا ساڵی نووسینەوەی نەنووسیوە، بەڵام لە کتێبی پێش ئەمەدا دەڵێ: ساڵی ١٢٨٧ نووسراوەتەوە. لە شوێنێکی دیشدا ١٢٩٤ی نووسیوە.

٢/٢١٠٣٣ش نوسخەیەکی دی ئەم دانراوەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«... مع إضاءة القلب. الحمدلله على التمام، وعلى نبيه أكمل التحية وأفضل السلام، في يوم الاثنين الثالث والعشرين من شهر رمضان سنة ١١٥٣ من هجرة سيد الانام تمت. وقد وقع الفراغ من كتابة هذا الكتاب الشريف بعون الملك اللطيف، على يد أضعف العباد وأحوجهم الي رحمة الملك القدوس، عبيدالله بن ابراهيم بن علامة بن محمود المنسوبون الى قرية (پيرسد!] في يوم المبارك يوم الخميس في مدرسة قبهان بقى الى آخر الزمان، يا منان!»

نوسخەیەکی دی بەژمارە ١/٢١٩٠٢ لەم کتێبخانەدا (دار العراق للمخطوطات) پارێزراوە و، کۆتاییەکەی ئاوایە:

«قد وقع الفراغ من الكتابة من يد الأحقر اسماعيل بن سيف الدين المشهور بالماويلي - رحم الله امرأ دعالهما بالغفران والخلاص من عذاب النيران -وعلى الله التكلان كل ساعة وآن، سنة الف ومائة وخمسين وخمسة، كتبته من سحر، كتبت من نسخة المؤلف».

ژمارە ٣/١٠٤٣٤ د.ع نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

قد استراح انامل الحقير الفقير الى رحمة الله الغني القدير عثمان بن عبدالقادر الشهير... من كتب الكتاب المسمى بعصام الدين الجدير، لدقته بنظر وفكر كثير، مع حاشيته الدقيقة الحقيقة، بأن يقال ليس لها رفيق في الحقيقة، للفاضل أحمد بن حيدر العالم العامل، تغمدهم الله بغفرانه الكامل، وصانهم في العاجل والآجل، بحرمة من هو أعظم الوسائل. آمين يا رب العالمين. ١٢٧٧.

دەستخەتی ژمارە ١٦١٠٦ دانەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە لە کۆتاییەوە ناتەواوە.

دەستخەتی ژمارە (٤٢٣٦٢ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە، محەمەد نووری کوڕی ئەمین ئەفەندیی کوڕی مەلا سولەیمان نووسیویەتیەوە.

لە کتێبخانەی ئەوقافی (موصل)یشدا دوو نوسخەی ئەم کتێبە هەیە.

یەکەمیان: لە لاپەڕە ١٦٧ی بەرگی سێیەمدا دەڵێ:

٢- حاشية علي شرح العصام على الرسالة الاستعارات للسمرقندي. لە لاپەڕە ٢٧٥ی بەرگی دووەمیشدا:

٣- حاشية احمد بن حيدر الحسين آبادي على السمرقندية. احمد بن حيدر بن احمد الكردي الحسين آبادي المتوفي ١١٢٩هـ.

## عەبدولغەفووری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری حەیدەریی

٤١٢

یەکێکی دی لە زانایانی ئەم بنەماڵە ئەم مامۆستایە کە حاشیەی بەسەر دەستخەتی ژمارە (١٥٩٠٥ د.ع)ەوە هەیە و، ئەم بەیتەیش نووسراوە دوور نییە بەیتی ئەو بێت.

خـــاک حـــریر بود طوتیـــای چشم مـــا
لیکن سکان نمی برند ز دل هیچ خـشم مـا

ئەگەر وایش بێت ئەوا دیارە ئەم مامۆستا ماوەیەک لە ناوچەی حەریردا بووە، بەڵام جارێ شتێکی زیاترمان لە دەستدا نییە و، چاوەڕوان دەبین بەڵکو!

وەک جاری دیش گوتوومە بەداخەوە ئەو مامۆستایانەی لەسەر زانایانی ئەم بنەماڵەیان نووسیوە بەزۆریی لایەنی وشەئارایی و پیاهەڵدانیان بۆ لەسەر نووسینیان هەڵبژاردووە و، ئەوەندەی بایەخیان بەم لایەنە داوە چەند یەکێکی ئەوە لایان لە بەرهەم و شوێنەوار و مێژووی ژیان و خوێندن و مامۆستا و قوتابییانیان نەکردوەتەوە.

ئەوەتا دەبینین وەک نووسیویانە مامۆستا ئەحمەدی کوڕی حەیدەر ئەم کوڕانەی بووە:

١- عەبدولغەفووری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٢- خضری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٣- عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٤- عەبدولعەزیزی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

٥- شەهابەدینی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر.

ئەم کوڕانەیش بەپێی ئەو پیاهەڵدانە هەموو زانا و خوێندەوار بوون، بەڵام -جگە لە پیاهەڵدان- دەربارەی ژیانیان هیچیان تۆمار نەکردووە.

## عەبدولغەفووری حەیدەریی

٤١٣

لەسەر دەستخەتی ٥٦٣٦. د.ع - کە کۆمەڵێک دانراوە لە فەرائیضدا - نووسیویە: ثم آل الی نوبتي بالشراء الشرعي وأنا الفقير الى الله الهادي عبدالغفور نجل الحاج محمد اسعد أفندي الحيدري الصفوي، الحسين ابادي. مۆرەکەی ١٢٣١ی پێوەیە.

پێش ئەم ئاوای لێ نووسراوە:

ثم آل إلى الفقير اليه عز شأنه عبيدالله بن عبيدالله افندي الحيدري المفتي بمدينة بغداد. عفى عنه.

لەسەر دەستخەتی ٩٥٣٤ (د.ع)ش نووسیویە:

قد تملكه بالشراء الشرعي الفقير اليه عز شأنه عبيدالله بن عبدالغفور بن الحاج أسعد افندي الحيدري. غفر لهم.

دەستخەتەکەیش (شرح الالفية للسيوطي مع حاشية الاحسائية).

واتە: ئەمە دوو عەبدولغەفووریش لە زانایانی ئەم بنەماڵە.

## عەبدوڵلای کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەد

## ٤١٤

ئەم زاتە یەکێکە لە زانا گەورە و کتێب و دانراو زۆرەکانی بنەماڵەی حەیدەریی و، وا دیارە -خۆشبەختانە- بەختی یار بووە و زۆر لە دانراوەکانی پارێزراون و، بەپرژوبڵاویی ژمارەیەکی مشە لە دەستخەتەکانی دانراوەکانی گەیشتوونەتە (دار العراق للمخطوطات) و، ئێمەیش -بەگوێرەی توانا و دەرەتان- بەشێکیانمان دیاریی کردووە و لێرەدا ناویان دەبەین و، هەندێکیش زانیارییان -بەگوێرەی پەراوێز و کۆتاییەکانیان- لێ دەگوێزینەوە ئێرە. ئەوەی دەربارەی ژیانی ئەم مامۆستا لە دەستخەتەکاندا دۆزیومەتەوە و جێگەی بایەخە دیاریکردنی ساڵی کۆچی دواییەتی؛ چونکە سەرچاوەکان چەند مێژوویەکیان بۆ ئەو ڕووداوە داناوە و، بەزۆریی بەگواستنەوە لە (الروض النضر)ەوە ساڵی ١١٠٧یان داناوە.

وەک لە بەرگی ٢٧٥/٥ (فهرس مخطوطات مكتبة الاوقاف العامة في الموصل) بەرگی ٢٤/٤ و ٤٢ی (فهرس المخطوطات العربية في مكتبة الاوقاف العامة في بغداد)دا ئەم ساڵە دانراوە، بەڵام لە بەرگی ٢٩٥/٤ی (فهرس مخطوطات مكتبة الاوقاف المركزية في السليمانية)دا هاتووە کە ئەم مامۆستا ساڵی ١١٥١ لە ژیاندا بووە. کەچی بەگوێرەی دەستخەتی ژمارە ١٧٩٠٩ی (دار العراق للمخطوطات) مامۆستایەکی هاوچەرخی کە ناوی (زين العابدين)ی کوڕی ڕەسووڵی کوڕی ئیبراهیمی موکرییە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی حەیدەری ناسراو بە (صدر الشريعة) ڕۆژی ١١ مانگی ڕەجەبی ساڵی ١١١٥ کۆچی دوایی کردووە.

## دانراوەکانی:

### ١- حاشیەی لەسەر (میر ابو الفتح):

نسخة من حاشية عبدالله بن حيدر الكردي الماوراني على قولنا حمدا الواقع المنار عن في علم المنطق غير كاملة مكتوبة بخط ابن اخ المحشي محمد امين

نموونە لە دانراوی عەبدوڵلا کوڕی حەیدەری حەیدەریی

ئەم کتێبە چەندین نوسخەی لە (دار العراق للمخطوطات)دا پارێزراوە، سەرەتای نوسخەیەکیان و کۆتایی نوسخەکانی دی تۆمار دەکەین:

«وبعد: فيقول المفتقر الى الله الهادي عبدالله بن حيدر الكردي الحسين آبادي: لما رأيت الحاشية المنسوبة الى الامير ابي الفتح في الآداب لا ريبة في فطانة قائلها، ولا شبهة في متانة دلائلها، وكانت متعلقة بشرح تاج الادباء مولانا محمد الحنفي كساه الله جلابيب الغفران، لمتن برهان العلماء عضد الملة والدين، أسكنه الله فراديس الجنان، ومع هذا تداولتها ايدي...

کۆتاییەکەی نەمێژووی نووسینەوە و نەناو و نەشوێنی نووسەرەوەی پێوە نییە.

ئەم نوسخە بەژمارە ٢٤١٧٧ لە (دار العراق للمخطوطات)دا پارێزراوە.

دەستخەتی ژمارە (٢٤٨٧٨)یش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«تمت الحاشية المنسوبة الى مولانا عبدالله بن حيدر بن احمد بن حيدر يوم الثلاثاء وقت الغروب، في شهر ذي الحجة على يد أقل العباد عبيدالله بن عبدالرحمن بن حسن القاضي العقروي، في نجد روست، في مدرسة مولانا محمد بن آدم ادام الله ظله على رؤسنا وسائر المستفدين في سنة ١٢١٠».

دەستخەتی ژمارە (١٧١٥٠)یش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و ئاوایش کۆتایی هاتووە:

«نسأل الله حسن الخاتمة، وجعل غدانا خيراً من الأمس، فانه ارحم الراحمين ونصلي على محمد وعلى آله وصحبه اجمعين. تمت الكتاب على خط كتب على خط مؤلفها عبدالله بن حيدر، عفا عنهما الأكبر، على يد أقل خلق الله عبدالله بن اسماعيل كركوكي في سنة (١١٧٥) من هجرة نبينا عليه أفضل السلام».

دەستخەتی ژمار ١١٩٤٧یش نوسخەیەکی دی حاشیەی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرە لەسەر (مير ابو الفتح).

ئەم نوسخە کۆتاییەکەی لەگەڵ نوسخەیەکی دی یان کتێبێکی دیدا تێکەڵاو بووە و، کۆتاییەکەی شێواوە.

دەستخەتی (١/٣٩١٩٣)یش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و ئاوا کۆتایی هاتووە:

قد تم على يد الحقير المذنب المحتاج الى عفو ربه قاسم گراوي باربيل بعد العصر في شهر صفر المظفر. لا اله الا الله محمد رسول الله برحمتك يا أرحم الراحمين سنة ١٢٦١.

هەر لە خوار ئەمەوە نامەی مەلایەک بۆ مەلا عەبدوڵڵا ناوێک نووسراوە کە کتێبێکی لەلا بووە و دواکەوتووە و، دوایی ناردوویەتیەوە، ئەمیش لیی خۆش بووە، نازانین مەلا عەبدوڵڵا کە کێیە و نووسەری نامەکەیش ئینشایەکی عەرەبیی جوانی بووە، لە خواریەوە ئەمە نووسراوە، کە ڕەنگە نامەکە هی ئەم نووسەرە بەڕێزە بێت.

«حرره الافقر الاحقر الافتاده بكنج خانقاه اربل مصطفى النائب زاده سنة ١٢٦١، المفارق عن البيت والاهل والأحباب والإخوان والخلان، بأكثر من سنتين ونصف التي مضت من الزمان».

دەستخەتی ژمارە (٧٧٨٨)یش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە، بەداخەوە نووسەرەوەکەی دوای نووسینەوەی هیچی دەربارەی خۆی و ساڵ و شوێنی نووسینەوەی کتێبەکە نەنووسیوە.

دەستخەتی ژمارە (٥١٣٤)یش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە، بەڵام سەرەتاکەی جیاوازە و کۆتاییەکەی لەگەڵ کۆتایی نوسخەکانی دیدا یەک دەگرنەوە و، نووسەرەوەکەی نووسیویە:

«تمت الحاشية المشهورة باسم مؤلفها عبدالله بن حيدر، جعل الله قبره فردوساً بحرمة سيدنا محمد وعيسى وموسى الواقعة على الحاشية المشهورة ايضاً باسم مولفها الامير ابي الفتح في الآداب على الشرح المشهور بين اولي الالباب على يد أقل الخليقة وغبار أقدام الطلبة محمود بن اسماعيل القاضي بالكوي في عام ١١٩٩، ٣ ربيع الآخر، يوم الأحد في حكومة حسن خان. مات ابراهيم چاوش ٦ يوم.

لە دەستخەتی ٤١٣٨دا نووسراوە:

سجع مهر صاحب تأليف اينست:

ز فخر انبيا مختار داور

شفاعت خواه عبدالله حيدر

دەستخەتی ژمارە ٢/٤٣١٢٤ د.ع ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە عەبدوڵڵای کوڕی حەسەینی کوڕی عەلیی کوڕی محەمەد نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ٢٠٤٢٣یش دانەیەکی دیکەی حاشیەی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرە بەسەر ڕیسالەی (میر ابي الفتح)ەوە و کۆتاییەکەی دڕاوە و ناتەواوە.

دەستخەتی ١٨٨٠٥ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم دانراوەیە و، بەم شێوە کۆتایی هاتووە:

«تمت الحاشية المنسوبة الى مولانا عبدالله بن حيدر، من يد الفقير الحقير المذنب العاصي محمد بن ابراهيم، لأجل استاذي علامي فهامي، نادر العصر والزمان الفايز بالحكمتين العلمية والعملية الحايز للرياستين الدينية والدنيوية مولانا وبالحقيقة اولانا مولانا غزايي، نورالله روحه. اللهم ارحمنا يا الله.

دەستخەتی (١٥٨٣١ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە.

دەستخەتی ٣٢٤٣٧ (د.ع)ش نوسخەیەکی دییە و ئەمە کۆتاییەکەیەتی:

تمت الحاشية الواقعة على مير ابو الفتح لمولانا عبدالله الحيدري على يد أضعف العباد وتراب تحت أقدام الطلاب حسن بن محمد بن مصطفى في بلدة كوي، سنة الف ومائتين وأربع وثلاثين من الهجرة النبوية.

دەستخەتی ٤١٣٨ د.ع نوسخەیەکی نایابی حاشیەی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرە بەسەر (میر ابو الفتح)ەوە و، بەخەتی دانەرەکەیەتیی و لە کۆتاییەوە ئاوای نووسیوە:

تم المؤلف على يد مؤلفة مخرجاً الي البياض في سنة الف ومائة وأربعة. وتم تسويدها في اليوم الرابع من رجب الخير لسنة احدى وخمسين ومائة والف. اللهم[1]...

ئەم دەستخەتە گەلێ شیعر و زانیاریی بەسوودی دەربارەی پیاوانی ئەم بنەماڵە تێدایە لەوانە:

«هو الخلاق المنعم الجواد:

الحمدلله الذي خلق الانسان في أحسن تقويم حمداً يوازي نعمه، ويحاذي جوده وكرمه، حيث أذهب عني الحزن وأنعم على بولادة المسمى المكني بنعمة الله وابي الجود رعاية وتفألاً، لموافقة الاسم وكنيته في الواقع مع المسمى والمكنى، أنبته الله نباتاً حسناً، يوم السبت قبيل الظهر أواسط الشهر المبارك محرم سنة ١١٦١...»

پێش ئەمەیش حەلیمەی کچی ساڵی ١١٥٧ لە دایک بووە.

---

(١) ئەمە هەندێک گومان دەخاتە سەر مێژووی کۆچی دوایی، بەڵام وا دیارە دوو عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرن و تێکەڵاوبوون لە دانراوەکانیان و مێژووی ژیانیاندا رووی داوە.

له پەنای ئەمەدا مێژوویی کۆچی دوایی (عم احمد) بەشیعر نووسراوه، که ساڵی ١١٤٩یه، که لەوانەیه شیعری (عاصم) بێت و مامەکەیش ئەحمەدی کوڕی حەیدەره که پێشتر نووسیمان.

دەستخەتی ژماره ٣٢٤٣٧ د.ع ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیه حەسەنی کوڕی محەمەدی کوڕی مصطەفا ساڵی ١٢٣٤ له شاری کۆیه نووسیویەتیەوه.

٢- حاشية عبدالله بن حيدر على الفوائد الفنارية ٧٧١٨

وا پێدەچێت ئەم نوسخه بەخەتی دانەر بێت و کۆتاییەکەی ئاوایه:

«تم، والحمدلله على الاتمام، وعلى رسوله التحية والسلام، في اليوم الاول من أيام التشريق، نسأل الله الهداية الى سواء الطريق، وأن يجعل لنا التوفيق خير رفيق. في تاريخ ١١٠١ هذا وصوارف الازمنة لاتخفى، وكدورات العواصف لاتصفى، الفؤاد منعقد والطبيعة منجمد(!)، لا عين تنظر الى التأليف، ولا ذهن يحسن التصنيف، ولكن تحملنا الهمم، ورضينا بما جف به القلم».

دەستخەتی ژماره (٢/١٢٧٠٤)ش نوسخەیەکی دی ئەم حاشیەیه و کۆتاییەکەی ئاوایه:

تمت الرسالة المسمى (كذا) باسم مصنفه أعني عبدالله بن حيدر الواقعة على قول أحمد بيد أضعف العباد محمد بن اسماعيل بن محمد في شهر كركوك في مدرسة مولانا عبدالرحمن العسكري، في سنة الف ومائتين وخمسة وسبعين في آخر شهر رمضان...

دەستخەتی ژماره ٤١٣٨یش نوسخەیەکی دییه و کۆتاییەکەی ئاوایه:

«قد وقع الفراغ من تحرير هذا الكتاب المكتوب بعض منه على يد ابن أخ المصنف عاصم. وبعض آخر على يد أخيه. وبعض آخر منه على يد ابن أخيه ايضاً فتح الله. وبعض آخر منه على أيادي الطلبة في سنة ١١٤٩ من الهجرة النبوية المصطفوية، على صاحبها أفضل التحية والسلام، ولقد نقلنا هذا الكتاب من النسخة التي كتبها المصنف رحمة الله عليه رحمة واسعة»

دەستخەتی: (٢/١٩٣٩٠)یش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیه و کۆتاییەکەی ئاوایه:

والحمدلله على الاتمام والصلاة والسلام على النبي الكرام (كذا) وآله وأصحابه

البررة الفخام العظام، يوم الأثنين في شهر رجب، وقد مضى منه أحد عشر يوماً، سنة الف وثلاثمائة وسبعة(!) بعد الهجرة على صاحبها التحية، بيد الحقير قاسم ومحمد رب اغفر لهما ».

## حاشية عبدالله بن حيدر على الفوائد الفنارية: ٣/١٧١٤٩

سەرەتاکەی:

وبعد: فيقول اذل العباد، واضل طريق الارشاد، المفتقر الى الله الهادي عبدالله بن حيدر بن احمد الكردي الحسين آبادي: لما رأيت كثرة طلب الراغبين، ووفور رغبة الطالبين الى الحواشي المتعلقة بالفوائد الفنارية التي، هي عن العادية عارية...

کۆتاییەکەی ناوی کەسی پێوە نییە، بەڵام بەگوێرەی دوو دانراوی دیکە کە هان لە پێشییەوە دەبێ خەتی ئەبوبەکری کوڕی یوسفی شێخانی - شەیبانیی بێت ولە ساڵی ١١٤٤دا نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی (٣٩٦٢٤ د.ع)ش نوسخەیەکی تەعلیقاتی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرە بەسەر (قول احمد)ەوە.

نوسخەیەکی دی: ٣/٢٠٧٧٨

کۆتاییەکەی:

تم المؤلف على يد مؤلفه مخرجاً الى البياض في سنة الف ومائة وأربعة(!) من الهجرة النبوية المصطفوية. تمت الكتاب بعون الله الملك الوهاب على يد أضعف العباد وأحقر الطلاب، الراجي عفو ربه الفاطر محمد بن محمود بن ابراهيم بن محمود المزوري، وقد مضى من الهجرة النبوية سنة الف واحدى ومائتين.

نوسخەیەکی دی حاشیەی لەسەر فەنناریی: ٤/٢٠٧٧٨

کۆتاییەکەی:

تمت النسخة الشريفة المسماة بعبدالله حيدر، الواقعة على حاشية الفناري المسماة بقول احمد، على يد أحقر العباد وأضل طريق الارشاد المحتاج الى الله الغني الهادي، محمود بن ابراهيم بن علامة... في سنة ثمان وستين ومائة بعد الالف.

دەستخەتی ژمارە ١٦٨٥٩ی (دار العراق للمخطوطات) نوسخەیەکی دی ئەم دانراوەی مامۆستا عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرە، بەڵام لە کۆتاییدا جگە لە ساڵی نووسینەوەی کە ١٣٠٣ە هیچی دی نەنووسراوە.

دەستخەتی ١٧٨٣٨ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«قد وقع الفراغ من تسويد هذه الحاشية الواقعة على قول أحمد، ومؤلفه ملا عبدالله بن حيدر، بن احمد، صانهم الملك الصمد، من يد محمد سعيد بن رسول عفا لهما الملك الغفور، وهو ابن عزيز بن محمد عفا لهما الواحد الأحد، وهو ابن حسين بيك (الميرشخي!) الهرتلي اللهم اعف له بحق النبي. ١٣٠٣

دەستخەتی ژمارە ٨١٢٩ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و ئەمە کۆتاییەکەیەتی:

«وقد وقع الفراغ من تسويد هذه النسخة الحاشية الواقعة على قول احمد، المنسوب الى ملا عبدالله بن حيدر، من يد صالح بن عباس كراخي، في شهر كوه في مدرسة ملا رسول سنة ١٢٢٤.

دەستخەتی ٣٩٢١ش دانەیەکی دی ئەم کتێبەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

تمت الحاشية المنسوبة الى أفضل المحققين مولانا عبدالله الحيدري، على يد أقل العباد، المحتاج الى عفو الملك الرشاد محمود الدشتي، لأجل الأخ الامجد الملا محمد شريف الرنگه رژاني، في قرية خالوان، من محال ديره، من حكومة رواندز. اللهم اغفر لكاتبه، وقاريه، ومؤلفه، ولمن تصدى لتصحيحه، وتحشيته، وإبراز نكاته. آمين! ١٢٨٥ وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين.

دەستخەتی ٧٠٧٢ش دانەیەکی دی ئەم دانراوەی مامۆستای حەیدەرییە، بەداخەوە دەستێکی چەپەڵ کۆتاییەکەی شێواندووە و تەنها مۆری عەبدوڕەحمان ناوێک و مێژووی ساڵی ١٢٨٠ی لێ وەردەگیرێت.

دەستخەتی ١١٨٧٨ش یەکێکی دی لە نوسخە فرەکانی دانراوی حاشیەی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرە لەسەر فەنناریی و کۆتاییەکەی بەم شێوەیە:

«تمت في قرية ناف بركه في مدرسة ملا محمد بن ملا آدم، في يوم الأحد في شهر المحرم في ثلاث عشر منه في سنة ١٢١٦».

دەستخەتی ١٧٦٩٢ش نوسخەیەکی دی هەمان کتێبە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«قد كملت الحاشية المنسوبة الى مولانا عبدالله بن حيدر الماوراني، الواقعة على قول احمد الفناري، بيد الحقير الفقير على الشهير بالرشكاني، عفى عنه الملك الرباني، ابن ابراهيم بن مصطفى بن عبدالله. لا اله الا الله محمد رسول الله - صلى الله عليه وسلم-

دەستخەتی ٣/٨٤٢٩ش دانەیەکی ئەم کتێبەیە و ئەمەیش کۆتاییەکەیەتی:

«قد وقع الفراغ من تسويد هذه النسخة الحاشية الواقعة على قول احمد، ومؤلفه ملا عبدالله بن حيدر بن احمد، صانهما الملك الصمد، كتبه عمر بن حاجي المشهور بآجقلايي غفرالله لنا ولجميع المسلمين امين برحمتك يا أرحم الراحمين. لا اله الا الله محمد رسول الله».

دەستخەتی ژمارە ٤٢٦١ش دانەیەکی دییە لە حاشیەی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەر لەسەر فەنناریی و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«قد وقع الفراغ من تسويد هذه الحاشية على قول احمد من يد أحقر العباد وأحوجهم المنسوب الى الداغستان عبدالله، من مؤلفات أفضل المتأخرين ابن حيدر عبدالله، والصلاة والسلام على خير خلقه محمد بن عبدالله. سنة ١٢٦٧.

دەستخەتی ژمارە ٤٢٥٥٨/د، د.ع ش نوسخەیەکی دییەتی، سولەیمانی کوڕی مەحموود ساڵی ١٢٨٨ نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ژمارە ١/١٠٤٤٧ د.ع ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە ساڵی ١٢٣٨ نووسراوەتەوە.

لەو دانراوانەی ئەم مامۆستا کە باس نەکراوە (مودەوەنە)یەتی بەسەر فەرائیضی شەرح مەنهەجەوە، ئەم دانراوە بەژماوە ٤/٥١٣٢ د.ع پارێزراوە محەمەدی قزلەریی ساڵی ١٢٢٤ نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ژمارە ٤٣٤٣٩ د.ع ش نوسخەیەکی دیکەیەتی مەحموودی کوڕی حاجی عەبدوڵڵا ساڵی ١٢٩٢ نووسیویەتیەوە.

٣- رسالة في نسب القضايا: ١٢٧٠٤

دانراوێکی دیکەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەر،ە ئەم نامیلکە بچکۆلەیە سەرەتاکەی ئاوایە:

«بسم الله الرحمن الرحيم هذه بيان نسب القضايا المشهورة بحسب المفهوم. أعلم أن المشروطة العامة.

کۆتاییەکەی:

تمت الرسالة للفاضل المدقق عبدالله بن حيدر. كاتبه رسول بن عبدالله سنة ١٣٣٤.

دەستخەتی ٧٥١١ نوسخەیەکی دیکەی ئەم نامیلکەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«تمت الرسالة في نسب القضايا للفاضل المحقق ملا عبدالله بن حيدر».

دەستخەتی: ١/٣٠٠٩٤یش نوسخەیەکی دی ئەم دانراوەیە و بەم شێوە کۆتایی هاتووە:

«تمت الرسالة المنسوبة الى الفاضل المحقق المدقق عبدالله بن حيدر غفرالله لنا وله، بحرمة سيد البشر، على يد أحقر الطلاب رسول التلاني، لأجل برادرى وسرورى جناب كاك ملا عمر، فى پازدهم رمضان فى شبى سه شنبه، فى سعات پنج شب. سنه ١٣٤٤».

٤- حاشیەی لەسەر (اللاری)

یەکێکی دی لە دانراوەکانی ئەم مامۆستا حاشیەیەکیەتی بەسەر کتێبی (مصلح الدين اللاری)یەوە لە عیلمی حیکمەتدا و، سەرەتاکەی ئاوایە:

«الحمدلله العليم الحكيم، والصلاة والسلام على رسوله الكريم، وعلى آله وأصحابه هداة الصراط المستقيم وحماة الدين القويم، ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم. ق تخلص...

کۆتایی نوسخەی ژمارە ٧١٧٩یش ئاوایە:

ق مدخل فيهما اي في التقدي والتأخر الواقع في أجزاء الزمان، فقياسهما في أجزاء الزمان عليهما في المتحيزات من حيث الحيز قياس مع الفارق. قد وقع الفراغ من تحرير الحواشي المنسوبة الى مولانا عبدالله بن حيدر على يد احقر العباد قلندر زاده مصطفى، وقد كتبت هذه على المكتوب على خط خطه.

دەستخەتی ژمارە ٨٦٠٦ش دانەیەکی دی ئەم کتێبەیە و، بەم شێوە کۆتایی هاتووە:

قد تم هذا المؤلف على يد مؤلفه في سنة أثني عشر (كذا) ومائة والف. وقد تم كاتبه هذه النسخة على يد الكاتب في سنة خمسة وسبعين ومائة والف، والحمدلله على الاتمام.

دەستخەتی ٥١٩١ش دانەیەکی دی ئەم دانراوەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«قد كملت هذه الحواشي اللطيفة المنيفة، على الحاشية اللارية العميقة الشريفة، التي لنجوم درر زبر المتقدمين والمتأخرين غواش، ولا يوجد عن مدحها متحاش. وهي لأفضل المتأخرين وتاج المتبحرين عبدالله بن حيدر، عفا عنه الملك الصمد. ببنان أقل العباد محمود بن محمد في بلدة المحروسة المسماة بسليماني في سنة ١٢٧٨.»

دەستخەتی ژمارە (٣١٢٢٤ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و، عەلی ڕەواندزیی ساڵی ١٣٣١ لە شاری ئەربیل لە خزمەتی مامۆستا مەلا ئەبوبەکری (کچک مەلا)دا نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ژمارە ٣٢٤٤٣ د.ع ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە حەسەنی بایەزیدیی کوڕی مصطفا لە شاری ئەربیل ساڵی ١٢٣٩ لای مامۆستا مەلا ئەبوبەکری مەلا گیچکەی یەکەم نووسیویەتیەوە. ئەم دەستخەتە دوای تاڵانکرانی کتێبخانەی بنەماڵەکە لەلایەنی... بەش بەش کراوە براوە بۆ بەغدا.

٥- حاشیتە علی عصام الاستعارة

یەکێکی دی لە دانراوەکانی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای حەیدەریی حاشیەیەکیەتی بەسەر کتێبی عیصامەدینی ئیستیعارەوە و سەرەتای ئەم حاشیە بێ پێشەکییە و، یەکسەر دەفەرموێت:

«بسم الله الرحمن الرحيم وبه نستعين. قوله: يقول آه ليلتفت الى ما في التعبير عن نفسه...»

نوسخەی یەکەم بەژمارە ٢٣١٤٧ پارێزراوە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«وما سواه ترشيح أو تجريد لكان اعم. وهذا تم. قد خربط هذه الرسالة المسماة بعبدالله حيدر الواقعة على عصام الاستعارة، السيد محمد بن الحاج زين الدين الارديني، لاستاذه السيد احمد افندي الرازي المكرم، ابن استاذه البحر المحيط عمر افندي المنسوب اغصان شجرة نسبته الى ماردين المحروسة، انالهما الله ما يتمنيانه آمين. في أوائل ربيع الآخر سنة الف ومائتين وثلاثة -١٢٣٠٣-

دەستخەتی ژمارە (٣٩٤٠٨ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە، بەڵام ناتەواوە. نوسخەیەکی دی ئەم دانراوە بەژمارە ١/٧٧٩٧ پارێزراوە و، ئەم نوسخە هیچ لە

کۆتاییەوە - جگە لە دەربڕینی داخی دووریی نەنووسراوە. بەڵام لە دانراوێکی دییەوە، کە لە دوای ئەمەوە و لە هەمان دەستخەتدایە و بەهەمان خەتیشە، دەردەکەوێ ئەم نووسەرەوە ناوی عەزیزی کوڕی حسەینە و، لە شاری هەولێر نووسیویەتیەوە، بەڵام لێرەیشدا مێژووی نەنووسیوە.

دەستخەتی ژمارە ۱۰۳۰۲ش نوسخەیەکی دی ئەم دانراوەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

تمت الحاشية لأفضل المتأخرين وأكمل المتبحرين عبدالله بن حيدر، والله أعلم، في سنة ۱۲۳۹ على يد محمد أسعد.

دەستخەتی ژمارە ۲٤۱٤۹ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و ساڵی ۱۱۷۸ عەبدوڵڵای کوڕی ئیسماعیلی کەرکووکی نووسیویەتیەوە.

٦- حاشیەی بەسەر (قول احمد)ەوە:

یەکێکی دی لە دانراوەکانی ئەم مامۆستا حاشیەیەتی بەسەر (قول احمد)ەوە. دوو نوسخەی ئەم کتێبەمان دی بەم ژمارانە:

۱- ژمارە ۸۱۲۹ د. ع صاڵحی کوڕی عەباس ساڵی ۱۲۲٤ لە مەدرەسەی مەلا ڕەسووڵ لە شاری کۆیە نووسیویەتیەوە.

۲- ژمارە ۸/ح نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە، لە کۆتاییەوە ناتەواوە، بەپێی هەندێ لە پەراوێزەکان بەخەتی محەمەد ئەمینی برازای دانەرە.

بۆ ئاگاداریی زیاتر لەسەر دانراوەکانی ئەم مامۆستا چاوێکیشم بەفیهرەستی کتێبخانەکانی دیدا گێڕا و ئەنجامەکەی ئەمە بوو:

۱- فیهرەستی ئەوقافی بەغداد: بەرگی ٤، ل: ۷۸.

۳٦- حاشية على حاشية ابي الفتح.

۲- فیهرەستی ئەوقافی بەغداد: ۱۱۹/۱.

۳٦۰- رسالة في قوله تعالى: «الله نور السموات والارض».

۳- فیهرەستی ئەوقافی موسڵ ۲٦۷/۱

٤- حاشية على حاشية قول احمد على الفوائد الفنارية.

٤- فیهرەستی ئەوقافی سلێمانی: ۳۰٦/۲.

۱٤/۳۱ حاشية الماوراني على الفوائد الفنارية.

٥- فیهرەستی ئەوقافی موسڵ ۲۷٥/٥.

٤- حاشية على شرح الاستعارة.

٦- فیهرەستی ئەوقافی بەغداد ٣/ ٣١:

٤٤٧٦- رسالة في الانشاء.

٥٠١٨- تعليقات على شرح العضدية لعصام ص: ١٩١.

## صیبغەتوڵڵای حەیدەریی دووەم

### ٤١٥

یەکێکی دی لە زانا مەزنەکانی بنەماڵەی حەیدەریی کە پاش جێگیربوونیان لە بەغدادا ئەستێرەی درەوشاوەتەوە و ڕێگەی بۆ قوتابییان و شەیدایانی ڕێگەی زانیاریی ڕوون کردووەتەوە، مامۆستا صیبغەتوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی حەیدەرییە. ژیانی ئەم مامۆستا - تا ئەندازێک- بەبۆنەی ئەوەوە لە بەغدادا ژیاوە و هەر لەوێیش کۆچی دوایی کردووە، ڕوون و دیارە و، دەکرێ بێ سەرئێشە شتێکی دروست دەربارەی ژیانی بزانرێت، بەڵام - بەداخەوە- ئەمیش دانراوەکانی بەباشی نەپارێزراون و پەرتەوازە و ئاوارەی ئەملاو ئەولا بوون، لێرەدا ئەوانەی لە (دار العراق للمخطوطات)دا پارێزراون و من پێم زانیون و دیومن خوێنەری ئازیزیان لێ ئاگادار دەکەم. هەوڵ دەدەم لە پەنای ئەوەیشدا چاوێک بەفیهرەستەکانی کتێبخانەکانی دیدا بگێڕم و، چیم دەربارەی دانراوەکانی دۆزییەوە شتێکیان بۆ بکەم. لە دەستخەتی ژمارە ٦١٥٤دا دەڵێ کە ئەم مامۆستا لە ساڵی ١١١٠ی کۆچیدا لە دایک بووە[١]. ئەم قسە نووسراوی ئیبراهیم حەیدەریی باوکی صیبغەتوڵڵایە و، ئەم نووسینەیش هەموو قسەیەکی دیی دەبڕێنێتەوە. دیارە ئەمە صیبغەتوڵڵای یەکەمە و، دەربارەی لەدایکبوونی صیبغەتوڵڵای دووەم شتێکم دەست نەکەوت. صیبغەتوڵڵای یەکەم ساڵی ١١٩٣ک کۆچی دوایی کردووە.[٣] بەڵام لە شوێنی دیدا وا نووسراوە کە ١١٨٨ک کۆچی دوایی کردووە.[٤]

مامۆستا عەباس عەزاویی دەفەرموێ: صیبغەتوڵڵای دووەم موفتیی شافیعییەکان بووە

---

(١) بەڵام مامۆستای خاڵ دەفەرمووێ لە ١١١٤دا لە دایک بووە.

(٣) بڕوانە: مطالع السعود، تأليف: عثمان بن سند الوائلي البصري، تحقيق: الدكتور عماد عبدالسلام رؤف. وسهيلة عبدالمجيد القيسي. بغداد، ١٩٩١.

(٤) لە بەرگی چوارەمی ئەم کتێبەدا باسی صیبغەتوڵڵاکانم کردووە.

له تەمەنی ٨٥ ساڵیدا، ساڵی ١٢٧٩ کۆچی دوایی کردووه و له پاڵ گۆڕی صیبغەتوڵڵای باپیریدا له گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بەخاک سپێرراوه.(٢)

رسالة في الطاعون

١/٨٨٣٠

دانراوی صیبغەتوڵڵای حەیدەریی

سەرەتاکەی:

وبعد: فهذه فائدة جليلة. اعلم انه قد ورد في بعض الاحاديث أن الطاعون من وخز الجن، وأطبق الحكماء على انه ينشأ من فساد الهواء...

کۆتاییەکەی:

هذا ما لاح لي في أواخر سنة ست وثمانين ومائة والف ١١٨٦ اوان اشتداد الطاعون بمدينة بغداد وانتشاره في نواحيها رفعه الله تعالى عنا وعن سائر بلاد المسلمين، واعاذنا منه واياكم بحرمة سيد المرسلين. آمين. انتهى. نقل من خط السيد عبدالرحمن افندي تلميذ مؤلف الرسالة صبغة الله افندي. بلغ مقابلة.(١)

٧١١٤ د.ع نوسخەیەکی دی ئەم نامیلکەیە کە ٤ لاپەڕەیە، ناوی کەس و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە.

---

(٢) بڕوانه: العراق بين احتلالين، بەرگی حەوتەم، ل: ١٤١ و ٢٨٦.

(١) دەبێ ئەمەیش دانراوی صیبغەتوڵڵای یەکەم بێت.

٩٠٧٦ د.ع

حسەین ئەفەندیی عوشاریی بەدوو قەسیدە ستایشی مامۆستا (صبغة الله الحيدري) کردووە یەکەمیان:

وقال عفى الله تعالى عنه. يمتدح العلامة صبغة الله أفندي الكردي الشريف الحيدري في أوائل نظمه: ص: ١٢٥

أبوجهه بدر الفضائل يهتدي　　أم في محاسنه المكارم تقتدي؟

لە کۆتاییدا دەڵێ:

ان قصرت في مدح ذاتك سيدي　　فاسبل عليها من نداك السرمد

لازلــت ملتثم الشـفـاه مــــقبل　　الأفواه في الامصار أكرم سيد

لە لاپەڕە ٢٧٦شدا دەڵێ:

وقال يمتدح العلامة الكبير صبغة الله افندي الحيدري أحد مشايخه الكرام:

العلم جسم أنت عنصر مجده　　والفضل سيف أنت جوهر حده

لم تعرف العلياء كيـف تهزه　　حتى كتبـت علاك في أفرنده

لە کۆتاییدا دەڵێ:

وجعلته للحبر بردة تائب　　وقفوت كعباً حين جاء لجده

مستطلعاً بانت سعاد ومطلعي　　العلم جسم أنت عنصر مجده

دەستخەتی ژمارە ١٤٢٦٩ش دوو نامەی ئەدەبیی مامۆستا صیبغەتوڵڵان بۆ دوان لە ...ەورە پیاوانی سەردەمی خۆیی نووسیون. مێژووی نووسینەوە و ناوی کەسیان پێوە نییە ... شێوەی داڕشتنەکەیان بەرز و باڵایە و، نیشانەی لێوەشاوەیی و زامانپاراویی ...امۆستامان لە زمانی عەرەبیدا دەردەخەن[1].

لە دەستخەتی ژمارە ١٠٦٢٥شدا نوسخەیەکی پوختی نامەی سەرەوە هەیە لەگەڵ چەند ...شیە و نامە و وەڵامیاندا.

هەروەها (الرسالة العراقية)ی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی هەیە کە بۆ مامۆستا ...بەیدوڵڵای کوڕی صیبغەتوڵڵای نووسیوە.

---

(1) ئەم دەقانەمان لە (ورود الكرد فی حديقه الورود)دا بڵاوکردەوە.

## حاشیەی بەسەر تەفسیری سوورەتی (فاتحە)ی (بیضاوی)ەوە

١٠٩٥٠ د.ع

سەرەتاکەی:

«وبعد: فيقول المفتقر الى الطاف ربه القوي الهادي. صبغة الله بن ابراهيم بن حيدر الصفوي الحسين آبادي: قد توافقت الشواهد النقلية، وتطابقت البراهين العقلية، على أن أشرف المحامد والمآثر، وأكرم المقاصد والمفاخر، وأحمد الموادر والمصادر، وأحق ما يصرف فيه النواظر والبصائر، هو العلوم الدينية والمعارف اليقينية.

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«قوله: فيسمعه سماع قبول ورضاء على رضائه سبحانه وتعالى. تم لنا ما يتعلق بتفسير سورة الفاتحة من الحواشي بلطف الله، وحسن توفيقه، تم الحمدلله رب العالمين. ١١٠٢.[١]»

سەرنجێک

ناوی کەسی پێوە نییە. نوسخەیەکی زۆر جوان و نایابە.

هەندێ حاشیەی لەسەر بەیضاوی و شتی دیکە لە دەستخەتێکی بچکۆلەدا کە بەژمارە (٣٦٦٨٥) پارێزراوە، هەیە و، کۆتاییەکەی ئاوایە:

«وهو سمك المنارة. صبغة الله سلمه الله. اين چند حواشي جناب فضايلمآب، حضرت نحرير كامل صبغة الله افندي كه بر كتاب بيضاوي وغيره واقع شده حسب الاشارهء لازم البشارة مخدومي واستادي ومن به استنادي، مولانا ابو بكر افندي، الملقب بكچك ملا، در سنة صغرل ١٢٣٩ رقم تحرير پذيرفت، اميد كه بر صفحهء قبول سكونت نزول پزيرد والسلام.»

لە دەستخەتی ٨٦٢٣یشدا دوو سێ حاشیەی هەیە یەکێکیان لەسەر حەدیثی طاعوون و لابردنی شوبهەیەک کە لە نێوان حەدیثەکە و قسەی حوکەمادا هەیە.

هەروەها لە دەستخەتی (١٤٤٩٤)شدا کە حاشیەی چەلەبییە بەسەر بەیضاوییەوە لە

(١) گومان لەم مێژووەدا هەیە و، دەگونجێ دەسکاریی کرابێت.

سەرەتا و کۆتاییەوە هەندێک حاشیەی صیبغەتوڵڵای بەسەرەوەیە بەخەتی مستەفای قوتابیی صیبغەتوڵڵا ساڵی ١١٧١ نووسراوەتەوە.

١٠/ح یش دانراوی (رسالة في تحقيق زيادة الصفات)ە و سەرەتاکەی ئاوایە:

«وبعد: فهذه عجالة نافعة وغلالة رائعة، محضت فيها النصح النصيح، ومخضت عن زبد الحق الصريح، لرد بعض ما اورد من ظلمات بعض الشبهات».

کۆتاییەکەی:

«اذ لاتغاير بين الايجاب والاستلزام، والاقتضاء الا في العبارة، هذا وأطفئ المصباح، فقد طلح الصباح، ونادى منادى الحق حي على الفلاح، ربنا لاتزغ قلوبنا بعد إذا هديتنا...»

ئەم نوسخە لەبەر نوسخەی دانەرەکەی نووسراوەتەوە و لە پێشەکیەکەیدا پێشکەشی کردووە بەئەحمەد پاشای وەزیری بەغدا.

هەر لە کۆتایی ئەم نوسخەوە رشتەی بنەماڵەی حەیدەریی نووسراوە کە دەچنەوە سەر ئیمام حەمزەی کوڕی ئیمام مووسای کاظم.

**دانراوەکانی صیبغەتوڵڵا لە فیهرەستەکاندا:**

- لە بەرگی پێنجەمی فیهرەستی کتێبخانەی (القادریه)دا ناوی ئەم دانراوانەی هاتووە:

١- فائدة في تفسير آية من سورة البقرة منقولة من كلام صبغة الله الحيدري. ص: ٩٦.

٢- نبذ في تفسير القرآن الكريم. ص: ١٥٥.

٣- رسالة في مدح بعض الوزراء بەفارسی ص: ١٥٦.

٤- رسالة في تحقيق زيادة الصفات ص: ١٥٦.

- لە بەرگی یەکەمی هەمان کتێبدا ناوی:

حاشية على انوار التنزيل هاتووە، کە پێشتر بەناوی حاشیەی بەسەر تەفسیری سوورەتی فاتیحەی بەیضاوییەوە باسمان کرد. ل: ١٠٣.

سەیر ئەوەیە د. عیمادی رێکخەری ئەم فیهرەستە لە بەرگی یەکەمدا ساڵی (١١٩٠ھ)ی بۆ کۆچی دوایی ئەم مامۆستا دیاریی کردووە، کەچیی لە بەرگی پێنجەمدا کردوویە بە (١١٨٧ھ)!

- لە (فهرس مخطوطات مكتبة الاوقاف العامة في الموصل) بەرگی دوودا باسی:
١- عجالة في تحقيق زيادة الصفات. ص: ١٦٢.
لە هەمان کتێبی ناوبراودا بەرگی ٥ ل: ٢٦٥ باسی سێ حاشیەی مامۆستا صیبغەتوڵڵا کراوە.
لە بەرگی یەکەمی (فهرس المخطوطات العربية في مكتبة الاوقاف العامة في بغداد)دا ناوی ئەم دانراوانەی مامۆستا صیبغەتوڵڵا هاتووە:
١- تفسير واعراب بعض الآيات القرآنية. ص: ٦٤. مؤلفه عبدالله السويدي (ت ١١٧٤هـ) وصبغة الله الحيدري (ت - ١٢٢٣هـ) سەیر ئەوەیە لە لاپەڕەی بەرامبەری ئەم لاپەڕەدا کە دەڵێ:
- تفسير جملة من القرآن الكريم.
مؤلفه: صبغة الله الحيدري (ت - ١١٩٢هـ)؟
کۆچی دوایی مامۆستا سی ساڵێک دەگەڕێتەوە بۆ دواوە. کەچی دوای ئەمە لە لاپەڕە ٩٢دا دەڵێ:
- حاشية على تفسير البيضاوي.
مولفها: صبغة الله بن ابراهيم بن حيدر الحيدر الحسين آبادي (ت- ٩٥٣هـ) ٢٠٠ ساڵێک گەڕانوویەتیەوە!
- رسالة في التفسير. ص: ١٠٩.
هەروەها سەیرتر ئەوەیە لە لاپەڕە ١٥٠ی هەمان بەرگی هەمان کتێبدا، جارێکی دیکە ئەو دەستخەتە کە لەلاپەڕە ٦٤دا باسکراوە بێ جیاوازیی بەژمارەیەکی تر نووسراوەتەوە.
لە لاپەڕە ٦٤ دەڵێ:
١٧١- تفسير واعراب بعض الآيات القرآنية.
لە لاپەڕە ١٥٠یشدا دەڵێ:
٤٤٧- مسائل في التفسير واعراب بعض الآيات الكريمة.
ئەمانە بەگوێرەی ژمارەی دەستخەتەکە و ژمارەی لاپەڕەکان هەردووکیان یەک دەستخەتن و بەهەڵە دووپاتی کردووەتەوە.
لە بەرگی چوارەمی هەمان کتێبدا باسی:

- رسالة في الطاعون ص: ٣٠٨.

هاتووه. که له (دار العراق للمخطوطات)شدا نوسخەی هەیە و باسیمان کرد.

لێرەدا ساڵی کۆچی دوایی بووە بە (١١٨٧هـ).

## حەیدەری کوڕی ئەحمەدی حەیدەریی

٤١٦

ئەم مامۆستا لە دەستخەتەکانی بەردەستماندا - جگە لە دانراوەکانی و مێژووی نووسینەوەی هەندێکیان - شتێکی ئەوتۆمان لەسەر ژیانی دەست نەکەوتووە. وایش دیارە لە فیهرەستەکاندا ناوی دوو حەیدەر تێکەڵاو بووە، چونکە هەرچیم دیوە هەر دەربارەی حەیدەری دووەم بووە. لە دەستخەتی ژمارە (٤١٤٩٢)دا دەردەکەوێ ئەم مامۆستا ساڵی ١٠٩٧ لە گوندی ماوەرانی ناحیەی (صهران - سۆران) مامۆستا و کەڵەمەلای ئەو ناوچە بووە و، ئیبراهیمی کوڕی محەمەد کە ئەو کاتە فەقێی بووە و، لای خوێندوویە، دەڵێ: (مولانا حيدر أفضل علماء الزمان).

بەپێی دەستخەتی ١٧٠٩٢ د.ع و لەسەر نووسینی باوکی ئەم مامۆستامان ڕۆژی دووشەممەی ١١ی مانگی شەوالی ساڵی ١٠٣٨ لە دایک بووە.

لە دەستخەتی (١٧١٤٩)یشدا دەڵێ: لە ساڵی (١١٤٤)دا نووسراوەتەوە، لەوێدا دەڵێ: (قد وقع الفراغ من تنميق الحاشية المنسوبة الى مولانا حيدر المرحوم...) لەمەوە دەردەکەوێ کە ئەو کاتە مامۆستا لە ژیاندا نەبووە.

لێرەدا بەسەر ئەوەدا ناڕۆم کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە (علماؤنا في خدمة العلم والدين) و مامۆستا زوبەیر بیلال ئیسماعیل لە (علماء ومدارس في أربيل)دا لەلایەکەوە دەڵێن هاوچەرخی ئیبنوحەجەر بووە و، ئەویش لە ٩٧٤دا کۆچی دوایی کردووە، مامۆستای حەیدەریش کەمێک دوای ١٠٠٠ کۆچی دوایی کردووە. سەرچاوەکانی (عنوان المجد) و (التعريف بمساجد السليمانية ومدارسها الدينية)ش سەرچاوەی ئەمان بوون، بەڵام وەک بینیت و نووسیمان مامۆستای حەیدەریی لە ١٠٩٧دا لە ژیاندا بووە و لە ١١٤٤دا لە ژیاندا نەبووە، بەڵام کەی کۆچی دوایی کردووە؟ جارێ!

## حاشیەی حەیدەر بەسەر (خیالی)دوە: ١٠٦٦٢

سەرەتاکەی:

وبعد: فيقول الفقير الحقير المعترف بالعجز والتقصير، حيدر بن احمد الكردي الحسين آبادي: لما كانت الحاشية المنسوبة الى المولى الخيالي على شرح العقائد للعلامة الثاني المحقق التفتازاني مشهورة، ولم يكن لها فيما رأينا تعليقات وافية بكشف معانيها، وكافية كل معاقدها، وتبيين عباراتها ومعانيها... علقت عليها تعليقات ارجو أن تكون مبطلة لطلسمات كنوزها المكنوزة في مخازن العبارات...

کۆتاییەکەی:

تم الاخراج من السواد الى البياض في الليلة الثالث من شهر صفر الخير. اللهم اجعلها ذخيرة ليوم البعث والميزان، ووفقنا لتدريسها وتصحيفها نحو ماية مرة يا رحمان يا حنان، واجعلها نافعة للطلاب بحرمة رسولك الذي نشرت به على الآفاق نور الايمان، ومحوت آثار الشرك والطغيان».

نووسەرەوە لێرەدا هیچی نەنووسیوە، بەڵام وا پێ دەچێت ئەم قسەی سەرەوە قسەی دانەرەکەی بێت.

## حاشیەی (حیدر)ی کوڕی ئەحمەد بەسەر (اثبات الواجب)دوە (١٠٨٢١)

سەرەتاکەی:

«فيقول الفقير الى عفو ربه الغني، حيدر بن احمد الكردي الحسين آبادي: لما رأيت الطلبة قد صرفوا عنان عزائمهم وتوجهوا لجمع شراشرهم نحو البحث عن تحقيق حاشية الاستاد المولى الكامل الفاضل، وحيد دهره رئيس علماء عصره، مولانا ميرزاجان الشيرازي، على حاشية العالم النحرير والمحقق الكبير، سند المتأخرين تاج المدرسين، مولانا محمد الحنفي القره باغي الواقعة على الرسالةالقديمة في اثبات الواجب لافضل المتأخرين، سند المدققين برهان الملة والدين، محب رب العالمين جلال الاسلام ومغيث المسلمين، مولانا جلال الدين محمد بن أسعد الصديقي الدواني... فتيهوا في بوادي دقائقها...

کۆتاییەکەی:

«تمت النسخة المنسوبة الى حيدر أفندي از دست أقل الناس عباس لأجل جناب فضيلت شعار، بلاغت دثار، عمدة الاكابر والافاضل، افتخار الاعاظم والاماثل، حاوي اصناف الفنون والعلوم، أعني مولانا عبدالرحمن ادام الله تعالى مآثر فضائله آمين.

ئەم مەولانا عەبدورەحمانە مامۆستا مەلا عەبدورەحمانی رۆژبەیانییە.

دەستخەتی ١٠٤٨٨ د.ع نوسخەیەکی دیی ئەم کتێبەیە و ساڵی ١٢٢٢ بەخەتی محەمەدی کوڕی سولەیمانی بەغدادیی لە مەدرەسەی (الاحمدیە) نووسراوەتەوە.

دەستخەتی ژمارە (٤٢٤٤٣ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە، لە کۆتاییەوە ناتەواوە.

لەسەر دەستخەتی ژمارە ٣٦٦٨٦ نووسراوە: «حاشية ملا حيدر علي عصام الوضع»

سەرەتاکەی ئاوایە:

«قوله للايماء الخ يعني أن هذا موضوع للايماء الى الحاضرة في الخارج...»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«والعلامة اللفظي أقرب للذهن من العلامة المعنوي. تمت هذه النسخة من يد مصطفى غفرالله له ولسائر المسلمين. اجمعين. في سنة ١٢٢٠.»

یەکێکی دی لە دانراوەکانی مامۆستا حەیدەر کتێبی حاشیەیەتی بەسەر ڕیسالەی (عضديه)وە و، بەژمارە (٥١٠٧) پارێزراوە و سەرەتاکەی ناتەواوە و، بەم جۆرە کۆتایی هاتووە:

«فلا يكونا جزأين آه حقيقة. هذا ما أردنا ايراده لتحقيق ما في صفحات الرسالة العضدية المنسوبة الى عصام الدين. والحمدلله على الاتمام والصلاة والسلام على رسوله خير الانام. وعلى آله الكرام. تمت الحاشية المنسوبة الى مولانا حيدر بعون الله المعين الاكبر، نصفه من يد حمزة، ونصفه من يد فقه ابراهيم تلميذه في يوم الجمعة، في مدرسة سليمان پاشا في وقت حكومته في سنة ١١٦١ من الهجرة النبوية صلى الله عليه وسلم لا اله الا الله محمد رسول الله».

دەستخەتی ژمارە (٤٣٤٤)یش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و، سەرەتاکەی ئاوایە:

«اما بعد: فهذه فوائد شريفة، وتعليقات لطيفة، على تحقيقات مختفية، في صفحات شرح الرسالة الوضعية للعلامة المحقق، والنحرير المدقق، قبلة الكلام، وكعبة المرام. أفضل المتأخرين وأكمل المتبحرين، ابراهيم بن محمد بن عربشاه الاسفراني، عصام الدين تغمدهم الله بغفرانه، وأسكنهم بحبوحة جنانه. جمعها تراب أقدام الطلاب الذي اذا غاب لم يذكر، واذا حضر لم يعرف، المقر بالعجز والتقصير، المعترف بقلة البضاعة وقصور الباع عن هذا الامر الخطير، أفقر الخلق الى الله الغني حيدر بن احمد الكردي الحسين آبادي».

کۆتاییەکەیشی:

«تمت الحاشية المسماة باسم محشيها حيدر الواقع على الشرح الوضعية الرسالة العضدية لمولانا عصام الدين بيد الاحقر والقريب...»

٤٢٢٦٢ د.ع نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە، بەڵام جارێکی دیش دەستێکی چەپەڵ بەئارەزوو ناوی نووسەرەوە بەرێزەکەی و مێژووی نووسینەوەیشی دڕاندووە!

(١/٣٠٧٥٣ د.ع) ئەم ژمارەیش نوسخەیەکی دیی ئەم کتێبەی پێ پارێزراوە. دوور نییە ئەم ژمارە بەخەتی دانەرەکەی بێت.

(١٠٤٤٧ د.ع)ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە، بەڵام ناتەواوە.

نوسخەیەکیشی لە کتێبخانەی مەرکەزیی ئەوقافی بەغدادا بەژمارە ١٣١٩٤ پارێزراوە.

## نوسخەیەکی دی لە حاشیەی لەسەر ریسالەی (وضع)

١٣٥١٤

لە کۆتاییەکەیەوە نووسراوە:

«قد رأيت في نسخة المحشي مكتوباً بيده: تم بعون الله تعالى وحسن توفيقه النقل الى البياض صبيحة يوم الثلثاء، وكان اليوم الرابع بعد عشرين خلت من شهر الله تعالى المبارك رمضان في السنة الخامسة بعد تسعين والف مضت من سنين هجرة من أنزل عليه القرآن صلوات الله تعالى عليه وعلى آله وأصحابه وتسليماته ما دارت الافلاك ودام على المرافقة الفرقدان. ونرجو من الله تعالى الملك المنان أن يحيي قلبنا يوم تموت فيه القلوب وتهزّ فيه الابدان، ويرزقنا

شفاعة نبينا محمد صلى الله عليه وسلم ويمن علينا بالغفران يا حنان يا ديان، انتهى. الحمدلله على الاتمام، والصلاة والسلام على سيد الآنام، وعلى آله وأصحابه والكرام. قد وقع الفراغ من مقابلته وتصحيحه على النسخة التي كتبها المحشي بيديه جعله الله ناجياً في قبره، وحشره في زمرة احبته على يد أضعف الطلاب...»

لێرەدا بەهۆی جزوبەندکردنەوەیەوە ناوی نووسەرەوەکە براوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە نووسراوە تم الكتاب بعون الملك العلام أحقر خلق الله محمد شريف بن مرحوم حاجي محمد سادق بهبهاني ١١٦٩.

دەستخەتی ژمارە ١٣٧٩٨ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە و ساڵی ١٢٥١ نووسراوەتەوە بەڵام دەستێکی چەپەڵ کۆتاییەکەی شێواندووە و، مێژوو و ناوی نووسەرەوەی کووژاندوەتەوە. ئەوەندەیش دیارە کە لە قەڵای هەولێر و لە مزگەوتی (الاحمر) نووسراوەتەوە.

شایانی باسە ئەم کتێبە (محاکمات)ە بۆ (محاکمات)ی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری باوکی دانەر ئەڵێ:

«... علقت عليه تعليقات تذلل صعابه، ويميز عن القشر لبابه، تتمة لما أهملتاه، تكملة لما أجملتاه، وتكون كالحاشيتين ومحاكمة بين ما وقع بين الناظرين. [وهما الوالد احمد بن حيدر ومولانا حسين الخلخالي].

تعليقات على المحاكمات

المحاكمات: ٢/١٣٧٩٨

سەرەتاکەی:

وبعد: فيقول افقر الخلق الى الله الغني، حيدر بن أحمد الكردي الحسين آبادي: لما رايت رغبة المحصلين ومعظم توجههم الى تحقيق ما في صفحات شرح العقائد العضدية لأفضل المتأخرين، يعسوب المحققين مولانا ملا جلال محمد بن اسعد الصديقي الدواني، ولم يشتهر عندنا مما عليه من التعليقات سوى حاشية مولانا حسين الخلخالي، وحاشية الوالد رحمهما الله الباري المسمى(!) بالمحاكمات».

وبقيت بعد مخدرات منه ما ارتفعتا عنها النقاب بايادي البيان، كأنها حور لم يطمثهن انس ولا جان. وشوارد ما ذللتا اياها بحيث تكون مطيعة للأذهان، بل

بقت سقطت! النفوس في وهدات الزور والخذلان، وطارحة* لها عن شاهق الصواب الى حضيض الخيبة والخسران، علقتُ عليها تعليقات يذلل صعابه، وتميز عن القشر لبابه، تتمة لما اهملتاه، ومبينة لما احتملتاه، وتكون كالحاشية للحاشيتين ومحاكمة بين ما وقع بين الناظرين. وأرجو أن تكون ذخيرة ليوم الميعاد، وسبباً لنجاتنا في يوم البعث والمعاد[1].

مێژووی دانانەکەی ١٠٩٥ی کۆچییە لە مانگی ڕەمەزاندا، عەبدوللەتیفی کوڕی سەید محەمەدی (عبدالقهار زاده) لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٣٩دا نووسیویەتیەوە.

کۆتاییەکەی:

«تمت الكتاب بعون الملك الوهاب من يد العبد الفقير الى الله الغني...»

[دەستی چەپەڵی بازرگانیکەر بەبەرهەمی زانایانەوە شێواندوویە و ناوی نووسەرەوەکەی کووژاندووەتەوە...].

١٣٥٤٢ نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە. هەروەها (٥٧٤٢ د.ع)ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە.

نوسخەیەکی دی (المحاكمات)

حاشية حيدر بن احمد علي الرسالة الوضعية ١٧١٤٩

کۆتاییەکەی:

«قد وقع الفراغ من تنميق الحاشية المنسوبة الى مولانا حيدر المرحوم من يد أضعف العباد وأفقرهم وأكثرهم ذنباً الى رحمة الرحيم الرحمان اللطيف الديان ابوبكر بن يوسف بن يوسف شيخان الغريب في الماوران في اليوم المبارك يوم الاربعاء في شهر الله المبارك المحرم في سنة اربعة واربعين بعد المائة...»

(٣٠٧٤٨ د.ع) نوسخەیەکی ئەم کتێبەیەو، مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە.

---

(١) ئەم دوو سەرەتا دەری دەخەن کە نووسەرەوە چ دەورێکیان هەیە لە هەڵە و ناتەواویی دەقدا.

## تعليقات على أشكال التأسيس ١٠٢٤٤١٠/٢

سەرەتاكەی:

وبعد: فيقول الفقير الى الله الغني حيدر بن احمد الكردي الحسين آبادي:

لما كانت نسخة حاشية ابي الفتح محمد الهادي التي عندنا على شرح اشكال التأسيس المسمى بشرح تحفة الرئيس لمولانا شيخ الصناعة موسى الشهير بقاضي زاده الرومي...

كۆتاییەكەی ناتەواوە.

دەستخەتی ژمارە ٥٢٨٧ی كتێبخانەی ئەوقافی مەركەزیی بەغدا حاشیەی حەیدەری كوڕی ئەحمەدی حەیدەرییە بەسەر میرزاجان بەسەر قەرەباغییەوە، زنجیرەی ڕشتەی پشتیشیان بەم شێوە لە كتێبەكەدا نووسراوە:

حيدر بن احمد بن حيدر بن محمد بن پيرالدين بن علاء الدين وهم المنتسبون الى الشيخ صفى الدين الاربلي...

نموونه لە دانراوی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی حەیدەری

## حاشیەی حەیدەری کوڕی ئەحمەد بەسەر لارییەوە

دەستخەتی ژمارە (٣٥٩٨ د.ع) حاشیەی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی حەیدەرییە بەسەر حاشیەی (مصلح الدین اللاري)وە، کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

«وبعد: فيقول تراب اقدام الطلاب، الذي اذا غاب لم يذكر واذا حضر لم يعرف، افقر الخلق الى الله الغني حيدر بن احمد الكردي الحسين آبادي: لما كانت الحاشية للمولي المحقق، والنحرير المدقق، المولي المدعو بمصلح الدين اللاري الانصاري، الواقعة علي شرح القاضي على الهداية، للمولي النحرير مولانا حسين المبيدي قد اشتهرت...»

دوای پێشەکیەکی لاپەڕەیی کتێبەکەی پێشکەشی -دیارە میرێک یان شتێکی وا بووە- مستەفا ناوێک دەکات و لەم بارەوە دەڵێت:

«... شبيه العلامتين في الفنون الادبية، وهو المتخلق بأخلاق الكرام، المتحري للحلال، المتجنب عن الحرام. مصطفى بيك لا زالت سرادقات دولته مبسوطة على الافاضل، وأشجار رأفته مثمرة للاماجد والاماثل...»

دەستخەتێکی گەورەیە ٣٠٠ لاپەڕە زیاتر دەبێت، بەڵام ناتەواویشە.

١٥/ح حاشیەی بەسەر عیصامەدینی وەضعەوە

ئەم دەستخەتە حاشیەی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی کوردیی ماوەرانییە بەسەر عیصامەدینی وەضعەوە.

سەرەتاکەی:

«الحمد الله الذي أقرّ بربوبيته... جميع العباد، وأفهمها وضع الحلمات ليتوصلن به الى تدبير المعاش والمعاد...»

کۆتاییەکەی:

«فلا يكونان جزئيين حقيقة، هذا ماأردنا ايراده لتحقيق مافي صفحات الرسالة العضدية المنسوب الى عصام الدين».

حاجی عەبدوڵڵای (کوری) لەبەر خاتری مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا محەمەد نووسیویەتیەوە.

دوادەست لای صیغەتوڵڵای کوڕی ئیبراهیمی حەیدەریی بووە.

٤٣٨٧٩ د.ع حاشیەی بەسەر خەیاڵییەوە. ئەم دەستخەتە حاشیەی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری حەیدەرییە بەسەر خەیاڵییەوە. ناتەواوە

١٠٤٨٨ د.ع ئەم دەستخەتەیش حاشییەیەتی بەسەر قەرەباغییەوە.[١]

## محەمەدی کوڕی حسەینی حەریریی

### ٤١٧

مامۆستا ئیبراهیم فەصیحی حەیدەریی لە کتێبی (عنوان المجد)دا دەفەرموێ: یاسای ژن و ژنخوازیی لەناو بنەماڵەی حەیدەرییدا وابووە کچیان بەغەیری بنەماڵەی حەیدەریی نەداوە و، تەنیا جارێک ئەم سنوورە شکابێت -بەپێی ئەوەی ئەو زانیویەتی- ئەوە بووە کە کچێکی مامۆستا ئەحمەدی کوڕی حەیدەر دراوە بەپیاوێک کە ناوی حسەین بووە -نازانین پلەی خوێندەواریی چۆن بووە- بەڵام لە نەوەی ئەم کچە -ئەوەی زانیبێتمان- پیاوێک کەوتووەتەوە کە ناوی محەمەد بووە[٢]، ئەم محەمەدەیش بووە بەزانایەکی گەورە وەک زانایانی دیکەی بنەماڵەی حەیدەریی و، ئەمیش بووە بەخاوەنی دانراو و حاشیە و تەعلیقاتی بەسەر کتێبە ناودارەکانی زانایانی جیهانەوە.

ئەوەی من دەستم کەوتبێت و، تا ئێستە هەواڵیم زانیبێت ئەم دانراوانەیەتی:

١- حاشیەی محەمەدی کوڕی حسەینی حەریریی بەسەر (میر ابي الفتح)ەوە:

سەرەتاکەی:

«... وبعد: فإن أضعف عبادالله وأحوجهم الى غفرانه محمد بن حسين أصلح الله تعالى حالهما وحقق بلطفه آمالهما يقول: بعد ما حصلت قراءة تدقيقات المحشي المدقق ابو الفتح في الآداب على الشرح المشهور بين اولي الالباب عند المخدوم بالحق والاستاد المطلق مولانا حيدر بن احمد بن حيدر لازال اعناق الخلائق...».

---

(١) کاتی خۆی زانیاریی زیاترم لە دەستخەتەکە وەرنەگرتووە.

(٢) بەڵام من ناوی مامۆستایەکی دیم دۆزیوەتەوە کە ئەویش لە دایکییەوە لە بنەماڵەی حەیدەریی و لە زانایانی ئەو بنەماڵەیە. ئەو مامۆستا ئەبوبەکری کوڕی مەحموودی کوڕی سواری کوردی -یا گەردی- یە. خۆی دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەر باپیری بووە.

ئەحمەدی کوڕی شاکیری کوڕی سەید تالبی دووریی ساڵی ١٣١٤ نووسیویەتیەوە.

ئەم دەستخەتە بەژمارە (٤٢٣٨٤ د.ع) پارێزراوە.

دەستخەتی ژمارە (٥١٦٥ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی حاشیەی محەمەد حسەینی حەریریبیە بەسەر (میر ابي الفتح)ەوە، کۆتاییەکەی ئاوایە:

«... تمت كتابة الحاشية المنسوبة الى مولانا محمد بن حسين الواقعة على الحاشية المسماة باسم مصنفه وهو امير ابو الفتح الكاشفة لرسالة الحنفية في علم الآداب، بيد أقل الطلاب عمر بن حيدر بن ميرزا على بن استاد محمد بنا في قصبة ساوجبلاغ في يوم ثاني عشر من شهر الرجب في سنة ١٢٣٥...»

شایانی باسە ئەم مامۆستای نووسەرەوە مامۆستا مەلا عومەری عەسکەرییە، کە دوایی بووە بەمەلا چاک و، لە کەرکووک مامۆستا بووە و مزگەوتی خۆی بووە.

* دەستخەتی (٧٧٨٥ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە عەلیی خالیدی کاوانیی زراریی ساڵی ١٢٩٢ نووسیویەتیەوە.
* هەروەها دەستخەتی ژمارە (٢/٢٠٧٧٨ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و، کۆتاییەکەی ناتەواوە.
* دەستخەتی (٢/١٣٩٧٥ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە، عەبدولغەفوور ناوێک ساڵی ١٢٥٩ لە گوندی شەقڵاوە نووسیویەتیەوە.
* دەستخەتی ژمارە (٢٥٢٠٤ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و، ئیبراهیمی کوڕی شکووری کوڕی سەید محەمەدی کەلیجی ساڵی ١٢٤٥ (یان ١٢٦٥) (في وقت مجيء العروس الى دار العجم) نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ١٤/ح یش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە کۆتاییەکەی ئاوایە:

«تمت الكتاب المسمي بمحمد بن حسين الواقع على أمير ابو الفتح الواقع على الرسالة الحنفية على يد أحقر العباد وتراب أقدام الطالبين طريق الحق للعباد عبدالله الملقب بحبش بن مصطفى الحداد رحمهما الله مع جميع العباد بحرمة من خلف بحرمته جميع العباد، في تاريخ سنة الف ومائتين وثلاث واربعين من الهجرة».

دەستخەتی ٤٢٣٣٨ د.ع ش نوسخەیەکی دیەتی، محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا بەگی کوڕی یونس ئەفەندیی کوڕی یەحیا ئاغای کوڕی مەحموود ئاغای کوڕی مەحموود ئاغای

کوڕی طاها ئاغای کوڕی سەلیم ئاغای کوڕی عەلی ئاغای موصلّیی سالّی ١١١١ نووسیویەتیەوە.

ەستخەتی ٤٣١٢٤ د.ع ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە.

٢- تەعلیقاتی محەمەدی کوڕی حسەینی حەریریی لەسەر عیصامەدینی وەضع:

سەرەتاکەی:

«قوله: للإيماء، يعني إن هذه موضوع للايماء الى المحاضرة في الخارج، واستعمل هنا مجازاً...»

کۆتاییەکەی:

«... هذا آخر تعليقات الفاضل محمد بن حسين على عصام الدين، بأنامل الفقير الذليل عبدالله بن كاكيل، في بلد بغداد دار المراد، حميته عن الفساد الى يوم الميعاد، في المدرسة علي پاشا نورالله مضجعه، لأجل جناب أفضل الأكرم مولانا ملا صالح. وقد بلغ باتمام هذا الكتاب في نصف جمادي الاول سنة أثني(!) وأربعين ومائتين بعد الالف من هجرة النبي -صلى الله عليه وسلم-»

«تشرف بتملكه بالشراء الشرعي غبار مجلس المحصلين احمد بن حسن الروزبهاني عفى عنهما أجمعين.»

ئەم دەستخەتەیش بەژمارە (٤٢٣٨٥ د.ع) پارێزراوە.

* دەستخەتی (٢/٢٢٠٩٣ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و، کۆتاییەکەی ناتەواوە و یوسفی کوڕی مەلا شەریفی کەرکووکیی سالّی ١١٦٦ لە مەدرەسەی مەولانا ئەحمەدی ناسراو بە (الاحمر - سوور) لە گوندی خەرابە نووسیویەتیەوە.

٣- حاشیەی بەسەر نامیلکەی (جهة الوحدة)ەوە.

مامۆستا محەمەدئەمین دانراوێکی دی هەیە کە حاشیەیە بەسەر نامیلکەی (جهة الوحدة)ەوە و، لە (د. ع)دا دوو نوسخەی هەیە بەژمارەکانی ٤٢٥٥٨ و ٤٣١٧٥ پارێزراون، کاتی خۆی سەرەتا و پێشەکییانم نەنووسیوە.

دەستخەتی ژمارە ١٠٥١٩ د.ع ش چەند دانراوێکی لە عیلمی (جەفر) تێدایە هەموویان بەخەتی ئەم مامۆستان.

## ابو الفضل ضیاءالدین حیدر

٤١٨

یەکێکی دی لە زانا مەزنەکانی ئەم بنەماڵە حەیدەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەرە کە نازناوی (ابو الفضل ضیاءالدین) بووە.

خۆشبەختانە لە ڕێگەی دەستخەتەکانەوە شتێکی دروست لە ژیانی ئەم مامۆستامان دەزانین کە دەربارەی کەسی دیکەیان ئەوەمان بۆ نەڕەخساوە. ئەویش بەبۆنەی باوکی دڵسۆزییەوە -خودا پاداشی بەخێری بداتەوە- کە لەلایەکەوە ساڵی لە دایکبوونیمان بۆ دیاریی دەکات کە ساڵی (١٢٤٦ک) بووە.

لەلایەکی دیکەوە -کە ئەمەیشیان لەوی دییان بەبایەخترە- لایەنێکی زانیاریی و مێژوویی ناوچەی کوردستانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە لەوانەیە لە دەم و قەڵەمی ئەم مامۆستاوە نەبێ نەیزانین، وەک ئەویش کە لە قەڵەمی ئەم وەربگیرێ نرخ و تامێکی دیکەی هەیە.

کاتێ زانایانی حەیدەریی لە بەغدادا بوون و سەرۆکایەتیی زانیاریی و موفتێتیی بەغدایان لە دەستدا بووە، قوتابیان و شەیدایانی بواری زانستیی لە هەموو لایەکەوە ڕوویان تێکردوون و بەپەرۆشەوە لەبەردەمیاندا بەچۆکا هاتوون و، دەرسیان خوێندووە و، زانیارییان لە دەریای بێ پایان و پەییان هەڵگۆستووە و، شانازییان بەوەوە کردووە کە لە لای یەکێک لە زانایانی ئەو بنەماڵە خوێندوویانە، خۆ ئەگەر ئیجازەیان لە یەکێکیان وەرگرتبێت ئیتر ئەوە شانازییەکەیان سنوور و ئەندازەی نەزانراوە... لە وەها کۆڕ و کۆمەڵێکدا یەکێک لە گەورە زانایانی ئەو بنەماڵە کە عەبدوڵڵای کوڕی حەیدەری خاوەنی چەندین دانراوی بەرزی جۆراوجۆری زانیارییە عەقڵیی و نەقڵییەکانە و مامۆستایەکی گەورە و پایەبەرزی سەردەمی خۆی بووە... کوڕی خۆشەویست و جێگەی هیوای ناردووە بۆ کوردستان تا لەوێ فێری زانیاریی ببێت و، بەمێشکی پڕ لە زانیاریی نەقڵیی و عەقڵییەوە بگەڕێتەوە بۆ بەغدا و، ئەم مامۆستایش تەنها مامۆستای ئەو بنەماڵە نەبووە ئەم ڕێگەی گرتووە و، مامۆستا سیبغەتوڵڵای باوکی ئیبراهیم فەصیح دوای ئەوەی ئیبراهیم لەدایکبووە ٩ نۆ ساڵ لە کوردستان خوێندوویە و فێری زانیاری بووە. لەم ڕووەوە لەپاڵ دەستخەتی (٤٢٦١ د.ع)دا نووسیویە:

بسم الله الرحمن الرحيم

قد سافر ولدنا العزيز أبو الفضل ضيا ءالدين حيدر، الى طرف كردستان لتحصيل العلوم النقلية والعقلية، في يوم الثامن عشر من الشهر الجمادي الاول في يوم الجمعة والنيروز، وأبرأت ذمته ابراء شاملاً لدعاء الخير والسعادة وحصول المقصود من العلم والصلاة والنيل الى المرام الدنيوية والاخروية، ونرجو من الله سبحانه وتعالى الاجتماع بالصحة والسلام قبل انقضاء مدة حياتنا آمين. وتصادف هذا الأمر في مجيء والي ولاية العراق -حفظه الله تعالى من الحسد والنفاق- محمد صالح وجهي پاشا، يسرالله له ما يحب ويشاء، في تاريخ النبي وسيد المرسلين، عليه أفضل الصلاة وأكمل السلام، الف بعد مائتين وسبعة وستين، آه صد آه من الم الفراق قبل حصول الاتفاق. وعمره -اي حيدر- سبعة عشر سنة، لأن ولادته سنة ١٢٤٦ .»

وەک پێشتریش نووسیم بەداخەوە مامۆستا ئیبراهیم فەصیحی حەیدەریی لە کتێبی (عنوان المجد)دا کە باسی زانایانی حەیدەریی نووسیوە زیاتر خۆی بەوشەئارایی و ڕازاندنەوەی قسە و ڕستەوە خەریک کردووە، ئەگەر بهاتایە لە بری ئەو کارەی بەدانراوەکانی بنەماڵەکەیاندا بگەڕایەت -کە دەیتوانی هەموویان یان بەشی زۆریانی بدیایەت- و، ئەو زانیاریانەی لێیانەوە وەردەگیرێ کۆی بکردایەنەوە، کارێکی گەلێ گەورەی ئەنجام دەدا و، مێژوویەکی تێروتەسەل و دروستی دەنووسی. بەڵام بەداخەوە بەپەیڕەوی نەکردنی ئەم ڕێبازەی زیانێکی گەورەی لە مێژووی ئەم بنەماڵە داوە و، بەچاوگێڕانێک بەم لاپەڕانەدا سووچێکی ئەو زیانە دەردەکەوێ.

ئەم مامۆستا -ئەبولفەضل ضیائەدین حەیدەر- کە مامۆستا ئیبراهیم فەصیح هیچ باسی نەکردووە، لە ڕێگەی دوو دەستخەتەوە دەتوانین هەندێک لە ژیانی بزانین، ئەوەتا لە ڕێگەی دەستخەتی ژمارە (٤٢٦١ د.ع)ەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم مامۆستا لە ١٢٤٦ک دا لە دایک بووە و، دوای خوێندنی سەرەتایی و خوێندنی باوی ئەو سەردەمە بۆ تەواوکردنی خوێندن باوکی ناردوویەتی بۆ کوردستان[١].

---

(١) لێرەدا هەڵەیەک لەم مێژووەدا هەیە کە دەڵێ کوڕەکەی تەمەنی ١٧ ساڵ بووە کە لە ساڵی ١٢٦٧دا ناردوویە بۆ کوردستان و ساڵی ١٢٤٦ش لەدایکبووە؟ چونکە بەو پێیە دەبێ تەمەنی لە ٢٠ ساڵ کەمتر نەبووبێ. دەستێکی چەپەڵ دوو سێ پەڕەی لە دەستخەتەکە دڕاندووە کە دوور نییە مێژووی نایابیان تێدا بووبێت.

لە دەستخەتی دووەمیشەوە کە دانراوی مامۆستا ضیائەدین خۆیەتی و بەژمارە ٢٦١٦٨ پاریزراوە، بەشێک لە توانا و گەشت و گەڕان و کاری دەردەکەوێت وەک دەیخوێنینەوە – دوای دوو لاپەڕە پێشەکیی–:

(وبعد: فيقول أفقر العباد، وأحوجهم يوم التناد. الى الإمداد الرباني ضياءالدين حيدر الحيدري البغدادي، بن عبدالله الشهير بالداغستاني: إني منذ سنين وأعوام مغرماً بقصيدة البرأة للمولى الإمام، من فاق العشاق لجمال

قد اتى يا نور عيني منك نور ايتي نور
فصداي وضلالي منك يا كل سروري
لم يطق كل عذول فيك يرميني بزور
وكذا كل هواء لم يطق اطفاء نوري

وهم عن الوشاة والعذال معتزلون هكذا يكون المجنون العاشقون
الهائمون الصادقون ... على سيد الاكوان وحبيب
الملك الديان، الراكع الساجد والزاهد العابد صاحب الآيات
الظاهرة، والمعجزات الباهرة، من بمولده انشق الايوان وبدعوته
الغور للعيان، راكب البراق، ومخترق السبع الطباق ودنى فتدلى
فكان قاب قوسين او ادنى، ذو الخد الاسيل والطرف الكحيل
والكوثر والسلسبيل الشفيع لجميع الانام والمسبح في كفه الحصى والطعام
مجير الظبي والبعير والمنفجر من بين اصابعه الماء النمير من طابت
ببركته الاثمار وانقادت بين يديه الاشجار المنصور المؤيد والمختار
المجيد سيدنا ومولانا اللهم صل عليه وعلى اله ملأ الفضاء وعدد
النجوم في السماء صلوة دائمة بدوامك لا انتهاء لها ولا انقضاء وسلم
تسليما كثيرا الى يوم الدين والحمد لله رب العالمين. وبعد فيقول
افقر العباد، واحوجهم يوم التناد، الى الامداد الرباني ضياء الدين حيدر الحيدري
البغدادي بن عبدالله الشهير بالداغستاني، اني منذ سنين واعوام
مغرما بقصيدة البرأة للمولى الامام من فاق العشاق لجمال رسول الله
والهائمين المغرمين بحبه الشيخ الكامل والعالم العامل مولانا
محمد البوصيري قدس الله تعالى سره وافاض علينا بره. فلما

نموونە لە دانراوی ضیائەدینی حەیدەری

رسول الله، والهائمين المغرمين بحبه لله. الشيخ الكامل، والعالم العامل، مولانا محمد البويصيري - قدس الله تعالى سره، وأفاض علينا بره- فلما وفقني تعالى لزيارة قبره وقت عودتي من مدرسة جامع الأزهر، واستنشقت في أسكندرية طيب ثراه الأعطر، خطر لي إذ ذاك أن أشرحها، وإن لم أكن أهلاً لذلك، ولا ممن سلك مثل هذه المسالك، راجياً الدخول في سلك من خدم لهذه المدحية في فخر الأمم. وطلبت من الناظم عند قبره الرخصة، لعلمي أن ذلك أوفق فرصة، فاستخرت الله عز وجل على ذلك المراد، واستمددت من روحانية زين العباد، ونمت ليلتيعلى تلك النية، وما انطوي القلب عليه من الطوية، فرأيت في منامي شخصاً ساطع الأنوار، في روضة من النوار، فدنوت منه، وسلمت عليه، ووقفت متأدباً بين يديه، وسمعته يتلو من القصيدة هذا البيت:

هو الحبيب الذي ترجى شفاعته    لكل هول من الأهوال مقتحم

فاستيقظت مرعوباً من ساعتي، واستغفرت الله تعالى من خطيتي، واستدللت بذلك على الإذن بما أنا طالب، وكنت اليه راغب، فأتيت وقت الفجر جامع الناظم، وصليت الصبح مع الجماعة، وقرأت ما تيسر من القرآن الكريم، إذ هو أحسن ما كان عندي من البضاعة، وكتبت هناك متبركاً وتيمنا بسملة الابتداء، واستعنت من المولى المعين على توفيق الانتهاء، وصرت كلما صفى لي وقت من الأوقات، أكتب ما سنح للخاطر الفاتر من شرح بعض الأبيات، فجاء بحمد الله شرحاً مؤلفاً تستلذ به السامعون، وتقر به الناظرون، وسميته (عمدة الكلام في شرح برأة الأنام). وخدمت به حضرة نخبة الغافين من مناهل الحقيقة، ووصلة العارفين منازل الطريقة...»

تا ئەڵێ:

(السلطان بن السلطان السلطان عبدالحميد خان...)

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

قد وقع الفراغ من تأليفه، بفضل الله تعالى وحسن توفيقه، عصر يوم الجمعة يوم الخامس من شهر رمضان الشريف، لسنة الثلاثمائة وأربعة مضت بعد الألف من هجرة سيدنا...

وقد كنت إذ ذاك أسير غوائل تولية القضاء، وغريق بحر الخطايا ورهين سلاسل

البلاء... الله عز وجل أن يجعل سعيي هذا لدى حضرة نبيه -ص- مقبولاً...

تم على يد مؤلفه يوم العاشر من شهر ذي القعدة من السنة المذكورة في قضاء الحميدية».

خۆشبەختانە هەر لە(د.ع)دا دانراوێکی دیکەی ئەم مامۆستام دۆزییەوە کە نیشانەی پێوەندیی بەتینیەتی بە مامۆستایانی کوردستانەوە؛ چونکە شەرحی کتێبی مامۆستایەکی کوردی کردووە و، وا دیارە پێشکەشیشی کردووە بە مامۆستایەکی کورد. ئەمەیش باسێکی ئەو دەستخەتە:

دەستخەتی (١٠٣٩١ د.ع) دانراوێکی مامۆستا (ضياءالدين حيدر)ە کە دەفەرموێ:

(وبعد: فإني لما رأيت الرسالة المنسوبة الى الفاضل التقي، والطاهر النقي مولانا أحمد الگراوي الكردي. تغمده الله بغفرانه. وأسكنه أعلى جنانه، إذ يستصعب الطالب في علم البيان دقيقة، باحثاً فيما بحث عن المجاز والحقيقة، تاقت نفسي أن أكتب، علها ما استحسنت أن يكتب (كذا) وأبين ما يجب أن يطلب فيها ويرغب، وأنا خادم أعتاب العلماء الأعلام، بل غبار أقدام الطلبة الكرام، ضياءالدين حيدر غفرالله له مما زلّ وعثر، وإن كنت في هذا الزمان في قبضة الهم وأسر الامتحان، وإني لأرجو الله تعالى أن يكشف بذلك مما تغشاني من الهم، وينجيني والمسلمين من الغم. وأخدم به حضرة قدوة العلماء المحققين، وعمدة النبلاء المدققين، مفيد الطالبين، حاوي فضائل المتقدمين والمتأخرين. العلامة الأفضل، والفهامة الأمثل، مفيد الفروع والأصول، المتصرف في المعقول والمنقول، مجتهد زمانه، فريد عصر، وأوانه، مفتي الأنام، أوحد الأعلام، مالك قياد الأدب والعلم، سالك سنن الورع والحلم، المشار بالتعظيم اليه، والمفرد المتفق بالثناء عليه، من لبس حلل السعادة كل بهية وسنية، وجمع له في السيادة كل كلية وجزئية، واكتسب من أشكال المعروف المنتخبة لمزيد الثناء عليه كل قضية حملية لا وضعية، الذي سلب الألباب بكلياته وجزئياته، ونظم نتايج الأفهام بحسن مقدماته الوضعية وحملياته، الحسيب النسيب، والفصيح اللبيب، من تسمى باسم الحبيب محمد -ص-...

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«... هذا آخر ما اوردناه، ومن أراد التحقيق في البيان فليتأمل في الحقايق، ليطلع بها على الدقائق، والله أعلم. تم وبالخير عم.

لەو سەرچاوانەی لە دەستماندان باسی ژیان و بەسەرهاتی ئەم مامۆستا نابینرێت، بۆیە دەکرێ ئەم دەقانە وەک سەرچاوەیەکی دروست زانیاریگەلی جۆراوجۆریان لێ هەڵبهێنجین.

لە دەقی یەکەمەوە دەردەکەوێ کە:

یەکەم: ئەم مامۆستا بەڕێزە بەسەفەر یان بۆ خوێندن چووەتە قاهیرە و ئەزهەر و، دواییش چووەتە ئەسکەندەرییە و، زیارەتی گۆڕی بۆصیریی کردووە و، هەر لەوێوە دەستی کردووە بەشەرحی قەسیدەکەی بۆصیریی و ناوی ناوە (عمدة الكلام في شرح برأة الانام) و دواییش کتێبەکەی پێشکەشی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوثمانی کردووە.

لە کۆتایی کتێبەکەیشەوە دەردەکەوێ کە لە سەردەمی دانانی کتێبەکەیدا لە قەضای (حمیدیە) قازیی بووە. ئەوەیش ساڵی ١٣٠٤ بووە.

دانراوی دووەمی ئەم مامۆستا کە شەرحی نامیلکەی بەیانی مامۆستا مەلا ئەحمەدی گەراوییە، شتێکی ئەوتۆی لێ وەرناگیرێ؛ چونکە هیچ مێژووییەکی پێوە نییە. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە ئەم شەرحەی بۆ مامۆستایەکی گەورە و ناوداری ئەو سەردەمە داناوە و پێشکەشی ئەوی کردووە، بەڵام ئەمیش ڕوون نییە کێیە و، بەڕوونیی ناوی نەهێناوە، ئەوەندە هەیە دەڵێ: ناوی هاوناوی پێغەمبەر بووە -صلی الله علیه وسلم- بەڵام لەوە بەولاوە هیچی دیاریی نەکردووە، جگە لە هەندێ ئاماژە و ناوی ژێر پەردە کە دەکرێ لە دووتوێی ئەو ئیشارە و پەردە و هەورانەوە بڕوانینە هەندێ نیشانە و بەڵگە کە گومانی زۆرمان بۆ ئەوە دەچێت کە ئەو مامۆستای ئەم کتێبەکەی بۆ داناوە (مامۆستا مەلا محەمەدی فەیضیی موفتیی زەهاویی) بێت، بەڵام ئەمە هەر گومانە و دەبێ چاوەڕوان بین بەڵکو لەمەولا بەڵگەی زیاترمان دەست بکەوێت.

## ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی حەیدەریی

٤١٩

یەکێکی دی لە زانا بەهێز و بەرهەم بەپێز و دانراو زۆرەکانی بنەماڵەی حەیدەریی ماموستا ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی حەیدەرییە. ماموستا ئیسماعیلیش، وەکو باوباپیران و مام و ئامۆزاکانی، دەورێکی کاریگەر و بالای بینیوە لە پێگەیاندنی قوتابیان و، تێگەیاندنی ماموستایان و، دانانی کتێب بۆیان و، لێکدانەوە و حاشیەکردن لە کتێبە قووڵ و مانا وردەکان. بەڵام دانراوەکانی ئەمیش وەک دانراوەکانی دی ماموستایانی بنەماڵەکەیان لە شوێنێکی باشی تایبەتیدا نەپارێزراون و، دەستی کەمتەرخەمیی و گوێپێنەدان تەرفەنەی ئەملاولای کردوون و، لەوانەیە گەلێکیشیان هەر بەیەکجاریی تێدا چووبن.

هەوڵ دەدەین ئەو دانراوانەی لە (دار العراق للمخطوطات)دا بەرچاوی ئێمە کەوتوون لەم دەرفەتەدا تۆمار بکەین و، خوێنەر و خەمخۆرانیان لێ ئاگادار بکەین، بەهیوای ئەوەی لەمەولا سوودی باشتریان لێ وەربگیرێت.

بەڵام پێش ئەوەی باسی دانراوەکانی بکەم، هەوڵ دەدەم لە رێگەی دەستخەتەکانەوە شتێکی نەزانراو لە ژیانی روون بکەمەوە.

خۆشبەختانە دەبینین باوکی لە پەنای (الرسالة القدسية الطاهرة بشرح درة الفاخرة)دا نووسیویە: (قد ولد لي الولد المسمى باسماعيل، سمي نبي الملك الجليل، اسماعيل بن ابراهيم الخليل، في سنة سبع ومائة والف من هجرة خير الانام».

ئەم دەستخەتە لە د.ع دا بەژمارە (٦١٥٤) پارێزراوە.

## شەرحی (اسطرلاب)

یەکێک لە دانراوەکانی مامۆستا ئیسماعیلی حەیدەریی کتێبی شەرحی (اسطرلاب)ە کە سەرەتاکەی ئاوایە:

«وبعد: فيقول الفقير الى الله الغني الهادي، اسماعيل بن ابراهيم بن حيدر الحسين آبادي: إن المدقق الذكي، والفاضل الألمعي، بهاءالدين محمد العاملي، عامله بلطفه واحسانه، وأذاقه حلاوة غفرانه، لو كان لائقاً بحاله وشأنه...»

دوای پیاهەڵدانی ئەم کتێبە ئەڵێ: منیش شەرحم کرد و ناوم نا (نقش الصفيحة) دواتریش بەپێشەکییەکی دوورودرێژ کتێبەکەی پێشکەشی ئەحمەد پاشای والیی بەغداد دەکات. نوسخەی ئەم کتێبە بەژمارە (٢٠٤٠١) لە (دار العراق للمخطوطات)دا پارێزراوە و کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«هذه أول نسخة خرجت الى البياض بيمين المؤلف في الليلة الرابعة من شهر الله المبارك ربيع الأول، في سنة الرابع وخمسين ومائة والف من الهجرة النبوية المصطفوية. اللهم صل عليه وعلى آله وأصحابه أجمعين. واغفر لنا ذنوبنا ببركتهم، أقول: قد تمت هذه النسخة الشريفة المسماة بنقش الصفيحة على يد أفقر الخلق الى الله الباري ابراهيم بن الحاجي محمود في سنة تسعة وستين ومائة وألف في مدرسة سلطان محمد عمد الله بغفرانه بحرمة نبيه أحمد.»

دەستخەتی ژمارە (١٧٤١٨)ش بەشێکە لە کۆمەڵە دەستخەتێک کە دەستی چەپەڵی بازرگانیکەر بەرەنجی زانایانەوە پارچە پارچەی کردووە بۆ فریودان و پارە پەیداکردن.

ئەم ژمارەیش نوسخەیەکی دیکەی (نقش الصفيحة)ی مامۆستای حەیدەرییە و نووسەرەوەکەی لە کۆتاییەوە نووسیویە:

تم الكتاب المسمى بشرح الاسطرلاب علي يد العمر بن عثمان بعون الملك المستعان. اللهم وفقه بتحصيل العلم وأغفره له ولجميع المؤمنين آمين.

دەستخەتی (٧٧٥٧)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم دانراوەیە و کۆتاییەکەی شتێکی پێوە نییە باسی مێژووی نووسینەوە یان شوێنی بکات. ئەوەندە هەیە لە چەند شوێنێکدا حاشیە و خەتی مامۆستا مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی بەسەرەوەیە.

(٦٨٦١ د.ع) نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە، ناو و مێژووی پێوە نییە.

## حاشیەی ئیسماعیلی حەیدەریی بەسەر قەرەباغییەوە

سەرەتاکەی:

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وآله أجمعين. الاصطلاح اتفاق قوم. الظاهر أن المراد بالاصطلاحات في قول الشارح...

دەستێکی چەپەڵ کۆتاییەکەی کووژاندووەتەوە، ساڵی ١٢٢٧ نووسراوەتەوە.

بەژمارە ٣/١٥٨٩٢ د.ع پارێزراوە.

دەستخەتی (٣/٦٩٢١ د.ع)ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە، ناوی کەس و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە. دڵۆپە لێدراو و تەڕبووە.

## حاشیەی بەسەر فەنەنازییەوە

یەکێکی دی لە دانراوەکانی مامۆستا ئیسماعیلی حەیدەریی حاشیەیەکیەتی بەسەر کتێبی فەنناریییەوە و سەرەتاکەی ئاوایە:

بسم الله الرحمن الرحيم يا الله تمم وبك نستعين ونتوكل

«هذه تنبيهات أوردها الفاضل اسماعيل الحيدري على هذا الكتاب وعليه التوكل في كل الأمور، انه الجواد الكريم الرحيم. قوله: الإصطلاح اتفاق قوم... الظاهر أن المراد بالاصطلاح.

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«من حيث أن تعريفه للفصل كأنه تعريف للمقول المذكور عبارة عن الفصل. تم هذا القدر الذي صنفه الفاضل اسماعيل الحيدري، وقت العشاء ليلة تسع وعشرين من شهر رمضان. اللهم اجعلنا من عتقاء شهر رمضان يا حنان يا منان يا الله، سنة الف ومائتين وسبعة عشر(!) من الهجرة. لا اله الا الله.

الخط يبقى زماناً بعد كاتبه وكاتب الخط تحت التراب رميم. يا الله يا الله يا الله. كنت وقت كتابته مقيماً في زيوه ء عليا، ببلدة كركوك، عند خدمة استادي الفاضل في علوم العقلي والنقلي ما هو الخفي والجلي. وأنا الحقير محمد بن عبدالقادر بن شيخ أحمد بن شيخ ابي بكر».

ئەم دەستخەتە بەژمارە ٢١٩١١ لە (دار العراق للمخطوطات)دا پارێزراوە.

٢٤٦٧٩ ئەم ژمارە بەشێک لە دانراوێکی مامۆستا ئیسماعیلی حەیدەریی بۆ پاراستووین، کە سەرەتاکەی مەبەستەکەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

«وبعد: فيقول أفقر الخلق الى الله الغني الأكبر، اسماعيل بن ابراهيم بن حيدر: لما كانت ثلاثة من المباحث في الشرح الشهير، بمطول التلخيص، أعني مبحث توكيد المسند اليه، ومبحث تقديمه على الفعل وايلائه في النفي، ومبحث لو الشرطية لاتخلو من مشكلات تأبى عنها العقول، وتحتوي على معضلات لاتطلع عليها الا الفحول...»

ئەمە دیارە سەرەتای کتێبێکی گەورە بووە؛ چونکە دانەرەکەی پێشکەشی کردووە بەخەلیفەی عوثمانیی. بەڵام بەداخەوە یان دڕاوە و هەر ئەمەی ماوە، یان دەستی چەپەڵی بازرگانیکەر بەدەستخەتەوە ئەم بەشەی جیاکردووەتەوە و کردوویەتی بەدەستخەتێک.

ئەوەی کە لە دەستدایە شەش پەڕە -دوازدە لاپەڕە-یە.

دەستخەتی ژمارە ١٦٠٧٢ش نوسخەیەکی دیکەی (نقش الصفيحة)یە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«تمت هذه الرسالة الشريفة على يد أفقر الخلق الى عفو ربه الحقيقي، عبدالقادر بن عبدالله الكركوكي، في سنة سبعة وخمسين ومائة وألف من الهجرة النبوية المصطفوية. اللهم صل عليه وعلى آله وصحبه أجمعين، وافض علينا من بركاتهم وأسلك بنا مسالك كراماتهم آمين يا معين».

هەر دوا بەدوای ئەمەیش ئیجازەیەکی ئەم مامۆستا مەلا ئیسماعیلی حەیدەرییە هەیە کە داویەتی بەمەلا محەمەد ئەمین ئەفەندیی کەرکووکی. بەداخەوە ساڵی ئیجازە پێدانەکەی دیاریی نەکردووە.

لە بەرگی دووەمی فیهرەستی مەکتەبەی قادرییەدا ناوی مامۆستا مەلا محەمەد ئەمینێکی کەرکووکیی دەبینین کە شەرحی (بدء الامالي) کردووە، بەدووری ناگرم کە ئەو مامۆستا ئەم مامۆستای ئێرە بێت.

(فیهرەستی مەکتەبەی قادرییە بەرگی: ٢/٣٩٤).

- حاشیەی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی حەیدەریی بەسەر ڕیسالەی وەضعی قەوشەجیەوە، سێ دانەی لە کتێبخانەی ئەوقافی بەغدادا هەیە و بەژمارەکانی:

١- ٤٣٢٦ و ١٣٥٦٤ و ١٣٧٢٧ پارێزراون.

دوانی دواییان مێژووی ساڵی ١٢٣٦یان پێوەییە.

دەستخەتی ژمارە (٤٢٢٢٣، د.ع) نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە کە سەرەتاکەی ئاوایە:

«باسمه سبحانه نحمده، والصلاة على رسوله وعلى آله. قوله: خص الإشارة... الخ اي ميزه عن غيره...»

کۆتاییەکەی:

«لابد في كل صلة من انحصار مضمونه في المعنى المراد بالموصول على ما مر غيره مرة. فلا ينشأ التوهم المذكور منه أيضاً. فافهم.

تمت الحاشية المنسوبة الى اسماعيل بن ابراهيم بن حيدر الواقعة على شرح الرسالة الوضعية للشيخ على القوشجي السمرقندي -رحمه الله- على أفقر(!) العباد الى الله تعالى عبدالعزيز بن ملا محمد الشواف...»

دەستخەتەکە ٤٥ لاپەڕەیە مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە.

دەربارەی مامۆستا ئیسماعیلی کوڕی مامۆستا ئیبراهیمی حەیدەریی لە فیهرەستەکاندا ئەمانە نووسراون:

فیهرەستی مەکتەبەی قادرییە:

بەرگی پێنجەم/ ١٥٦:

٢- نبذة في تفسير آية من القرآن الكريم.

فیهرەستی مەکتەبەی ئەوقافی موسڵ:

بەرگی یەکەم/ ٢٦٩

٤- حاشية على شرح القوشجي على الرسالة العضدية.

فیهرەستی مەکتەبەی ئەوقافی سلێمانی:

بەرگی یەکەم/ ٤٤٦

١٦/٨ حاشية القرهباغي في المنطق.

فیهرەستی مەکتەبەی ئەوقافی عامەی بەغدا، بەرگی سێیەم / ١٩٢

٥٠٢٥ - حاشية على شرح العضدية لعلي القوشجي.

## التحفة الحيدرية في خدمة الدولة العلية

٤٢٠

١٠٣٧٥ د.ع

ئەم ناونیشانەی سەرەوە نامیلکەیەکی بچکۆلەی ١٩ لاپەڕەییە، دانراوی مامۆستا محەمەد سالحی وەجیهی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی غەیاثەدین عیسای کوڕی صیبغەتوڵلای حەیدەرییە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

وبعد: لما درت البلاد الاسلامية، والممالك المحروسة العثمانية، ادامها رب البرية. وأمدّ ظلالها على كافة الانام والملة الحنيفة المحمدية. الى أن وصلت دار السعادة و... السنية، فوجدت... ومن ملكهم شاكرين...

نامیلکەیەکی بچکۆلەیە بۆ هاندانی خەڵک بۆ فەرمانبەرداریی و گوێڕایەڵیی بۆ فەرمانی دەوڵەتی عوثمانیی.

دەستخەتەکە زەرکەفت کراوە و بەخەتێکی خۆش نووسراوەتەوە، بەڵام دوایی کەمتەرخەمی لەتەکدا کراوە و ئاوی بەرکەوتووە و هەندێکی کووژاوەتەوە.

ساڵی نووسینەوەی دیاریی نەکراوە و نووسەرەوەکەیشی ناوی خۆی نەنووسیوە.

ئەم مامۆستا لە کتێبی (علماء ومدارس في أربيل)دا شتێکی ئەوتۆی دەربارە نەنووسراوە.

## ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری حەیدەریی

٤٢١

لە وتاری ئەمجارەماندا لە خزمەت مامۆستایەکی بنەماڵەی حەیدەریدا دەژین کە یەکێکە لە مامۆستا پڕ خێر و بەرەکەتەکان بۆ ئایین و زانیاریی و، لە ژیانی خۆیدا خزمەتێکی زۆری بەڕۆشنبیریی و پێگەیاندنی مەلایان کردووە و، شانبەشانی ئەوەیش کۆمەڵێکی باش دانراوی لە زانیارییە جۆراوجۆرە باوەکانی سەردەمی خۆیدا داناوە و، دەیان نوسخەی دەستخەتیان لەبەر نووسراوەتەوە و لەگەڵێ شوێن و کتێبخانەی گشتیدا نوسخەیان هەیە.

ئێـمـه لێـرەدا -وەک جـارەکـانی دی - له خـزمـەت دانراوەکـانیـدا دەژین و دەمـانەوێ له پەنای دەسـتخەتەکـانیشدا چیمان زانیاریی نوێ دەستکەوت بیانخەینه سەر لاپەڕەی ژیان و بەرهەمی مامۆستا.

یەکەم شتی بەبایەخ لێرەدا دەیخەینه ڕوو ڕاستکردنەوەی ساڵی کۆچی دوایی مامۆستا ئیـبراهیـمـه کە لە سـەرچاوەکـاندا بۆ دیاریکردنـی سەرچاوەی مـەبەسـت سـاڵی ۱۱۵۱یان بەساڵی کۆچی دوایی مامۆستا مەلا ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری حەیدەریی داناوە، بەڵام بەگوێرەی پارچە شیـعـرێک کە لەلای منە و، بەگوێرەی یەکێـک لە دەسـتخـەتەکـانی (دار العـراق للمـخطوطات)ش کـه دانراوێکی ئەم مـامـۆسـتـایە و لە سـەردەمی ژیـانی دانەردا نووسراوەتەوە، ئەم مێـژووە دروست نییە و، مامۆستای حەیدەریی پێنج ساڵ دوای ئەوە، واته لە سـاڵی ۱۱۵٦دا، کۆچی دوایی کردووە و، مێژووی کۆچی دواییشـیان بەحورووفی ئەبجەد بە (گل باغ جنان) داناوە و، پارچە شـیـعـرەکـە شـیـعـری ئیـسـمـاعـیلی کـوڕی ئیـبـراهیـمی دانەری کـتـێـبەکـانە، دڕاوە و، هەوڵ دەدەین لەم زنجـیـرە وتارەدا لەسـەری بنووسین.

دووەم: دیارە کە مێـژوونووسان سـاڵی کۆچی دوایی ئەم مـامـۆسـتـایان بەدروسـتی نەزانن بێـگومـان بۆ سـاڵی لەدایکبـوونی ڕێگەی بەردەمـیـان دژوارتر و ئاڵۆزترە. مـنیش لێـرەدا بەڵگەی ڕوونی لە دایکبوونـی ئەم مـامۆسـتـام لە دەسـتدا نییە و ئومـێدەوارم بەدۆزینەوەی تەواوی دانراوەکـانی حەیدەری باوکی ئەم گرێکوێرە بکرێـتـەوە، بەڵام تا ئەو کـاتە یەک دوو شت ڕوون دەکەینەوە:

أ- دوای لێکۆڵینەوە دەردەکەوێت ئەم مامۆستا بەلای کەمییەوە (۷۵) ساڵ ژیاوە؛ چونکە لە ساڵی (۱۱۰۷)دا مامۆستا بووە و، خاوەنی ژن و ماڵ بووە و کتێبی داناوە.

ب- لەمەیشەوە دەردەکەوێت ئەم مامۆستا بەلای کەمییەوە (۵۰) ساڵ دەرسی گوتووەتەوە و، مەلای پێگەیاندووە و، زانیاریی بڵاوکردووەتەوە.

۱- دەسـتـخەتی ژمارە (۷۵۷۹) دانراوێـکی ئەم مامۆسـتـایە بەزمانی فـارسی و بریتییە لە شەرحی قەسیدەی (ابن الفارض) بەزمـانی فارسی و دواییش دەقی قەسیدەی (تائیه)ی (ابن الفارض) بەزمانی عەرەبی. دوای پێشـەکی دەفەرموێ:

«اما بعد: چنین گوید مـقیم زاویـةء خـاکسـاري ونامرادي، الحقیر ابراهیـم الحسین آبادي، که بعـد ازانکـه در تلاطم امـواج عـشق خوبـان مـسـتـغرق شـدم، وبتـراکم

افـواج مـحنت مـحبت ايشـان مسـتـهلك گرديدم، مي خواسـتم كەدر تحرير اذواق خـويش، ودر تـقـرير اشـواق خـود اوراقي چند امـلا كنم، ومـقـداري از كلمـات انشاسازم، تاباري مرا بـدين قصيـدەء سلطان العـاشقين الشيخ عمر ابـن الفارض نظر افتاد...

لە كۆتاييشدا دەڵێ:

تم بعون الله تعـالى وتوفيقـه في ليلة جمعـة ربيع الآخر سنة الف ومـائة وسبع من هجرة خيـر الانام، عليـه وعلى آله وأصحـابه أفـضل التـحيـة والسـلام، على يد المحـروق بنار الاشـتـيـاق، المنكوس في هاوية البـعـد والـفـراق، بدل الله فـراقـه بالوصـال على ارغـد العـيش وأكمل الحـال، مؤلف العـبارات، وراقـم الاشـارات، الفقير الى الله تعالى الهادي، ابراهيم الحسين آبادي».

دوای ئەمە قەسیدەکەی (ابن الفارض) بەخەتی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر نووسراوە و لە کۆتاییەوە نووسیویە:

«تمت القـصيـدة لعـمر بن الفارض المصـري السـعـدي، رحمـه الله تعـالى وايانا من بركـات انفاسه الـشريفة، بـيد أفقـر عبـادالله الى عفـو ربه الغني، أحمد بن حيـدر الكردي الحسين آبادي، قرأ العلوم النقلية، والفنون الأدبية، والصناعات العربية، ومقداراً معتداً به من العلوم العقلية على والده المرحوم تلميذ شيخ الاسلام...»

ئەم دەستخەتە ٤٤ لاپەڕەیە و هەمووی بەخەتی مامۆستای دانەری شەرحی قەسیدەکەیە و، ئەوەکەیشی بەخەتی ئەحمەدی کوڕی حەیدەرە و وەک وتمان هەردووکیان ساڵی ١١٠٧ نووسـراونەتەوە، بەڵام شـوێنەکـەیان دیاریی نەکـردووە و، وەک دەریش دەکـەوێ ئەم دەسـتـخـەتە بەشـێک بووە لە دەسـتـخـەتێکی گـەورەتر بەش بەش بووە، یان پارچە کراوە.

٢- ٢٣٠٥٨ شەرحی تشريح الافلاک:

سەرەتاکەی:

«وبعد: فيقـول الفقير الى الله الغني، بهاءالدين محمـد العاملي، عفى الله عنه: هذه درة يتيـمة. ويقول الـفقيـر الى الله الهادي ابراهيم بن حيـدر الصفـوي الحسين آبادي: أردت شرحها، فأسلكها بذلك في حلقة ذهبية...»

کۆتاییەکەی:

«قـد وفق الله على إتمام كتـابة هذا الكتـاب على خط مـؤلفـه، عفى عـنه الملك الوهاب، على بنان طه بن موسى بن عبيدالله الحسيني نسباً، الكليرماني وطناً، في مـاوران حفظهـا الله تعـالى، مـا دارت الفلك وتعـاقب الملوان، فـي سنة ست وستين ومائة وألف، من هجرة خير البشر».

ژمارە ١٥٨٦٤ نوسخەیەکی دییە بەخەتی عاصیمی کوڕی ئیبراهیمی حەیدەری. واتە بەخەتی کوڕی دانەرەکەی، ساڵی ١١٧٣ نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی ژمارە ٢/٣٣٠٩٦ نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە ئیبراهیمی عەبدەلانیی ساڵی ١٣١٢ نووسیویەتیەوە.

٣- ٢٣١٥٣ - شرح البرده:

سەرەتاکەی:

«اما بعد: فيقول الفقير الى الله الهادي ابراهيم بن حيدر بن أحمد بن حيدر الكردي الحسين آبادي: لما تمت في نفسه وقعة القصيدة الموسومة بالبردة من كلمات أملح الشعراء كعب بن زهير بن أبي سلمى المزني...»

کۆتاییەکەی:

«قد كتبه الفقير الحقير عبدالفتاح الحافظ عفى عنه الحافظ»

خەتەکەی خۆشە، بەڵام هەڵەی زۆرە و نووسەرەوەکەی مەلا نەبووە.

٤- ٢٠٣٥٠ تفسير سورة الإخلاص (اللمعة الرجبية)

سەرەتاکەی:

«وبعد فيقول الفقير الى الله الهادي ابراهيم بن حيدر الحسين آبادي: لما رأيت الأحسن الأحرى صرف اشتغال الأوقات الى مطالعة آياته العظمى الكبرى... توجهت تلقاء مدين معاني سورة الاخلاص. رجاء أن تحصل لي من فيض بركاتها اقتناص، وإن كان لا يأتي بيان أسرار آياته من أحد أبداً، قل لو كان البحر مداداً لكلمات ربي لنفد البحر قبل أن تنفد كلمات ربي ولو جئنا بمثله مددا».

کۆتاییەکەی:

«خاتمة: وبعد ما أتممت لك هذه العجالة الفايقة، والغلالة الصافية الرايقة، التي اشتملت على نفايس من الأسرار، واحتوت علي مخدرات من عرايس الأفكار، وتجلين عليّ بأحسن وجه ما سمعت بمثله الآذان، بل هن من غاية الحسن بحيث تسلبن العقول وتذهبن الأذهان، وكانت جميلة مقبولة في نهاية الجمال، ظهرت لي من سرادقات الأستار، بواسطة دعاءٍ صدر بلسان التضرع والابتهال في خلوة الاستعداد، ومعزل الاستمداد، من فيض كلامه القديم اللايزال، في خلال شهر الله المبارك رجب، هيأ الله تعالى لنا من الخير كلما تعلق به القصد والطلب... سميتها اللمعة الرجبية من نور الواردات الغيبية، وأعوذ بالرحمان من كل شقي، وعليكم بإرسالها في خدمة كل زكي طاهر تقي، إذ هي بعلها كلما ورد عليها محارمها الاحباب، تجد عندها حظاً ورزقاً يستطاب، حسبي الله وكفى، هو مولانا ونعم المولى.

قال مؤلفها -مدظله-: تمت الرسالة المسماة باللمعة الرجبية على يد مؤلفها في سنة ألف ومائة وأربع. تمت من يد الفقير الضعيف، بعون الملك اللطيف، من خط المؤلف الشريف النظيف (أدام الله ظلال رأفته) للوضيع والشريف، الى يوم يؤتى بنا لفيف، في محفل أولاده الظريف، عبدالرحمن بن خضر، بن حسن، بن عبدالله، نفعه الله بعلومهم، وجعله الله مغتنما وفائزاً من فيوض شؤنهم، وحصل الله مرامه بميامن مرحمتهم، آمين مجيب السائلين. في رابع شهر ذي الحجة الشريف، سنة ١١٥٢ من الهجرة النبوية المصطفوية».

مەبەستی سەرەکیم لە نووسینی ئەم خاتیمە درێژە یەک دوو شت بوو.

یەکەم: کە چۆن دانەر کتێبەکەی ناو ناوە.

دووەم: پتەوکردنی ئەو قسە کە دانەر ساڵی ١١٥١ کۆچی دوایی نەکردووە. چونکە ئەم کتێبە ساڵی ١١٥٢ نووسراوەتەوە و نووسەرەوە دووجار بەگەرمیی دۆعای بەردەوامی تەمەن و سوود و بەرەکەتی دانەر بۆ خەڵک دەکات و، دیارە لەو کاتەدا بەتەواوی تەندروستیی و تواناوە خەریکی دەرسوتنەوە و خەڵک فێرکردن بووە.

٥- ٨٤٨٣ شرح الزوراء:

سەرەتاکەی:

«وبعد: يقول الطالب للترقي من حضيض النقصان الى ذروة الكمال، الراجي للصعود من دركات القال الى درجات الحال، الفقير الى الله الهادي، ابراهيم بن حيدر بن احمد بن حيدر الكردي الحسين آبادي: إن الزوراء وحاشيتها للعالم الرباني مولانا جلال الملة والدين الدواني، لما كانتا مع كونهما مشتملتين على نكات دقيقة لطيفة».

کۆتاییەکەی:

«وتمت كتابة شرحه ونقله الى البياض من السواد، على يد أضعف العباد، شارحه الفقير الى الله الهادي، ابراهيم بن حيدر الحسين آبادي، في شهر الله المبارك رمضان، أفاض الله تعالى عليهم سجال العفو والغفران، بعد تراويح ليلة القدر الخامسة والعشرين من هذا الشهر شهر الصيام، فالحمدلله تعالى على الإتمام، وعلى نبيه أفضل الصلاة والسلام، وعلى آله وأصحابه الطاهرة الكرام، ما قام صائم الى السحور، واستغفر مستغفرو الأسحار، على باب ربهم الغفور. سنة ١١٠٧».

وەک دەبینی ئەمە نوسخەی دەستخەتی دانەرە.

٦- ٦١٥٤ (الرسالة القدسية الطاهرة، بشرح درة الفاخرة)

سەرەتاکەی:

«وبعد: يقول العبد الواقف بالباب، الخاضع المتذلل الى ذاك الجناب، فقير عفو ربه الهادي، ابراهيم بن حيدر بن أحمد بن حيدر الصفوي الحسين آبادي، أصعدهم الله الى أعالي المدارج، ورقاهم الي أقاصي المعارج: لما رأيت هذه الدرة الشريفة الفاخرة. والدرية اللامعة الباهرة، من كلام أنيس أهل الوجد والشوق، ورئيس العارفين من أرباب الذوق، عبدالرحمن الجامي، تجاوز الله عن مزال أقدامه، ومزالق أقلامه، مشتملة على مخدرات...»

کۆتاییەکەی:

«تم تسويد هذه الأوراق، بعون الملك الجواد على الإطلاق، على يدي أقل الخليقة وأذل العباد، المنحرف عن طريق الصواب ومنهج السداد، العبد الأحقر، مؤلف الكتاب ابراهيم بن حيدر، وفقه الله تعالى لمحاسن الأعمال، وسيرة نيل المقاصد والآمال، بعد تراويح ليلة القدر الخامس والعشرين من شهر رمضان، من سنة ست ومائة وألف، من هجرة من أنزل عليه القرآن -صلى الله عليه وسلم- ما لاح الجمال المطلق في مرآت ذرات الوجود، وشاهدته فيها بصائر أهل الكشف والشهود، اللهم ياذا الفضل العظيم، والجود الجسيم، تفضل علينا بحسن العاقبة، ورسوخ التوحيد والايمان في الخاتمة، فإنه أعظم المطالب وأهم الأمور، وأما الدنيا فليس إلا متاع الغرور!».

لە پەراوێزی ئەم لاپەڕەدا نووسراوە:

«بلغت المقابلة من الأول الى الآخر، بعون الله الملك القادر، على يمين مؤلفه، في شهر الله المبارك شعبان. أسكنه الله فراديس الجنان»

دیارە ئەمە شەعبانی ساڵی (١١٠٧)ە ئەگەر دواتر نەبێت. هەروەها وەک دەبینی ئەم کتێبەیش دەستخەتی دانەرەکەی، مامۆستا ئیبراهیمی حەیدەرییە.

لە باسی ئەم دەستخەتەدا دەبێ بەسەر دوو شتدا نەڕۆین:

یەکەم: مامۆستا دەربارەی ناونانی ناوی ئەم کتێبە بە (الرسالة القدسية الطاهرة بشرح درة الفاخرة) ئەمەی نووسیوە:

«خاتمة: أعلم أيها الأخ العزيز، يسرك الله الصعود في معارج السعادة السرمدية، والترقي الى مدارج الكرامة الأبدية: إني لما شرعت في شرح هذه الرسالة المباركة الميمونة، وقصدت الاغتراف من هذا الرحيق الصافي كالدرر الكنونة، ومضى على ذلك مقدار من الأيام، واغترفت منه غرفات مسكية الختام... خلج ببالي أن أخترع اسماً أسمه به بعد الختم والتكميل، فما رأيت شيئاً يكون به هو الجدير والجزيل، فبينما أنا في هذا الخيال، رأيت في المنام في بعض الليال، كأني ساكن في مدينة القدس المقدسة، وواقف بتلك المواقف المؤنسة، فلما انتبهت عبرته بمطالعتي لشرح هذه الرسالة المصنفة في الذات العالية الإلهية وما له من الصفات، البالغتين في القدوسية والطاهرية الى أقصى

الغايات، وبعد ذلك سميت الشرح بهذه المناسبة بالرسالة القدسية الطاهرة بشرح درة الفاخرة...».

دووەم: مامۆستای حەیدەریی لە پێش ئەم کتێبەوە مێژووی سالّی لە دایکبوونی سێ کوڕی خۆی دیاریی کردووە و، کاری وایش بۆ ڕوونکردنەوی مێژووی ژیانی زانایانمان بایەخێکی بێ وێنەی هەیە، بەتایبەتی کە دوان لەو سێ کوڕە دوو زانای گەورەی گەلی کوردیان لێ دەرچووە. دیاریکردنەکانیش بەم شێوەن:

١- بسم الله الرحمن الرحيم. الله خير حافظاً. قد ولد لي الولد المسمى بإسماعيل، سمي نبي الملك الجليل اسماعيل بن ابراهيم الخليل. في سنة سبع ومائة وألف، من هجرة خير الأنام، اللهم انبته نباتاً حسناً، واجعله من العالمين العاملين.

٢- وولد لي الولد المسمى باسم ولي الله أعني به صبغة الله في سنة الف ومائة وعشر، جعله الله من الكاملين العالمين والعاملين.

٣- وولد لي الولد المسمى بعارف، سمي بعض شيوخ الله، في سنة ألف ومائة وأثني عشر (كذا) اللهم أجعله عالماً عاملاً وصالحاً كاملاً، بحرمة سيد ولد آدم -صلى الله عليه وسلم-.

هەر لەم لاپەڕەیەدا چەند پارچە شیعریش نووسراون بەشیعری مامۆستای حەیدەرییان دەزانم، بەلاّم باش ناخوێنرێنەوە.

٧- ٣٩١٩٨ - حاشية على حاشية الخطائي:

سەرەتاکەی:

«وبعد: يقول المفتقر الى الله ابراهيم بن حيدر بن أحمد بن حيدر الكردي الحسين آبادي: لما تلاطم علي في برهة من الزمـــان، أصناف من الملالة وأنواع من الأحزان، حتي كاد يقطع عن القلب حياة العلم فيموت، وما بقى في خزانة الدماغ الا نسجاً من الخيالات أوهن من بيت العنكبوت، فعاقني عن مصاحبة ابي هذه السؤدا، فخفت أن أكون ولداً عاقاً، وصارت هذه الدغدغة علي اصراً ثقيلاً شاقاً... التجأت الى تعليق حاشية على الحاشية الخطائية لما فيها من عجائب التحقيقات وغرائب التدقيقات هدية الى ذاك الجناب، ووسيلة الى وصاله المطلوب في كل باب، علماً مني بأنه اتحاف القطرة الى عمان! واهداء النملة رجل الجراد الى سليمان، لكن، مع كون الهدايا بقدر من يهد(!) كان لي

الاعتماد بغاية عطفته التي لاتوجد مثلها في البلاد، ولعله يقع في موقع القبول، فإن هذا هو الذي توقعه القلب منه ورصده، بمقتضى حديث كل شيء يحب ولده».

کۆتاییەکەی:

«قد تم تسويد هذه الصفائح والأوراق، بعون الملك الجواد على الاطلاق، في قريب منتصف شهر الله المبارك شوال، افاض الله علينا سجال العفو والأفضال، مع غاية تشتت البال، وتفرق الفؤاد، والابتلاء بسكونة اراضي ولاية الأكراد.
اللهم وفقنا لكل مقصد ومرام.
وأجلب بنا مع ارغد عيش الى بغداد دار السلام...»

لەم سەرەتا و کۆتاییەدا ئاماژە بۆ دوو شت دەکرێت - بەڵام بەداخەوە هەردووکیان بەکورتیی - کە هەردووکیان جێگەی بایەخن:

یەکەمیان کتێبەکەی لە سەردەمی ژیانی باوکیدا و بۆ باوکی داناوە و، دیارە ماوەیەک لە یەک بڕاون و لەوانەیە باوکی لە بەغدادا بووبێت.

دووەم: دانەر لەو کاتەدا کتێبەکەی داناوە لە کوردستاندا بووە و، بارودۆخ شلۆق بووە و، ژیانی سەخت بووە و، ئەمیش ئاواتەخوازی ئەوە بووە بگەڕێتەوە بۆ بەغدا بۆ ژیانی ئارامیی و ئاسوودەیی.

ئەمەیش، وا بزانم، وەک -لە وتارێکی دیدا باسمان کرد- لەوەوەیە زانایانی حەیدەریی کاتێک لە بەغدا نیشتەجێ بوون بۆ خوێندن کوردستانیان بەچاکترین شوێن زانیوە و، فێربوونی خوێندن -بەتایبەتی عەقلّیی- لەوێ بووە و، ئەمانیش کوڕانی خۆیان بۆ ئەوێ ناردووە و بیری عەقڵ و ئاوەزیان لەوێ زاخاو داونەتەوە.

ئەم دەستخەتە بەخەتێکی خۆش نووسراوەتەوە، بەڵام نە ناوی نووسەرەوە و نە مێژوو و شوێنی نووسینەوەی پێوە نییە.

کە بەم ئەندازە دەست لەم وتارە هەڵدەگرین و لە خزمەت ئەم مامۆستا هەڵدەستین و خودا حافیزی لێ دەکەین، مانای وا نییە ئەوەی شیاویەتی بۆمان کردووە، بەڵکو ئەوەی - لەم دەرفەتەدا - لە دەستمان هات بۆمان کرد و، یادێکی بچکۆڵەمان لە دانراوەکانی کردەوە و، گومانمان لەوەیشدا نییە ئەمەی لێرەدا تۆمارمان کردوون تەواوی بەرهەم و دانراوی ئەم مامۆستا نین و، ڕەنگە لەمەولا گەلێ شتی نایابی دەربکەون.

٨- حاشیەی لەسەر ڕیسالەی (عضدیە) لە عیلمی (وضع)دا.

دوای ئەوە ئەم وتارە لە هاوکاریدا بڵاوبووەوە ڕێگەم لە دەستخەتێک کەوت لە (دار العراق للمخطوطات)دا کە بەژمارە ٤٣٤٤ پارێزراوە، چوار حاشیەی تێدایە بەسەر ڕیسالەی عەضودیەوە لە عیلمی وەضعدا سیانیان هی بنەماڵەی حەیدەرییەن و، ئەوەکەیان هی مامۆستایەکی نەناسراومانە بەناوی (احمد عثمان).

جا لێرەدا باسی ئەم نامەیش دەخەینە پاڵ نامەکانی دیکەی مامۆستا مەلا ئیبراهیم کە سەرەتاکەی ئاوایە:

«وبعد: فيقول الفقير الى الله الهادي، ابراهيم بن أحمد بن حيدر الكردي الحسين آبادي: لما صارت فتن الزمان متلاطمة، ومحن الاوان متراكمة، وتلاعب بي ترامي البلدان والقرى، فما كان لي موضع يليق بالمساكنة يرى، وما رأيت لاستفراغ القلب جهة جرية، الا مطالعة الكتب وجعل فعلة الدهر ظهرية. رأيت الانسب بها هذا الشرح للفاضل الرباني والعالم الصمداني، عصام الدين بن محمد بن عربشاه الاسفراني...»

کۆتاییەکەی:

«... بل كانت مزرعة للأخرى وللآخرة خير لك من الأولى. اللهم يسر من الخير أمورنا، واشرح بالاسلام صدورنا، وأنا الأحقر ابراهيم بن حيدر. كتبه الحقير الفقير المعترف بالذنب والتقصير، المحتاج الى عفو ربه القدير قاسم بقرية گراو خرّبها الله لكونها سكان الشياطين والمنافقين. لا اله الا الله محمد رسول الله - صلى الله عليه وسلم- آمين والحمدلله رب العالمين. سنة ١٢٦٢.

دەستخەتی ژمارە (٦٨٠٧ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە.

دەستخەتی ٢/٧/ ح ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە.

٩- تەرجەمەی مینهاج بەفارسی.

نوسخەی ئەم کتێبە بەخەتی دانەرەکەی بەژمارە ٣٨٨١ لە کتێبخانەی ئەوقافی بەغدادا پارێزراوە و مێژووی نووسینەوەی ساڵی ١١١٧یە. دوایی کەوتوەتە لای عومەری کوڕی حسەینی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری حەیدەریی. ک -

بسم الله الرحمن الرحیم و به نستعین

نموونەی خەتی ئیسماعیل حەیدەریی

لە دەستخەتی ٤٢٣٥٠دا حاشیەی هەیە بەسەر عیصامی ئیستیعارەوە ساڵی ١٢٧٧ نووسراوەتەوە. دەستی چەپەڵ ناوی نووسەرەوەکەی سڕیوەتەوە.

١٠- شەرحی روباعییات

٥٠٨٢ د.ع یەکێکی دی لە دانراوەکانی مامۆستا ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری حەیدەریی

کتێبەکە بەزمانی فارسی شەرحی ڕوباعییاتی فارسی دەست پێ دەکات، ڕوباعییەکانیش هەر دانراوی خۆیین، ناوی بۆ کتێبەکە دانەناوە. ئەمە بەشێکە لە جێگەی مەبەست لە پێشەکییەکەی:

«اما بعد: معروض این حقیر فقیر مقیم زاویه ء خاکساری و بربادی، ابراهیم بن حیدر الصفوی الحسین آبادی اینست: که چون بعض از فضلای محققین، وعلمای مدققین، مقداری از رباعیات را در مبحث وحدت وجود، وبیان مراتب ارباب کشف وشهود، از طبع لطیف وخاطر نظیف خود بنظم آورده، وباز آنرا بر مقتضای الهام غیبی وتأیید ربانی وهبی لاریبی شرح و ایضاح و کشف وافصاح نموده بودند، وگاهی این بنده ء کمینه را در اثنای مطالعه ء آنها از فیض کلمات با برکات ایشان شوقی در دل پیدا میشد، وشوری در خاطر هویدا میگردید، آخر الامر از توفیق خداوند باری شیء جزئی از حالات ایشان درین فقیر ساری شد، تا چندی از رباعیات را در پیروی ایشان در سلک نظم انتظام دادم، وباز انرا بطریق تقلیدشان شرح کرده در معرض خواص وعوام نهادم، امید از مکارم اخلاق ناظران منصف ومطالعه‌کنندکان غیر متعسف آنست که از شیوه ء اعتراض اعراض نمایند، وباصلاح مواضع خلل انتهاض سازند، والتوفیق من الملك الجواد، ومنه الهداية الى طريق الصواب والرشاد».

کۆتاییەکەی:

«تمام شد شرح رباعیات مولانا بهاري، باستمداد فیض خداوند باري. در سنهء هزار و صدوسي از هجرت خیر الأنام، علیه وعلى آله أفضل الصلاة والسلام، ما صدح القمري وناح الحمام».

لێرەدا کە دەڵێ: (مولانا بهاری)[1] نازانم مەبەستی چییە، دەبێ نازناوی شیعریی خۆی (مولانا بهاری) بێت؟ لەگەڵ ئەوەدا کە هیچی نەنووسیوە گومانی زیادم بۆ ئەوە دەچێت کە ئەم دەستخەتە تاکە نوسخەی ئەم کتێبە بێت. لەوەیش ناچێت کە پاکنووس کرابێت. بەڵام دەکرێ خۆی بەخۆی بڵێ (مولانا بهاری)؟

دوابەدوای ئەمەیش کتێبێکی دی دێت هەر شەرحی ڕوباعییاتە و لەوە دەچێ نوسخەیەک بێت لەوەی پێشوو، بەڵام جیاوازییان زۆرە، لێرەدا ئەوەیشی تێدایە کە ئەم

(١) شاعیرێکمان بەنازناوی (بەهاریی) لە لاپەڕە ٢٧٢ی بەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا باسی کراوە.

کتێبەی پێشکەش کردووە بە(سلطان ایلدرم بایزید). بەڵام بەڕوونی دەڵێ «شرح رباعیات مولانا جلال الدين الدواني»

لە کۆتایی ئەمەیانەوە نووسیویە:

«تمام شد این رسالهء شیرین مقالة در قصبهء مورد فیوضات باري اعني به ابا ایوب الانصاري» واتە ئەستەموول.

١١- ٣٠٧٢ د.ع دانراوێکی دیکەی مامۆستا ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری حەیدەریی (الملهمات الربانية)یە کە سەرەتاکەی ئاوایە:

وبعد: فيقول الفقير الى الله الهادي، ابراهيم بن حيدر الصفوي الحسين آبادي: أني كنت كتبت فيما مضى من الزمان بعضاً من لوايح غريبة، وسوانح عجيبة، ونكات فايقة، واشارات رايقة شايقة، مما كانت تلوح لدي، وتظهر علي، بالهام رباني، وفيض رحماني صمداني، كل منها في وقت نشأة من نشاط من دون ملاحظة تعلق بعضها ببعض واتصال وارتباط، واتفقت أن كانت نسختها أوراقاً متفرقة، بحيث كانت مظنة أن تكون اقدام الفوات اليها متطرقة، فكتبتها في أوراق مجتمعة مرة أخري، عسى أن تكون بالحفظ أليق وأحرى، وقدمت منها ما يتعلق بالعشق المجازي تنشيطاً للنظار، ولكونه قنطرة الحقيقة كما ورد في بعض الآثار، وعقبته ببعض كلمات المحقين المحققين أعني أساطين الصوفية المتألهين، مع بعض مما يتعلق بعقائد الاسلام، مع مسائل دقيقة عميقة من العلم الموسوم بالكلام، واتباع لجميع تلك المذكورات بأشياء أخر متفردة نادرة غير مشهورات، فجاءت بحمد الله تعالى مجموعة مطبوعة للمهرة الكملة، ممنوعة مقطوعة لغموضها من الحسدة الجهلة، وسميتها بـ(الملهمات الربانية، في اسرار ذوقية وجدانية).

لە کۆتایی ئەم دەستخەتەوە شیعرگەلێکی فارسی هەیە بەدووری ناگرم - ئەگەر هەموویشیان نەبێ بەشێکیان - شیعری پیاوانی بنەماڵەی حەیدەریی بن.

دەستخەتی (٣١٣٤٢ د.ع)ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

«تمت هذه الرسالة المسماة بملهمات على خط من رسم على خط مؤلفها -رحمه الله- نمقه الفقير المحتاج الى لطف ربه الغني محمد بن السيد حامد بن السيد فخرالدين الحسيني. ١٢٠٨هـ».

١٢- دەستخەتی ژمارە ٣٢٤٥٨ د.ع ش حاشیەی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەرە بەسەر (قول احمد)ەوە، حەسەنی بایەزیدیی کوڕی محەمەدی کوڕی مصطەفا ساڵی ١٢٣٦ لە ئەربیل نووسیویەتیەوە.

١٣- دەستخەتی ١١٩٤٤ د.ع ش حاشیەی ئیبراهیمی حەیدەرییە بەسەر حاشیەی جەلالەدینی دەوانییەوە.

جگە لە کتێبخانەی (دار العراق للمخطوطات) دانراوی ئەم مامۆستا لەگەڵێ جێگە و کتێبخانەی دیکەیشدا هەیە و، لەوانەیە لەمەولا زیاتریش دەربکەون، ئەوەندەی من بەگەڕان بەدوایاندا دۆزیومنەتەوە لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێکیان دەکەم:

١- لە کتێبخانەی ئەوقافی بەغدادا ئەمانە هەن:

أ- تعليقات على الحاشية الفنارية. (ج/٤، ل: ١٢).

ب- تعليقات على الحاشية الفتحية (ج/٤ ل:٧١).

ج- تسريح الادراك في شرح تشريح الأفلاك، لبهاءالدين العاملي (ج/٤، ل: ١٢٨).

د- شرح رسالة الجامي في التصوف(ج/٢، ل: ٤٣٦).

ئەمە کتێبی (رسالة القدسية الطاهرة بشرح درة الفاخرة)یە کە نوسخەی لە (دار العراق للمخطوطات)شدا هەیە و، باسی ڕابووردی[1].

هـ- حاشية على حاشية ميرزاجان على تعليقات السيد شريف على شرح حكمة العين لميرك زادة.

(ج/٢، ل: ٢٦٢)

٢- لە کتێبخانەی ئەوقافی مووسڵ:

أ- الملهمات الربانية في اسرار ذوقية وجدانية ج/٥/ ١٥٠.

---

(١) ئەمە بەژمارە ٤٧٤٤ لە کتێبخانەی ناوبراودا پارێزراوە و، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەباسی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەمەد ساڵی ١٢٣٦ لای صیبغەتوڵلا ئەفەندیی کوڕی مستەفا ئەفەندی خوێندوویە.

## ئیبراهیم فەصیحی کوڕی صیبغەتوڵڵای حەیدەریی

٤٢٢

ئەم پیـاوە یەکـێکی دییـە لە زانا نـاودار و خـاوەن بـەرهەم و دانراوە زۆرەکـانی بنەمـاڵەی حەیدەریی. بەکەمێک سەرنجدان و لێکۆڵینەوەی ژیان و ناوی بەرهەمەکانی ئەم مامۆستا دەگەینە ئەو ئەنجامەی ئەم مامـۆستا پاش ئەوە لە بەغدادا جێگیربووە لە باوباپیرانی زیاتر بەرهەمەکانی پارێزراون و، مێژووی کۆچی دواییشی ڕوونتر دیاریی کراوە. ئەوەتا عەباس عەززاویی لە دەستخەتی ژمارە ٩٩٠٦ی (دار العراق للمخطوطات)دا دەڵێ: ئەم مامۆستا شەوی دووشەممەی پێنجی سەفەری ساڵی ١٣٠٠ کۆچی دوایی کردووە. هەروەها بەشێکی باشی دانراوەکانیشی لە کتێبخانەی ئەوقافی بەغدادا پارێزراون، وەک لێرەدا ناوەکانیان دەبینی، جـا ئیـتـر نازانین هەر لە ڕێگەی مـەزاد و فـرۆشـتنەوەوە بەدەسـتـاودەست گەیشتوونەتە ئەوێ یان چۆن، چونکە ماوەی بینینی خودی دەستخەتەکانم نەبوو.

جێگەی خۆیەتی بەسەر ئەوەیشدا نەڕۆین کە لە (ذیل)ی (کشف الظنون)دا ناوی ئەم دانراوانەی هاتووە:

١- شرح ديوان ابي تمام.
٢- شرح ديوان ابي العلاء المعري.
٣- راحة الارواح في شرح الاقتراح.
٤- السنوحات في التصوف.
٥- الصراط المستقيم، ١/١٣٧٢٩.
٦- عنوان المجد في بيان احوال بغداد وبصرة ونجد.
٧- فصيح البيان في تفسير القرآن.
٨- فك الاشتباك عن معاني تشريح الافلاك.
٩- كتاب الحسب في النسب.
١٠- المجد التالد في مناقب مولانا خالد.
١١- النوادر الحكمية والأدبية في شرح الرسالة الإغريقية.
١٢- إمداد القاصد في شرح المقاصد للنووي.
١٣- إمعان الطلاب في الاسطرلاب.
١٤- أصول الخيل...

لەم دانراوانەی مامۆستای حەیدەریی ژمارەیەکی کەمیان نەبێ لە دەستدا نین و هەواڵیان نازانرێ. لەوانەی کە لە (دار العراق للمخطوطات)دا من دیومن چەند دانراوێکن لەوانە:

١- نفح الرّند في شرح سقط الزند لە (د.ع) بە ٩٦٥٣ پارێزراوە و ئەمە سەرەتاکەیەتی:

«... اما بعد فيقول الفقير الغريق في لجج الذنوب التي ليس لها عدة، السيد ابراهيم فصيح الهاشمي الاب الطائي الام الحميري الجدّة. بن العالم الصالح المتوجه بكله الى مولاه، السيد صبغة الله مفتي الشافعية عفى عنه رب البرية، بن العلامة الفهامة النحرير صاحب التحرير والتقرير، السيد أسعد صدرالدين مفتي الحنفية ببغداد، حرست عن البغي والفساد، الحيدري البغدادي، غفر ذنوبهم وستر عيوبهم: لما كان ديوان ابي العلاء المعري المسمى بسقط الزند... وسميته نفح الرند في شرح سقط الزند...»

دەستخەتێکی گەورەیە ٧٩١ لاپەڕەیە لە کۆتاییەوە (تەقریظ بەباڵابرینی) (محمد امين الجندي العباسي المفتي الحنفي بدمشق الشام) و (نقيب الاشرافزاده السيد عبدالرحمن القادري) پێوەیە ئەمیش بەخەتی (ابراهيم عبدالغني البغدادي الشيخلي)یە کە لە (عنوان المجد)دا دەڵێ (الدروبی).

دەستێکی چەپەڵ ساڵی نووسینەوەکەی کڕاندووە کە (١٢٠٠) شتێکی دیارە (١٢ رجب يوم الجمعه).

شەرحی کتێبی (خلق الاعمال) یان (الارادة الجزئية)ی مەولانا خالیدی نەقشبەندیی

ئەم کتێبە لە (دار العراق للمخطوطات)دا بەژمارە (٣٦٢٧) پارێزراوە و سەرەتاکەی ئاوایە:

أما بعد: فيقول الفقير الى مولاه، ابراهيم فصيح بن السيد صبغة الله، بن العلامة السيد أسعد صدرالدين المفتي ببغداد الحيدري البغدادي: لما رأيت الرسالة المؤلفة في تحقيق مسألة الارادة الجزئية، وتفصيل المذاهب المردودة والمرضية، مع بيان الفرق بين مذهب الأشعري والماتريدي بأحسن المقال، بحيث تتحصل منه فذلكة مسألة خلق الأعمال، لشيخنا مجدد المأة الثالثة عشر (كذا)، علامة البشر، قطب دائرة الارشاد، والمرشد الكامل، الاستاد سند الملة والدين، برهان الحقيقة واليقين، ذي الجناحين الراكع الساجد، مولانا ضياءالدين خالد العثماني النقشبندي...

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«والحمدلله رب العالمين على الاتمام، والصلاة والسلام على سيدنا محمد خير الأنام، وعلى آله الكرام، وأصحابه الأعلام. وهذا آخر الكلام على هذه المسألة التي زلت فيها الأقدام»

دەستی چەپەڵی بازرگانیکەر بەشوێنەواری زانایانەوە دووپەڕەی لە کۆتاییەکەی هەڵپچڕیوە و، لەگەڵێ بابەتی بەسوود بێبەشی کردووین!

بەڵام بەگوێرەی لاپەڕەی یەکەمی ماوەیەک لای سەیید محەمەد طاهایەک بووە کە لە کەربەلا مودەڕیس بووە.

بێجگە لە (دار العراق للمخطوطات) لە فیهرەستی کتێبخانەکانی دیدا ناوی ئەم کتێبانە دەبینین:

١- فیهرەستی ئەوقافی بەغداد بەرگی یەکەم:

٤٠٦- فصيح البيان في تفسير القرآن. ص: ١٣٥.

٥٧٥- أعلى الرتبة بشرح نظم النخبة. ص: ١٨٩. [٧٩٠٥ ق]

١٢٦٩- تعليقات في الإفتاء. ص: ٣٩٨.

١٤٩٨- رسالة في الوقف. ص: ٤٥٧.

١٦٤٦- غوص البحار لاخراج الدر المنتقي الى الامصار. ص: ٤٩٤.

٢٣٠٨- رسالة في البيع. ص: ٦٧٨.

بەرگی دووەم:

٢٧١٤- أحسن المقال في شرح رسالة خلق الاعمال. ص: ٩٧.

٢٧٦٢- [٢/١٣٢٧٩] تذكرة الاذكياء وتبصرة الاغبياء في عصمة الأنبياء ص: ١١٤، ٢/١٣٢٧٩.

٢٧٨٠- التلميحات الى معاني المحاكمات. ص: ١١٨.

٣١١٠- شرح المقاصد. ص: ٢٠٩.

٣٦١٢- حسن الوفاق في مكارم الاخلاق. ص: ٣٥٣. [١/١٣٧٢٩]

٤٢٦٧- القام الحجر في فم من هذى وفجر. ص: ٥٣٤.

٤٣٧٤- النكت الشنيعة في بيان الخلاف بين الله والشيعة. ص: ٥٦٩.

بەرگی چوارەم:

٧٦- شرح منظومة الحنفية في الآداب. ص: ٨٨.

١٣١- رسالة في الاسطرلاب. ص: ١٣١.

٦٧٣٥- السلسلة الحيدرية. الشجرة الحيدرية، ص: ٢٤٢.

٢٤٩- عنوان المجد في بيان أحوال بغداد والبصرة ونجد.

بەرگی چوارەمی فیهرەستی مەکتەبەی قادرییە:

٢- الرسالة الجفرية. ٢٦٨/٤.

دەربارەی ئیبراهیم فەصیحی حەیدەریی لە فیهرەستی مەکتەبەی ئەوقافدا:

بەرگی سێیەم:

٤٤٤١- رسالة في لغز اسم (شريف رشدي ومحمد كامل) ص: ٢٢.

٤٤٤٥- رسالة في لغز باسم (اسعد صدرالدين) مفتي الحنفية في بغداد. ص: ٢٢.

٤٤٤٧- رسالة في لغز باسم (محمد علي) ص: ٢٣.

٤٥٠٣- شرح ألغاز ونكات لعبدالله أفندي العمري. ص: ٣٩.

٤٥٦٢- مقامة. ص: ٥٦.

٤٥٧٧- مكتوب ملمع بالعربية والتركية. ص: ٦٠.

٤٨٤١- قصيدة للعمري عبدالباقي (ت- ١٢٧٨هـ) في مدح كتاب (شرح لغز عبدالله العمري) ص: ١٤٠.

٥١٨٤- شرح لغز (عبدالله العمري). ص: ٢٣٥.

٦٠١٢- فصيح التوقيع في علم البديع. ص: ٤٣٥.

## ئیجازەی ئیبراهیم فەصیحی حەیدەریی

وەک یاسای مامۆستایانی کۆنمان بەشێک بۆ ڕێز و، بەشێک بۆ پیرۆزیی و، بەشێک بۆ ناو و شۆرەتی مامۆستای ئیجازە لێ وەرگیراو، مامۆستا ئیبراهیم فەصیحیش ئیجازەی لەگەڵێ مامۆستای چەرخ و سەردەمی خۆی وەرگرتووە، لەوانە مامۆستا مەلا یەحیای مزووریی و، ئەحمەدی کوڕی حاجی عەلیی گەلالەیی -یان گەلاڵی- دەقی ئەم ئیجازانە لە دەستخەتی ژمارە ٢٨١٢ی کتێبخانەی مەرکەزیی ئەوقافی بەغدادا پارێزراوە.

یەکێکی دی لە دانراوەکانی مامۆستا ئیبراهیم فەصیحی حەیدەریی کتێبی (عنوان المجد في بيان أحوال بغداد وبصرة ونجد)ە.

ئەم کتێبە پێشتر چاپکراوە و دواتریش چاپکراوەتەوە. بەڵام لە (د.ع)دا چەند نوسخەیەکی هەیە یەکێک لەو دەستخەتە نایابانەی ئەم کتێبە بەژمارە ١٨٥١ د.ع پارێزراوە و (٣٤٢) لاپەڕەیە بەخەتی (ابراهيم الدروبي) کە لە کۆتاییەکەیەوە نووسیویە:

«قد حصل الفراغ من تبيض هذا الكتاب بقلم العبد الفقير ابراهيم عبدالغني الدروبي البغدادي، وذلك في صباح يوم الثلاثاء من شهر السابع عشر من ذي القعدة الشريفة لسنة خمس وثلاثين وثلاثمائة والف هجرية».

هەروەها ژمارە (٦٢٩٤ د.ع)ش نوسخەیەکی دی ئەم کتێبەیە بە (طابعة) چاپکراوە.

یەکێکی دی لە دانراوەکانی ئەم مامۆستا کتێبی (احسن المقال في شرح رسالة خلق الاعمال)ەکە لە (د.ع)دا بەژمارە (٣٦٢٧) پارێزراوە و سەرەتاکەی ئاوایە:

«... اما بعد: فيقول الفقير الى مولاه، ابراهيم فصيح بن السيد صبغة الله، بن العلامة السيد اسعد صدرالدين المفتي ببغداد الحيدري البغدادي: لما رايت الرسالة المؤلفة في تحقيق مسألة الارادة الجزئية، وتفصيل المذاهب المردودة والمرضية، مع بيان الفرق بين مذهب الأشعري والماتريدي، بأحسن المقال بحيث تتحصل منه فذلكه مسألة خلق الأعمال، لشيخنا مجدد الماءة الثالثة عشر (كذا) علامة البشر، قطب دائرة الإرشاد والمرشد الكامل الاستاد، سند الملة والدين، برهان الحقيقة واليقين ذي الجناحين، الراكع الساجد، مولانا ضياءالدين خالد، العثماني النقشبندي - قدس الله اسراره اللطيفة، وأفاض علينا من بركات أنظاره الشريفة، قد احتوت على...»

تا دەفەرموێ:

«بادرت الى شرحها بما يحل منها عقد المقالات الدقائق، ويفتح الاغلاق، وذلك اثناء الطريق عند قصد السفر الى بلاد الروم، بالتماس اهل الفضل والعلوم، وسميته احسن المقال في شرح رسالة خلق الاعمال».

دەستێکی چەپەڵ دوو پەڕەی دوای تەواوبوونی کتێبەکەی هەڵپڕوچقاندووە، دیارە مێژوو و ناوی خاوەنی کتێب و شتی وایان تێدا بووە. پێش ئەو دوو پەڕە کۆتایی دەستخەتەکە ئاوایە:

«الحمدلله رب العالمين على الاتمام، والصلاة والسلام على سيدنا محمد خير الانام، وعلى آله الكرام، وأصحابه الاعلام، وهذا آخر الكلام على هذه المسألة التي زلت فيها الاقدام...».

دەستخەتەکە (٢٠٠) لاپەڕە دەبێت.

دەستخەتی ژمارە ٢٩٦١٧ش کتێبی (عزيز شرح الوجيز)ە لە مەزادی کتێبەکانی عوبەیدوڵڵای حەیدەریی کڕاوە، لەلایەنی حاجی مەلا سەعیدی کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای کەرکووکی سلێمانییەوە لە ٥ی شەوالی ١٣٢٦دا بە ١٩١ قروش. لە شوێنێکی دیدا نووسراوە: «من كتب المرحوم جدي العلامة الشريف محمد اسعد المفتي ببغداد. حيدري زادة، كتبة حفيدة ابراهيم فصيح.»

## دانراوێکی عوبەیدوڵڵای کوڕی صیبغەتوڵڵای حەیدەری

### ٤٢٣

ئەم دانراوە بەژمارە (٢٣٠٥٦) لە (دار العراق للمخطوطات)دا پارێزراوە و، ئاوا دەستپێدەکات:

«اما بعد: فلما كانت الحواشي المنسوبة الى العالم العامل والفاضل الكامل، القطب الرباني، والعارف الصمداني، مولانا يوسف الاصم -رحمه الملك الاعلم- الواقعة على عصام الدين، ادخله الله في أعلى العليين، على الكتب متفرقة، والأذهان اليها متشوقة، وقد اختلط بعض العبارات مع الفاظها الفصيحة، ولم يفرق الاسقام من معانيها الصحيحة، اردت أن أجعلها مدونة تسهيلاً للطلاب، ورجاء أن تصير ذخراً لي في يوم الحساب. وأنا الفقير الى الله الهادي عبيدالله بن صبغة الله الكردي الحسين آبادي وهو حسبى ونعم الوكيل. وعليه اعتمادي والتعويل...»

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

«قوله أعم من الرد في الكتابة ايضاً: فإنك تحذف النون وتكتب الواو في نحو أغزن عند الساكنين، نحو: أغزو الكفار. تمت الحاشية المنسوبة الى المولى المكرم، والامام المفخم، نعني به يوسف الاصم، بعون الملك الاعلم على يد أضعف العباد، وأحقرهم الى الله يوم التناد، المحتاج الى شفاعة سيد البشر، في يوم

الحساب والمحشر. محمد بن حاج بكر آغا كلاك زادة عفى عنهم الرب الأكبر بعد الظهر، ثامن يوم من شهر رمضان المبارك المنتظم في سلك شهر سنة سبعة وخمسين ومائتين والف. من هجرة خير الرسل والاولى على صاحبها أفضل الصلاة والسلام ما طار الهدهد وصاح الحمام.»

لەسەر دەستخەتی ٥٥١١ نووسیویە:

«قد انتقل الى نوبة الفقير الحقير اليه سبحانه وتعالى عبيدالله بن صبغة الله بالشراء الشرعي بمدينة السلام بغداد حفظها الله عن الآفات والعاهات. سنة ١١٧٢».

دەربارەی عوبەیدوڵڵای کوڕی صیبغەتوڵڵای حەیدەریی لە سەرچاوەکاندا ئەوە نووسراوە کە ساڵی ١٢٠٠ کۆچی دوایی کردووە[1]، بەڵام لە دەستخەتی (٤١٥٦)ی (دار العراق للمخطات)دا نووسەرەوەکەی نووسیویە:

«... نمقه... [دەستێکی چەپەڵە ناوەکەی کووژاندوەتەوە] غاية العجز لقتل عبيدالله بن صبغة الله في قرية ماوران (رب خلاصم بكى لغمان - ڕەببی خەلاصم بکەی لە غەمان ئاه چبکەم لەبۆ دەرسان؟!)...» ئەمە لە کۆتایی پەراوێزێکەوە نووسراوە. بەڵام نووسەرەوەی دەستخەتەکە ئاوای نووسیوە:

«ايوب بن مصطفى بن ابراهيم بن محمد بن ايوب المشهورين ببالي» ئەوەی لەم نووسراوە وەردەگیرێ ئەوەیە کە مامۆستا عوبەیدوڵڵا کوژراوە. بۆنی ئەوەیشی لێ دێت کە لە (ماوەران) کوژرابێت. بەڵام ساڵی کوژرانەکە یان نووسینەوەی دەستخەتەکە دیاریی نەکراوە.

دەستخەتی ژمارە ١/٤٢٥٥٥ د.ع ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەمەدی عەرەبیزادەی مامۆستا لە مەرجانییەی بەغدا ساڵی ١١٧٧ نووسیویەتیەوە.

---

(١) بروانه: علماء ومدارس في أربيل. زبير بلال اسماعيل، ص: ٥٣.

## الاجوبة على الأسئلة الهندية

١٠١٩٣ د.ع دانراوی عوبەیدوڵڵای کوڕی صیبغەتوڵڵا

سەرەتاکەی:

اما بعد: فيقول العبد الضعيف المحتاج الى الله القوي الهادي، عبيدالله بن صبغة الله الصفوي الحسين آبادي-أحسن الله حالهما، ونور بالمغفرة بالهما-: لما أرسل الأخ العزيز الفائز بفنون العلوم، الجامع لمرضيات الشمائل والرسوم، الفاضل الوارع، والكامل البارع، حلال المشكلات برأيه الصائب، كشاف المعضلات بفكره الثاقب، جامع الحكمتين، قرين العلامتين، موضح طريق الحق للعباد، جالس سجاد الارشاد، الشيخ محمد بن ابي بكر المقيم بجهان آباد، هند حفظه الله تعالى عن الكد والعناد... بعض السؤالات...

کۆتاییەکەی:

هذا ما أدركه فهمي عسى أن يفهمه غيري فهم الاتقان والتحقيق، ويجعل الله التوفيق خير رفيق، والله أعلم بالصواب، واليه المرجع والمآب.

بەخەتێکی جوان نووسراوەتەوە، ناو و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە.

نوسخەیەکیشی بەژمارە ٣١٠٤ لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی بەغدا پارێزراوە.

دەستخەتی ١٢٦٩٧ د.ع ش فەتاوای (كليسى)يە.ساڵی ١٢٤٥ بۆ عوبەیدوڵڵای کوڕی صیبغەتوڵڵای حەیدەریی نووسراوەتەوە. ساڵی ١٢٤٧ کەوتووەتە لای عەبدولغەفووری کوڕی محەمەد ئەسعەدی حەیدەریی.

دەستخەتی ٥٥١١ د.ع ش (شرح الشاطبية)ی حەمزەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عیسای تەبرێزییە. (تملک) لەدەستدا بوونی عوبەیدوڵڵای کوڕی صیبغەتووڵڵای حەیدەریی لە ساڵی ١١٧٢دا لە بەغدا بەسەرەوەیە.

## هەندێک شوێنەواری عوبەیدوڵلای حەیدەری

١٠٩٠٢ لە کۆتاییەکەیەوە نووسراوە:

«تمت المقاصد للامام القطب الصديق الهمام محي الدين الشيخ يحيى النواوي الشافعي -رضى الله عنه- بقلم المذنب المتوسل به الى الله عبيدالله بن عبيدالله بن صبغة الله الحيدري الصفوي الخالدي. رحمهم الله آمين. وذلك في سنة ١٢٣٣ في بغداد بالزاوية الاحسائية الخالدية.

لەسەر دەستخەتی ٥٥١٨یش نووسراوە:

«انتقل الى نوبتي بالشراء الشرعي وأنا الفقير عبيدالله، حفيد صبغة الله الحيدري سنة ١٢١٧.

## باسی ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر...مان نووسی

٤٢٤

لە نەوەی ئەو مامۆستایش مامۆستایەکی دیمان ناسی کە بە پێی دەستخەتی (١٥٩٠٥/١ د.ع) کە ڕیسالەی (عصام الدین)ە ئەم مامۆستا ساڵی ١٢٢٧ لە ژیاندا بووە، دوایی لە شوێنێکی دیکەی دەستخەتەکەدا نووسراوە کە نووسەرەوەی دەستخەتەکە مامۆستا عەبدوڵلای حەیدەری ساڵی ١٢٣٧ ڕۆژی هەینی کۆتایی مانگی (ذي القعدة) کۆچی دوایی کردووە.

هەروەها لەم دەستخەتە وەردەگیرێ کە مامۆستا ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵلا لە ٥ی ڕەجەبی ساڵی ١٢٤٠دا کۆچی دوایی کردووە، هەروەها دوو سێ پارچە شیعریشی تێدایە یەکێکیان لە شیوەنی (خضر) دایە ڕەنگە خدری حەیدەریی بێ.

هەندێک شتی پێوەندیدار بەم مامۆستاوە:

حاشیەی ئیبنولقاسمی عوبادیی بەسەر (جمع الجوامع)ەوە، خەلیلی ئەربیلیی کە لە نزیکی کەعبەی پیرۆزدا لای (باب الدريعة)وە لە ماڵی عەباس خەطیبی ظاهیریدا پێنجی شەوالی ساڵی ١١٨٦ لەبەر خاتری مامۆستای بەڕێز عیسای کوڕی صیبغەتوڵلای حەیدەری صەفەویی نووسیویەتیەوە. بەژمارە (١٣٥٩٩) پارێزراوە.

«هو الخلاق المنعم الجواد

الحمدلله الذي خلق الانسان في أحسن تقويم، حمداً يوازي نعمه، ويحاذي كرمه، حيث أذهب عني الحزن، وأنعم على بولادة ولدي المسمى المكنى بنعمة الله وابي الجود، رعاية وتفاؤلاً لموافقة الاسم في الواقع مع المسمى والمكنى، انبته الله نباتاً حسناً، يوم السبت قبيل الظهر أواسط الشهر المبارك محرم سنة ١١٦١ من هجرة النبي -عليه وعلى آله وأصحابه أفضل الصلاة وأكمل السلام -ما صدح القمري وصاح الحمام- اللهم اجعله في زمرة العلماء العاملين البارعين، واسلك به مسالك الفضلاء الصالحين الوارعين بحرمة سيد المرسلين وآله وأصحابه اجمعين آمين بمزيد لطفك وكرمك يا اله العالمين.

وقبل هذا ولدت بنتي المسماة باسم مرضعة حضرة النبي -صلى الله عليه وسلم- حليمة في شهر صفر الخير سنة ١١٥٧ سبع وخمسين ومائة والف، انبتها الله نباتاً حسناً، وجعلها من المؤمنات العابدات الصالحات بحرمة النبي وآله وأصحابه عليه وعليهم أفضل الصلوات وأكمل التحيات آمين بجاه سيد المرسلين».

هەروەها مامۆستا (عاصم)ی حەیدەری لەم دەستخەتەدا پارچەیەک شیعری فارسی بەبۆنەی سوڵحکردنی لە نێوان ئەحمەد پاشای پاشای ئێران و نادر شاوە گوتوە، پارچە شیعرەکە ١٥ بەیتە و سەرەتاکەی ئاوایە:

«از قضا آن شاه نادر از عجم
فکر ملک روم را بستش کمر
بهر حرب اجناد را چون جمع کرد
خوف او بگرفت عالم سر بسر

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

داعی دولت پی تاریخ گفت
بست عقد صلح آن نیکو هنر
١١٥٦
یا الهی دولتش پاینده باد
پرتو رفعت برو تابد چو خور

## ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر

٤٢٥

ئەم مامۆستایش یەکێکی دییە لە مامۆستایانی بنەماڵەی حەیدەری.

شتێکی زۆر دەربارەی ئەم مامۆستا نازانین، ئەوەندە هەیە بەپێی دەستخەتی ژمارە (١٤٥٠٢ د.ع) کە کتێبی (الکواکب الدرية)یە ساڵی (١١٩٤) لە شاری موسڵ نووسیویەتیەوە. لە کۆتایشیەوە نووسیویە:

«... لنفسه بنفسه، مع كلال الخاطر، وتشتت البال، واشتد الحزن بحيث لايسمع الا [هو!] من كل لسان ومقال، وذلك من طوارق حدثت بالمكان والخلان، من الظلمة الجهال، اللهم دمرهم تدميراً، واجعل مثواهم جهنم وسعيراً، بحيث لايقال لهم ولمعينهم الإساءات مصيراً. اللهم اكفنا من شرهم وشر ما خلقن، واحفظ أستاذنا وسائر المسلمين.

هەروەها دەستخەتی (٧٧١٤ د.ع)ش کە کتێبی (اللاری)یە ئەم مامۆستا ساڵی ١٢١٧ نووسیویەتیەوە.

لەم دەستخەتەوە ئەوەیش دەردەکەوێ ئەحمەدی حەیدەری شیعری هەبووە و نازناوی شیعریی (غافل) بووە.

٢/٢٥٠٩٩

## حاشیەیەکی (غياث الدين) کوڕی (صبغة الله) لەسەر مەسئەلەی (الامر الدائر بين الشجر والحجر)

٤٢٦

سەرەتاکەی ئاوایە:

«قال الفاضل الاصم: واعلم انه يوجد من الامر الدائر بين الشجر والحجر اي الدائر بين مجموعهما أو بين أحدهما...»

ئەم دانراوە یەک پەڕەیە و ئاوا کۆتایی هاتووە:

وفي العدل اللاوزن والامر الدائر الموجود في ضمنه. وقد اطنبنا في الكلام لانه مما استصعبه اولو الافهام. غياث الدين عيسى بن صبغة الله. سوده العبد الحقير الفقير المزناوي في خدمة اخ الشقيق ذوي القدر العلي والفخر الجلي الشهير المعروف بالمزناوي.

«ڕەببی خودا تەوفیق بۆ وی
زۆر بو لوطف بۆ من لەوی
دەستەم کەوەت پەی بوم خەنی
با بەس خەلق پێم پێبکەنی!!»

ساڵی نووسینەوەی نەنووسیوە.

لە کۆتایی حاشیەی (عبدالحكيم) بەسەر (عبدالغفور)بەسەر (جامی)یەوە بەژمارە: (٧٨٢٤) پارێزراوە، نووسراوە:

«الحمدلله الذي وفقني على تحريره وتسويده، ارجو منه أن يوفقني على انتفاعه وتصحيحه. تمت كتابته يوم الذي أخذت الإجازة والإذن من الأستاد الأجل أفضل المتأخرين، وأكمل المتجرين، غياث الدين عيسى بن صبغة الله أدامهما الله وأبقاهم الى يوم القرار. آمين يا معين»

لە کۆتایی نووسینەکەیشیەوە ئەمەی نووسیوە:

«نمقه وسوده العبد الحقير الفقير عمر بن محمد بن عمر حفظهم الله من نار السقر. ورزقهم الله شرب ماء الكوثر. بحق من شق لأجله القمر. في [خطة!] دارالسلام بغداد، صانها الله من الآفات والعاهات في شهر شعبان في يوم الجمعة سنة ١١٨١ الف ومائة واحدى وثمانين من الهجرة النبوية. صلى الله.

## عەباسی کوڕی ساڵحی حەیدەری

### ٤٢٧

لە دەستخەتی ژمارە (٣٥٩٣/د.ع)وە بۆمان دەردەکەوێ کە مامۆستایەکی دی لە مامۆستایانی حەیدەری ناوی ساڵحی کوڕی عەباسی کوڕی ساڵحی کوڕی عەباسی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەرە و ساڵی ١٢٣٥ لە گوندی باڵەکیان حاشیەی عەبدوڵلای کوڕی

حەیدەری نووسیوەتەوە و لە خزمەتی مامۆستا مەلا خضری بەحرکیدا بووە و پێشتریش - واتە ساڵی ١٢٣٤- لە گوندی ماوەران بووە.

هەروەها دەستخەتی (١٧٥٥٦ د.ع)یش ساڵی ١٢٤٠ لە دەستی ساڵحی کوڕی عەباسی حەیدەریدا بووە، دواتریش -واتە ساڵی ١٢٨٠- کەوتوەتە لای عەباسی کوڕی ساڵحی حەیدەری و، ئەم مامۆستایانە لە سەرچاوەکانی دیدا ناو و باسیان نییە، بەڵام هەر لە (د.ع)دا لە دەستخەتی (١٩٦٠٦)وە -کە عەقائیدی مەلا سەعدە و ساڵی ١٠٦٩ سلێمان ناوێک نووسیویەتیەوە- دەردەکەوێ کە ئەم دەستخەتەیش ماوەیەک لای ساڵحی کوڕی عەباسی حەیدەری بووە و، دواتریش ساڵی ١٢٨٦ کەوتووەتە لای عەباسی کوڕی ساڵحی حەیدەری.

بەپێی دەستخەتی (٣٩٨٠٤ د.ع) مامۆستا عەبدولقادر سدقی حەیدەری ساڵی ١٢٣٤ قازیی بەصرە بووە و، لەو ساڵەدا ئەو دەستخەتە لای ئەو بووە.

دوور نییە ئەم مامۆستا هەمان عەبدولقادر بێت کە -بەپێی لاپەڕە (٨)ی دەستخەتی ژمارە ١٢٥٩٦- کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی صیبغەتوڵڵای حەیدەری بووە و شیعری لە دەستخەتی ناوبراودا هەیە. بەڵام بەداخەوە لەوە زیاتری لەسەر نەنووسراوە.

## ئیبراهیمەکانی کوڕی عاصیمەکان!!

٤٢٨

دەستخەتی ٧٣٩٩ بەخەتی ئیبراهیمی کوڕی عاصیمی حەیدەرییە و ئەمەی لە کۆتاییەکەیەوە نووسیوە:

«قد تم كتابة هذه النسخة المنسوبة الى أفضل المتأخرين وأكمل المتبحرين مولانا عبدالحكيم الهندي الواقعة على حاشية الخيالي، الضحوة الكبرى من يوم الاثنين [الخامس عشر من الشباط من الشهور اليونانية، الاول من الاسبوع المسمى بخضرو الياس الرابع والعشرين من شهر الله المبارك ربيع الاول، المنتظم في سلك شهور سنة الف ومائة وثمانية(!) وتسعين، من هجرة سيد المرسلين. عليه وعلى آله أفضل السلام الى يوم الدين، على يد الحقير الى الله الهادي ابراهيم بن عاصم الحيدري الحسين آبادي، أحسن الله حالهما، وأورق أغصان آمالهما حالاً ومآلاً. والحمدلله رب العالمين.

تم المقابلة والتصحيح في يوم الثلاثاء الثالث من العشر الآخر من ربيع الآخر في سنة ١١٩٨ والحمدلله رب العالمين».

هەروەها دەستخەتی ٧٤٠٠ش بەخەتی ئەم مامۆستایە و لە کۆتاییەکەیەوە نووسیویە:

«تم كتابة تتمة ما قد كتب في سابق الزمان من الحاشية المسماة بالخيالي، على يد المفتقر الى الله الهادي ابراهيم بن عاصم [مدظلهما] بن ابراهيم [عفى عنه] الحيدري الحسين آبادي. قبيل أذان المغرب من يوم السبت السابع والعشرين من شهر الله المبارك ربيع الآخر، المنتظم في سلك شهور سنة ألف ومائة وثمانية وتسعين، من هجرة سيد المرسلين عليه أفضل الصلاة والسلام الى يوم الدين. آمين.

ئەم مامۆستا لەسەر لاپەڕەی یەکەمی هەندێ شتی نووسیوە نووسینیان بێسوود نییە:

«اسم الخيالي احمد بن موسى. حج ورجع من الحج وجاء الى قسطنطنية، ومات رحمه الله بعد سنة خمس وخمسين وثمانماية، في عصر السلطان محمد الثاني السابع من سلاطين آل عثمان. (حسين الواعظ).

مي شود روزي كه ميگويند اين بود از فلان. وانا الحقير الفقير المفوض الى زمان تصرفه الآن ابراهيم بن عاصم بن ابراهيم الحيدري الحريري الحسين آبادي.

هەر لە هەمان لاپەڕەدا نووسیویە:

«ان الله لايحب عبد البطالة. آخ آخ از بخت. قاتل جگرگوشم لو بيىن لپيش چاوم... هتا الآن نمزنى [نەمزانى] ككار بقوت نيت»

لەم وتانەوە کە بەکوردی نووسیونی دەردەکەوێت کە کوڕێکی کوژراوە. ئیتر نازانین کەی و چۆن و کێ بووە!

هەر ئەم مامۆستا لە کۆتایی دەستخەتی ژمارە ٧٠٥٥وە نووسیویە:

- دوای حەمد و ثەنا و صەلات و سەلام -: يقول من عدل عن سلوك جادة الرشاد، وانحرف عن سمة الصواب والسداد، افقر عباد الله الغني الهادي، ابراهيم بن عاصم بن ابراهيم الحيدري الحسين آبادي: ان الله الودود قد فتح علينا ابواب الكرم والجود، حيث يسر لنا ختم قراءة الشرح المنسوب الى أفضل المتأخرين، عصام الملة والدين، الواقع على متن اكمل المتبحرين، عضد الملة والدين، لدى جناب جامع المعقول والمنقول الحاوي للفروع والأصول حضرة ابينا

المكرم، ووالدنا المفخم عاصم بن ابراهيم، لازال معصوماً عن العاهات بألطاف الملك الكريم. وذلك في يوم الخميس عاشر شهر الله الذي ورد فيه القرآن، المبارك المسمى برمضان، المنتظم في سلك شهور سنة ألف ومائة واثني(!) وتسعين من هجرة خاتم النبيين، وسيد يوم الميثاق، ورسول الملك الخلاق. اللهم اجعلنا من الواصلين الى العين، لا من القاصرين القاعدين في البين. آمين. يارب العالمين .

شایانی باسە دەستخەتەکەیش بەخەتی (نعمة الله)ی برایەتی و ئاوا کۆتایی پێ هێناوە:

«فلله الحمد والمنة على اتمام الشرح المنسوب الى الفاضل المحقق، الحبر المدقق عصام الملة والدين في الوضع، الواقع على متن العضدية، المبين لمغلقاته، الكاشف لمضمراته، من يد الحقير الفقير المتوكل على الله، ابو الجود نعمة الله بن عاصم بن ابراهيم بن حيدر بن احمد بن حيدر الصفوي الحسين آبادي، اللهم اغفر لي ولهم، ولجميع المسلمين، ولمن قرأ، ومن نظر آمين برحمتك يا أرحم الراحمين. في سنة ١١٨٦ من هجرة سيد الأنام صلى الله عليه وآله الكرام.

شایانی باسە ئەم دەستخەتە خۆشکراوە بەحاشیەی گەورە زانایانی کوردی وەک: ڕەسوولی سوورچیی و، شەرانیشیی و، محەمەدی کوڕی حسەین و، زۆری زانایانی بنەماڵەی حەیدەریی.

- غاية التحقيق في شرح رسالة مولانا جلال الدين الدواني المنتمي في نسبه الى الامام ابي بكر الصديق.

ئەم کتێبە بەخەتی دانەرەکەیەتی و ساڵی ١٢٠٤ لە بەغدا نووسیویەتیەوە و، پێشکەشی کردووە بەئیسماعیل پاشای کوڕی بەهرام پاشا[١].

دەستخەتی ئەم کتێبە بەژمارە ٥٢٢١ لە کتێبخانەی ئەوقافی مەرکەزیی بەغدادا پارێزراوە.

دەستخەتی ٧٠٥٥ د.ع کتێبی (عصام الدين)ە بەسەر ڕیسالەی عەضودییەوە

(١) ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونی ئەوەیە کە مامۆستایانی کورد دوای ئەوەی لە بەغدا نیشتەجێبوون پێوەندییان بەکوردستانەوە نەپساوە و، وەک دەڵێن: بەو بایە ژیاون لە کوردستانەوە هەڵی کردووە.

## ئیبراهیمی کوڕی عاصیمی کوڕی صیبغەتوڵڵای حەیدەریی

٤٢٩

یەکێکی دی لە زانا ناودار و ناسراوەکانی بنەماڵەی حەیدەریی ئەم مامۆستا ئیبراهیمەیە کە ساڵی ١٢٨٢ک لە هەولێر لە دایک بووە.

چەند کاری گەورەی لە خەلافەتی عوثمانیدا دیوە. لەوانە:

* قازیی دیاربەکر و سەرۆکی کاروباری شەرعییەی دەفتەری خاقانی عوثمانی.
* ساڵی ١٣٣٣ک بووە بەئەندامی (دار الحكمة الاسلامية).
* ساڵی ١٣٣٤ک بووە بەشێخولئیسلام (گەورەترین پایەی ئایینی بووە لە دەوڵەتی عوثمانیدا).
* بووە بەوەکیلی (صدر الأعظم) واتە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.
* ساڵی ١٩٢٤ز لە دەوڵەتی عێراقدا وەزیری ئەوقاف بووە.
* لە ساڵی ١٩٣١زدا کۆچی دوایی کردووە.

پیاوێکی زانا و نووسەر و نیشتمانپەروەر بووە و، سەروتاری یەکەم ژمارەی ژین کە لە ساڵی ١٣٣٤ک ١٩١٨ز لە ئەستەمبووڵ دەرچووە ئەم مامۆستا نووسیویە و، نموونەی داوا و سکالای نیشتمانپەروەریی کوردێکی دڵسۆزە، دەربڕینی دڵسۆزیی و سەربەرزیی کورد لە مێژووی ژیانیدا دەردەخات[١].

ئیبراهیمی کوڕی عاصیمی کوڕی ئیبراهیمی حەیدەریی لای باوکی خوێندوویەتی. لە ساڵی ١١٩٢دا.

دەستخەتەکە ساڵی ١١٨٦ بەخەتی (ابو الجود نعمة الله بن عاصم بن ابراهيم بن ابراهيم بم حيدر بن احمد بن حيدر الصفوي...) نووسراوەتەوە.

لە دوا لاپەڕەیدا نووسراوە:

قد ولد ولدي المسمى باسم خليل الله ابراهيم في تسع عشر من شهر جمادي الاول يوم الاحد بين صلاة الصبح والظهر في سنة الف ومائتين وتسع عشر. من هجرة خير الانام...

(١) لە ژمارە ٢٣ی ساڵی ١٩٩٨ی ڕاماندا لەسەری نووسراوە.

دەبێ ئەم ئیبراهیمە کوڕی (نعمة الله) بێت؟ نازانم

دەستخەتی (١/٧٨١٧ د.ع)ش بریتییە لە کتێبی (خلاصة الحساب) و (نعمة الله ابو الجود) ساڵی ١١٩٥ نووسیویەتیەوە.

دەستخەتی (١٦٦٠٧ د.ع) قورئانێکی نایابە زلێخا خاتوونی کەنیزەکی صیبغەتوڵلای کوڕی ئیبراهیم وەقفی کردووە و داویەتیە دەستی ئیبراهیمی کوڕی عاصیمی کوڕی ئیبراهیم بەمەرجی ئەوەی هەموو ساڵێ...[1] قورئانی بۆ بخوێنێ. دوای ئەویش بکەوێتە ژێر چاودێری محەمەدی کوڕی عاصیمی ئامۆزای بەهەمان مەرج. ئەم وەقفکردنە لە ساڵی ١٢٠١دا بووە.

## خضری کوڕی محەمەد

### ٤٣٠

یەکێکی دی لە زانا خاوەن دانراوەکانی بنەماڵەی حەیدەریی خضری کوڕی محەمەدی ناسراو بە(محمد الاخرس)ە.

ئەم مامۆستا تەعلیقاتی هەیە بەسەر تەفسیری (آیة النور)ەوە لە تەفسیری بەیضاویی. تەعلیقاتەکەی بەژمارە ٤١٣٩ پارێزراوە.

خضرێک هەیە دەستخەتی ژمارە ٤٢٥٤٨ی نووسیوەتەوە و دەڵێ: لەو کاتەدا کە ساڵی ١٢٤٦ بووە تەمەنی ٣٥ ساڵ بووە، واتە لە ساڵی ١٢١١دا لەدایک بووە، ئیتر نازانین ئەم دوو خضر ناوە یەک کەسن یان نا؟

هەر لە زانایانی بنەماڵەی حەیدەرییدا خضری کوڕی ئەحمەدی حەیدەریش هەیە.

## ئەحمەدی کوڕی عوثمانی حەیدەریی

### ٤٣١

یەکێکی دی لە زانا خاوەن دانراوەکانی بنەماڵەی حەیدەرییە ژیانی لەدەستدا نییە ئەحمەدی کوڕی عوثمانە.

ئەم مامۆستا حاشیەی هەیە بەسەر (عصام الدین)ەوە سەرەتاکەی ئاوایە:

«قوله: وما استفدته. الاولی ماحصلته».

---

(١) لێرەدا قەراخی دەستخەتەکە دڕاوە.

کۆتاییەکەی:

«تمت الحاشیـة المنسوبة الي سلطان المدقـقين وبرهان المحـقـقين مولانا احـمد بن عثمان. عفاة المنان، وأسكنه بحبوحة الجنان».

دەرویشی کوڕی محەمەد ئەمینی کوڕی عەبدوڵلای حەیدەریش نامیلکەیەکی هەیە لە مەتەێکدا بەناوی ئەحمەد تۆفیقی قائیمەقامی والی عیراق.(١)

## چەند زانایەکی دیکەی حەیدەریی لە توێی دەستخەتەکاندا:

٤٣٢

* دەستخەتی ١٧٥٩٥ د.ع کە (الفیة ابن مالك)ە. لە شوێنێکیدا نووسراوە: عەبدولقەدیری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری نوعمانی کوڕی حەیدەر لە حوجرەی ماوەران نووسیویەتیەوە. مێژووی ساڵی ١١٩٦ی پێوەیە.
* دەستخەتی ١١/ح حاشیەی قازیی لاریییە لە زانیاریی حیکمەتدا، لاپەڕەی یەکەمی کەوتووە، حاشیەی گەلێک لە مامۆستایانی حەیدەریی بەسەرەوەیە. عەبدوڵلای (کوڕی) لە گوندی (ماوراء النهر) ماوەران بۆ مامۆستا مەلا ئیسماعیلی کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا حەیدەری نووسیوەتەوە.
* دەستخەتی ٥٧٥٢ د.ع. شەرحی تەکمیل و نامیلکەی ظەرف، محەمەد صادقی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر ساڵی ١٢٠٦ لە شاری سنە نووسیویەتیەوە.
* دەستخەتی ٤٣٢٠١ د. ع. (الوغ بیک) بەسەر حاشیەی مەسعوودییەوە. داودی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەر ساڵی ١١٤٣ لە شاری سەقز نووسیویەتیەوە.
* دەستخەتی ١٢/ح (جلال المنطق) دانراوی مەلا جەلالی دەووانیی. عەبدولمەجیدی کوڕی عەبدولحەمیدی حەیدەرانیی، ساڵی ١٢٨٧ لە گوندی ماوەران نووسیویەتیەوە، دەڵێ: ئەم کتێبەم لەکاتی خوێندنیدا نووسییەوە، لە سەرتایەوە تا دەگاتە (ولابد في الموجبة من وجود الموضوع)م لە خزمەتی مەولانا حسەینی شاریحدا خوێند. لە دوای ئەمەیشەوە بەیتێک نووسراوە و، لە دوای بەیتەکەوە دەڵێ: لە بەغدا نووسیمەوە.

---

(١) بڕوانە: لاپەڕە ٢٢ی بەرگی سێیەمی فیهرەسی دەستخەتەکانی ئەوقافی مەرکەزیی بەغدا.

**دوا وتە لەسەر حەیدەرییەکان:**

کە دوای گەڕان و پشکنین و ئەوەی بۆم لواوە دەربارەی ئەم باسە کردوومە دەست لە نووسین لەسەر زانایانی بنەماڵەی حەیدەریی هەڵدەگرم... دەڵێم: ئەوەی نووسیومە نە ئەوەیە پێویستە بکرێت و، نە ئەوەیە شیاوی ژمارە و پلە و پایەی پیاوانی ئەو بنەماڵەیە بێت، زۆریی و درێژیی و بەرینیی ناو و ژیان و بەرهەمی مامۆستایانی ئەو بنەماڵە لە ئاستێکدا نییە بەوتارێک و دوو وتار، یان چەند باس و لاپەڕە پیایاندا بگەم، بەڵکو مەگەر یان کتێبێکی گەورە، یان چەند بەرگ کتێب ئەوسا بەچەند لایەنێکی ڕابوردووی پیاوانی حەیدەرییدا بگەن.

لەوەیشدا کە نووسراو ڕابورد چی پێویست بێ نەکراوە و، هەر ئەوەندەم دەستکەوتووە و، دەکرێ لەمەولا زیاتریان لەسەر بدۆزرێتەوە و باسەکە تەسەلتر بکرێت، وەک چەند ناو هەیە هەندێ شوێنەواریان دەریدەخات کە لە چەرخی خۆیاندا گەورە و زانا و ناودار بوون، شوێنەوارەکانیان - زۆر کەمیان نەبێ - تێدا چوون و، ناتوانین وەک پێویست لە ئاستیاندا بوەستین. بۆ نموونە عاصیمی حەیدەرییمان هەیە شاعیر بووە و لە پەنا دەستخەتەکاندا شیعری فارسی هەیە بەچەند بۆنەوە گوتوونی. ئێمە هەر ئەو چەند تاکە شیعرەیان دیوە، دوور نییە دیوانی شیعری هەبووبێت و، لەوانەیشە شیعری کوردیشی هەبووبێت، بەڵام جگە لەو چەند تاک و تەرای پەنا دەستخەتانە -ئێستە- هەواڵی شتێکی دی نازانم و، ناشیزانم هەر شیعری بووە یان دانراوی دیکەیشی هەبووە! ئەو چەند شیعرەی لێرەدا دەخەمە بەرچاو و ناوی لە ڕیزی زانایانی بنماڵەکەدا دەخەمە ناوناوان، دووبارە دەبێ بڵێم: بەڕوونی نازانم کام لە - دوو عاصیم یان - عاصیمەکانە.

تأریخ مصالحهء أحمد پاشا. باشاه ایران نادرشاه از گفتهء حقیر عاصم:

از قضا آن شان نادر أز عجم
فکر ملک روم را بستش کمر
بهر حرب اجناد را چون جمع کرد
خوف او بگرفت عالم سر بسر
جز هزبران والی
روز میدان وغا روستم جگر

آن... بی نظیر کامرانی
هیچ از تیغش جدا نبود ظفر
در فلک جاگیر از سهمش أسد
بسکه نامش شجاعت شد سمر
عدلش رفته در أقطار أرض
جود او بگرفت جای بحر و بر
بعد ازان نادم شد از کردار خویش
کرد رجعت سوی آن فرخنده فر
عفو جرم خو بشراخواهان شده
صلح را در خواست زان فرح سپر
آن ولی نعمت پی حال جهان
کرد ازو اغماض هر کیدو کدر
صلح چون انداخت با وی در میان
شد خلاص أهل جهان از شور شر
داعی دولت پی تأریخ گفت:
«بست عقد صلح آن نیکو هنر»
الهی دولتش پاینده باد
پرتو رفعت برو تا بد چو خور

......

جگە لەمەیش ئەو پارچە شیعرەیش کە پێشتر دەربارەی کۆچی دوایی مامۆستا مەلا ئەحمەدی حەیدەریی بلاومان کردەوە بەشیعری ئەم مامۆستای دەزانم.

## مامۆستا شێخ عەبدوللەتیفی بەرزنجیی و دانراوەکانی

### ٤٣٣

گەلێ جار ناوی مامۆستای زانای بلیمەتی کەموێنەی چەرخی خۆییم دۆزیوەتەوە کە سەرچاوەکانی مێژوو لێی بێ ئاگابوون، یان بەناتەواویی ناویان بردووە و ئیتر ئاگایان لە بەرهەم و شوێنەوارەکانی نەبووە، بەڵام خۆشبەختانە من ڕێکەم لە دەستخەت و شوێنەواری هەتیوو تاقانەیان کەوتووە و، ئەو شوێنەوارانە گەواهیی ئەوەیان داوە کە ئەو مامۆستایانە لە سەردەمی خۆیاندا کەڵەمەلا و تاقانە بوون و، لەوانەیە لە ناوچە و شوێنی خۆیاندا دەورێکی کاریگەریان گێڕا بێت، بەڵام بەختیان یار نەبووە کە دانراوەکانیان بەناوچەکاندا بڵاوبێتەوە و، نوسخەیان زۆر ببێت و، لە کتێبخانەکاندا بپارێزرێن و، بەماوەیەکی کەم دوای خۆیان ناو و شوێنەواریان کوێر بووەتەوە.

مامۆستا قیوامەدینی حەسەنیی یەکێک بوو لەو مامۆستایانە، ئەم مامۆستایش ئێستە شتێکی دەربارە دەنووسین چەپی لەو کەم نییە و، زۆری لەسەر نەنووسراوە و، ئەوەیش نووسراوە کرچوکاڵ و بێ پێزە؛ چونکە ئەم مامۆستا -وەک شوێنەوارەکانی دەریدەخەن- کەڵەمەلا و تاقانە و کەموێنەی چەرخی خۆی بووە و، مەلەوانی بابەتە جۆراوجۆرەکانی زانیارییەکانی سەردەمی خۆی بووە و، ئەوەی ئێمە دیومانە لە گەلێکیاندا دانراوی هەبووە، بەڵام نەکتێبخانەکەی دیارە و، نەدانراوەکانی پارێزراون.

خۆشبەختانە لە (د.ع) دا دەستخەتێکم دۆزییەوە - گومانی زۆرم بۆ ئەوە دەچێت دەستخەتی مامۆستا خۆی بێت - کە گەلێ تیشک دەخاتە سەر چەند لایەنێکی ژیانی مامۆستا، پێش هەموویان ناوی خۆی و باوک و باپیری، کە تا ئێستە جێگەی قسە و مشتومڕە، مامۆستا -وەک مامۆستا شێخ مەعرووفی نۆدێیی کردوویەتی- ناوی خۆی و باوباپیری و ڕشتەی پشتی بەشیعر هۆنیووەتەوە و، لەم ڕووەوە دەفەرموێ:

الحـــــمدلله الذي اوجـــدني
مــن صـلـب اولاد الـنـبي المدنـي
ولدت من عــبـــدالرحـــيم ولد
قـــاسم ابن الحــسن ابن السـيـد
ابي يزيد نجل اســـمــاعـيل من
بـابا رســول نجل ســيــدي المؤتمن

ابـن رســـــــول ابـن قـلـنـدر ولـد
سيدي بن عيسى الاحدب ابن السيد
حــــــــسين مـن ابـي يـزيـد ولـد
عـــبــــدالكريم ابـن الولـي المرشـــد
اول مـن سـكـن مـن أجـــــــدادي
قــــرية برزنجــــة في الأكـــــراد
الشيخ عـيسى الاكبـر ابن الـسيـد
بـابـا عـلـي الـهـــــمـــــدانــي ولد

دوای ئەمە بەحەوت بەیت کۆتایی بە ڕشتەی پشتی خۆی دێنێ تا سەر حەزرەتی عەلی و فاطیمەی کچی پێغەمبەر -د- و -خ-.

بەداخەوە شتێکی ڕوونمان لەسەر ژیانی ئەم مامۆستا بەدەستەوە نییە و، جێگای خوێندن و دەرسـوتنەوە و دانیـشتن و کـۆتایی ژیانـی و، فـەقێ و قـوتابیی و ئیـجـازە لێ وەرگرتووەکانی و... نازانین، هەروەها دانراوەکانیشی بەدروستیی نازانین، بەڵام وەک گوتم ئەم دەستخەتەی لە دەستماندایە چەند دانراوێکی ئەم مامۆستای تێدایە بەم شێوە:

١- (منهج الفرائض) ئەم دانراوەی لەسەر داوای مامۆستا مەلا (خضر) ناوێک داناوە کە دوور نییە مامۆستا مەلا خدری ڕواریی بێت؛ چونکە مامۆستا مەلا خدر مامۆستای شێخ عەبدوللەتیف بووە. لەم ڕووەوە دەفەرموێت:

ممـتـــثـــلا من فـــاز بالـســعـــادة
وصـحـبــة الـسـادات في الـعـبـادة
أعني به المولى المسـمى خـضـــرا
لا زال بســـتـــان مناه خـــضـــرا

ئەم دانراوە سەد بەیتە و، سەرەتاکەی لە دەستخەتەکەدا کەوتووە.

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

فـلنحــمــد الله على الاكـمــال
مــــصليــــا عـلى الـنبي والآل
وراجــــيـــــاً مـن ربـي المنـان
ان يخـــتم العـمـــر على الايمان

٢- روضة أوداد السنن: ئەم هۆنراوە باسی سوننەتەکانی نوێژ دەکات و، کتێبێکی مامۆستا شێخ وەسیمی سنەیی[١] هەیە بەزمانی عەرەبی، مامۆستا عەبدوللەتیف دانراوەکەی ئەوی کردووە بەهۆنراوە و لەم ڕووەوە دەفەرموێت:

ضمنتها من سنن الصلاة ما
جمعه الوسيم فخر العلما
سميتها (روضة أوداد السنن)
ففي اسمها تاريخ نظمها علن

کۆتایی ئەم هۆنراوەیشی ئاوا هێناوە:

اشعارها بأسرها موزونة
تضمنت فرايدا مخزونة
فأحمد الله مصلياً على
محمد وصحبه ذوي العلا

٣- القواعد النحوية: لە سەرەتاکەیەوە دەفەرموێ:

يقول من بذنبه قد اعترف
عبداللطيف الراج عفو ما اقترف:
الحمدلله الكريم الصمد
ثم صلاته على محمد
اكرم خلقه مع السلام
وآله وصحبه الكرام
ارجوزة لطيفة مرضية
ضمنتها القواعد النحوية

لە کۆتایشیەوە دەفەرموێ:

ثم الصلاة والسلام للنبي
ختم الرسالات الرسول العربي
وآله وصحبه الهادينا
وكل أهل الدين أجمعينا

وإذ لجلّ النحـــو نظمي مكتـــفي

أرخـتــه بقــولي: نظمي قــد كـفى

٤- ناميلكەی ئاداب

سەرەتاکەی ئاوایە:

الحــــــمـــــدلله الذي صلى على

مـــحـــمـــد أفــضـل من قــد أرســلا

فـــائدة زيدت من الحـــســـاب

ضـــمـنتــــهـــا رســـالة الآداب

ئەم هۆنراوە ١٥ بەیتە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

وفي ســوى الأولى يصـيــر ســائلا

فله مـــا لخـــصـــمـــه تأمّـــلا

٥- العوامل الحرفية:

سەرەتای ئەم هۆنراوەیشی ئاوایە:

يقـــول راجي العــــون من ذي المنن

عـــبـــداللطيف ابـن نجل الحـــسن

الحــــمــــدلله الذي تحــــيــــرا

في ذاتـه وفـي صــــفـــــاتـه الورى

صـــلاتـه ســـلامــــه على النبي

الهـــاشـــمي المدنـي العـــربـي

فـــهـــذه أرجــــوزة عـلـيـــة

ضــمـنـتـهــا العــوامـل الحـرفـيــة

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

تم بـعـــــــون الملــك الجـلـيــل

خلي من الـتـــعـــقـــيــد والتـطويـل

وحين وفــــــقت علــى الاتمـام
أرخـــتــــهـــا بأليق الخـــتـــام

٦- نظم العوامل مجملة:

ئەمە هۆنراوەیەکی (٢٦) بەیتییە وەک خۆی نووسیویەتی عەوامیلی بەکورتیی تێدا کردووە بەهۆنراوە، سەرەتاکەی ئاوایە:

يقــول عــابد اللطيف المعـتــصم:
احـمـد من اليـه يصـعـد الكلم
مـصليـاً على النبي الهـادي
وآله وصـــالح العــبـــاد
ارجـــوزة تشـــمـل كل عــامـل
نظمـتـهـا لابن سليـمـان علي

لێرەدا دەڵێ: ئەم هۆنراوەی بۆ عەلیی کوڕی سولەیمان داناوە، بەڵام ئێمە نازانین ئەم عەلییە کێیە، ئەگەر سولەیمان پاشای بابان کوڕێکی نەبووبێ ناوی عەلی بووبێ و، مامۆستایش ئەم هۆنراوەی بۆ ئەو عەلییە دانابێت.

٧- أحكام الصفة المشبهة:

ئەمە هۆنراوەیەکی بچکۆڵەیە لە پێنج بەیت پێکهاتووە. دوای ئەمەیش سێ بەیتی جیاجیای نووسیوە، هەر یەکێکیان (فائیدة)یەکی تێدایە.

٨- هۆنراوەیەک لە جەبر و موقابەلەدا، سەرەتاکەی:

مـا اكتن شيء مـا أفـاد الضـرب
في نفـسـه مـال وفـيـه كـعب

کۆتاییەکەی:

فـإن تزد عليـه ربعـاً حـاصـلاً
اثنـان مع نصف فـذا مـا جـهـلا
فـالحـمـدلله على التـتـمـيم
ثم على مـحـمـد تسليـمي

٩- قەسیدەیەکی لامییە لە ستایشی خالید پاشای باباندا کە سەرەتاکەی ئاوایە:

المتُ بالحب حـــتى لو دنا أجلي
لما وجـدت بـوجـهي صُـفـرة الـوجل

نموونەی شیعری عەبدوللەتیفی بەرزنجی

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

هدية من لطيف الطبع منتظر
بعد الاله، للطف الحاكم البطل
يا من يسايل عن تاريخ دولته
قد طاف خالد بالمقصود والأمل
١٢٢٠

١٠- مێژووی دروستکردنی مزگەوتێک کە عەبدوڕەحمان پاشا لە پەنای ماڵی خۆیدا دروستی کردووە، سەرەتاکەی:

أراضي الكرد وشحها الكرام
لأرباب العلوم بها مقام
وليٌّ امورها ملكٌ كريم
أمين عادل ليث همام

کۆتاییەکەی:

دعوت بما يؤرخه كذاك
فألهمني له الملك السلام:
(جزاك الله في داريه خيراً)
دعاءً قد يطيب به الختام
أطبه ربنا عيشاً ووفق
على الخيرات ما جاد الغمام

١١- مێژووی دروستکردنی مزگەوتی (نفط) سەرەتاکەی:

حمداً لمن من في سبيله عامل
يجزي بما هو زايد متفاضل
سمك السماء مزيناً بكواكب
هيهات عن ادراك كنهه عاقل

کۆتاییەکەی:

فـبـه حـوالي النفط زاهيـةٌ، وفي
مـا قلت فـيـه شـواهد ودلايـل
أجـبت تأريخـا فـقلت له: بـدا
عـال فـيـفـخـر مـا بناه أوايل
١٢١٨

١٢- بابەتێک هەبووە لەناو مـامـۆسـتـایانی ئەو سـەردەمـەدا جـێـگەی بایەخ بووە و، یەکەمجار لە ئیبنوئادەم پرسراوە و، ئەویش یەکسەر زانیویەتی، دوای ئەویش -دیارە- خەڵکانی دیکە هەوڵی زانین و هەڵهێنانی مەتەڵەکەیان داوە، بابەتەکە پێی گوتراوە: (عـویصـة ابن کـمـال) و ئیـعـلالی (لاتخشـون)ی پێکراوە، ئەم مـامـۆسـتـایش، عـەبدوللەتیـفی بەرزنجی، ئەو بابەتەی حەلکردووە و، خۆی لە کـۆتایی حـەلەکـەیەوە دەفـەرمـوێ: بەزۆریی پەیڕەوی ئیـبـونائادەمم کـردووە. ئەم بابەتەیش لاپەڕەیەکی دەستخەتەکەیە بەخەتێکی ورد.

١٣- مـامـۆسـتـای بەرزنجی، وەک لەو بابەتانەی پێشـوودا کـە باسـمـان کـردن شـارەزا و مەلەوان بووە، لە بابەتی فەتوا و شەرعیشدا جێگەی متمانەی خەڵک و میرانی بابان بووە و، گەلێ باس و فەتوا، کە جێگەی قسەوباس بووبن، بۆ لای ئەم گەڕاونەتەوە و ئەم حەلی کردوون و قسەی ئەمیش دوا قسە بووە و، هەر بابەتێکی بۆ نێررا بێت و ئەم قسـەی تێدا کردبێت ئیـتر قـسـەی تێدا نەمـاوە و، باسـەکـە بەوە کۆتایی هاتووە، لەم ڕووەیشـەوە دەسـتـخـەتەکە چەند فـەتوایەکی لەخۆ گرتووە و، فـەتواکـانی ئەمـیش -بەزۆریی- لە شێوەی وەڵامدا بوون و، پێش ئەم خەڵکانێکی دیکە قسەیان لە باسەکەدا کردووە و فـەتوایان تێدا داوە، بەڵام ئەم فەتواکـانی ئەوانی بەلاوە هەڵە بووە و، زیاتر لە باسەکە کۆڵیوەتەوە و، بەبەڵگە و فەتواکانی ئەوانی داوەتەوە دواوە.

لەم دەسـتـخـەتـەدا چەند فەتوایەکی لەم جۆرەی مامۆسـتـا دەبینین، یەکێکیـان: دەربارەی ئەوەیە کە ئەگەر پێشنوێژ لە شوێنێکی نەوییدا بێت و نوێژکەر لە (مەحفەل) و شوێنی بەرزی وادا بێت بەبێ ئەوەی پێچ بکاتەوە و لای لە قـیـبلە بگۆڕێت نەگـاتە شـوێنی پێشنوێژ جەماعەتەکەی دروست نابێت. مـامۆسـتـامان وەڵامی ئەم بابەتەی داوەتەوە و دەفەرموێ: جەمـاعەتەکەی دروستە، بەڵام بەزۆریی لەم جۆرە فـەتوادا ناوی ئەو کەسانە

نابات کە پێش ئەم لە باسەکە دواون و، دەفەرموێت: (چەند بەرێزێک لەم بارەوە قسەیان کردووە).

١٤- شیوەنێک بۆ عەبدوڕەحمان پاشای بابان:

مامۆستای بەرزنجی -وەک گوتمان- خۆی لەگەڵێ بوار داوە و، لە خۆشیی و ناخۆشیی میرانی باباندا لەتەکیاندا بووە و، بەشیعرە جوانەکانی هاوبەشیی ئەو بۆنانەی کردووە.

یەکێک لەو بۆنانە کۆچی دوایی عەبدوڕەحمان پاشای بابان بووە، کە کاری کردووەتە سەر هەست و دەروونی گەلێ کەس و، مامۆستایشمان بەپارچەیەک شیعر بەشداریی ئەو بۆنەی کردووە و، شیعرەکانی ئاوا دەست پێ دەکەن:

قد خالف الافلاك في الدوران
سيئت وجوه الدهر والأزمان
صبت على الأكراد اي مصيبة
خرس اللسان لها عن التبيان

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

وسئلت عن تاريخ عام وفاته
فأجبت فوراً (ناله من رضوان)
ادخله رب ومن يؤمن في شفا
عة جدنا بشرافة القرآن
ئەم شیوەنە ١٦ بەیتە.

١٥- نامیلکەی کەلام:

وەک لە بەرگی یەکەمی[١] مێژووی زانایانی کورددا باسم کرد، پێوەندییەکی پتەو و برایانە لەنێوان مامۆستای بەرزنجیی و صیبغەتوڵڵای قازیی کۆیەدا بووە و، مامۆستای بەرزنجیی جێگەی متمانەی قازیی بووە و، پرسیاری لێ کردووە و داوای فەتوای لێ کردووە، بەڵام دیارە ئەو نامە و فەتوایانەیش وەک شتگەلی دیکە تێداچوون، لەم دەستخەتەدا کە ئەم دانراوانەی مامۆستای لەخۆ گرتووە، لەوانەیش شتگەلێکی لەخۆ

(١) بڕوانە: بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە، محەمەد عەلی قەرەداغی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی وەمیض بەغدا، ١٤١٩ک - ١٩٩٨ز، ل: ٣٥٩.

گرتووە، لەوانە ناميلكەيەكی تێكەڵاوە لە چەند بابەتێک لەسەر داوای قازیی صیبغەتوڵڵا و براكەی نووسیویەتیی و لە سەرەتاییەوە نووسیویە:

أما بعد: فلما أشار الينا بعض من صبّغه الله بهداه، أعني به القاضي صبغة الله وأخاه، بتسويد وريقات فيما سيتعلق بصفات الله فيها بعض تفصيل في بحث القدر والجبر واختيار العبد فيما أشتهاه، وباختراع شرعية يعد استنباطها على الانكار من جملة الصفات المقابل، وغيرهما من قواعد الحساب، فكتبت من كل ما لديّ حضرت، وأرسلتها لهم هدية لو قبلت...

ئەم ناميلكە سێ لاپەڕە و نیو بەخەتێكی پڕی ورد لە دەستخەتەكە دەگرێتەوە و، كە تەواو دەبێت نووسەرەوە باسی هیچ ناكات و نە ناوی خۆی و نەمێژووی نووسینەوە نانووسێت.

١٦- لە لاپەڕەیەكی ئەم دەستخەتەدا چوار پارچە شیعر هەیە، دوانیان بەفارسی و دووانیان بەعەرەبی، لەسەر شیعرەكان ناوی شاعیر نەنووسراوە، گومان بۆ ئەوە دەچێت شیعری مامۆستا شێخ عەبدوللەتیف بن، لەسەر سیانیان بەڕوونیی نووسراوە كە بۆ سولەیمان پاشا نووسراون، كە دیارە سولەیمان پاشای بابانە.

هەرسێ پارچە شیعرەكە گلەیی و بناشت و داوای بەخشین و لێبووردنیان تێدایە، تەنها لە یەكێكاندا ناوی ئەو كەسە نووسراوە كە داوای لێخۆشبوونی بۆ كراوە، ئەویش شێخ عەبدوڵڵای (باغی)یە كە سولەیمان پاشا گرتوویەتی و ماڵی تالانكردووە، مامۆستای شاعیرمان بەگلەیی و تەوسەوە داوای لێخۆشبوونی بۆ دەكات و دەفەرموێ:

ما سمعنا قبل الحساب عقاباً
انت عاقبت قبل فصل الحساب!
ربنا عالم بكل خفي
وأتى بالحساب قبل العقاب!

لە پارچە عەرەبییەكەی دیدا كە شاعیر بەناوی خۆیەوە نووسیویە، هەمان شێوەی گلەیی سەرزەنشت ئامێزی بەكارهێناوە كە دەفەرموێ:

رأيتك إن أوعدتني أو وعدتني
تنجز إيعادي وتخلف في وعدي

وسهم ملام البال قد أثر الحشا
ولم يبق الا صورة العظم والجلد

لە دوو پارچە فارسییەکەیشدا هەمان ڕێڕەوی پەیڕەویی کردووە، ئەوەتا لە کۆتایی یەکێکیاندا دەنووسێ:

تو علاجی بحال من نکنی
مال شد، علم هم شود برباد
میروم تا عنان شه گیرم
کنم از دست بیوفایان داد

لە کۆتایی پارچە فارسییەکەی دیشدا دەنووسێ

اگر ایشان مرا نمیخوانند
مرز شام وحلب خبر دانند

لێرەدا هەلی ئەوە لە کیس نادەم ئەم دوو پارچە شیعرە وەک خۆیان بڵاوبکەمەوە؛ چونکە پێشتر بڵاونەکراونەتەوە و، کێیش دەڵێت جارێکی دیکە هەلێکی وا دەڕەخسێتەوە لا لەم دەستخەتە بکرێتەوە:

-١-

بخدای که واهب العشق است
بوفای خودم که سر مشق است
با کریمان چون جناب شما
دیگران نزد ما چو کاه کما
گر چه معشوق صد هزارانم
عاشق و مبتلای إیشانم
تا کنون هر طرف که میجستم
نا بدل بود، دست أزان شستم
گر چه هر سو سرم شده مایل
لیک پایم بکوی نو در گل
ور خطا شد بظاهر از جید دست
فی الحقیقه مرا خطای نیست

مــــیکند بنده صـــد هزار گناه
پس بخـــجلت رود ســوی درگــاه
قلم عـــفـــورا بران بکشند
شــربت لطف لطف را بدو نوشند
گـــر خطایم رســد بصــد نوبه
صـــد هزاران گناه و یک توبه
از جناب شـمـا شــود مـأمــول
کـه ز من توبه مـیشــود مـقـبـول
اگــر ایشـــان مــرا نمیــخـوانند
مــرز شـــام و حلب خــبــر دانند

**الی سلیمان پاشا**

-۲-

مـــهــرو صــدق و وفــای من باتو
آفــتــابیــست نزد جــمله عــبــاد
لیک مــخــفی است پیش منظر تو
شـــده کـــاسف بکوکب حـــســـاد
زین جــهت چشم مــرحــمت هرگــز
نکنی بر صــدیق خــویش گــشــاد
گـــر جـــلای وطن کنم پس ازین
مـکـشـــــا هـم زبـان لـوم و عـنـاد
تو عـــلاجی بحـــال من نکنی
مـــال شـــد، علم هم شــود برباد
مـــیـــروم تا عنان شـــه گـــیـــرم
کنم از دست بیـــوفـــایان داد

پاش ئەمانە دەستخەتەکە چەند مەسئەلەیەکی وردی فەرائیضی تێدایە لەوانیشدا ناوی کەس نەنووسراوە و- وەک گومان ئێمە دەستخەتەکە بەدەستخەتی مامۆستا شێخ

عەبدوللەتیف خۆی دەزانین - ئەم مەسئەلانەیش بەبەرهەمی مامۆستا شێخ عەبدوللەتیف دەزانین. لە سەرەتای یەکێک لەو مەسئەلانەوە نووسراوە:

ورد علینا من بعض الاخوان مسألة كلّت دون حلها الأذهان، فتأملت فيها مراعياً لبعض قواعد الحساب، فاذا التوفيق من الله قادني لعين الصواب، فكتبت على غاية من الاختصار ما هو المقصود من الجواب، فمنهم من استغربه ولم يتوجه اليه بصدق البال، إذ لم يفهموا قولي لما كان فيه من عقدة الاجمال...

١٧- لە جێگەیەکی دیشدا نووسیویە:

مسائل دوريات اخترعتها واستخرجتها بقواعد الحساب للتمرين.

ئەمەیش بریتییە لە ١٥ مەسئەلەی خۆی نووسیونی و، حەلەکانیشیانی لە پەنایاندا نووسیوە.

١٨- نامیلکەیەکی مامۆستایەکە - کە بەمامۆستا شێخ عەبدوللەتیفی دەزانم - لە باسی تەڵاقی سێ بەسێدا، وەڵامی مامۆستا شێخ محەمەدی مەدەنیی -موفتیی مەدینە-ی پێ دەداتەوە، بەتیژیی بەسەر نامەکەدا دەچێتەوە و، بەتوندیی وەڵامی دەداتەوە، سەرەتاکەی ئاوایە:

وبعد: فلما رأيت رسالة للفاضل العلامة مفتي الحرمين السيد محمد المدني ذهب فيها الى بعض ما ذهب مما يكاد يخالف الاجماع على عدم وقوع الطلقات الثلاث...

کۆتاییەکەیشی:

كما قال الشيخ ابن حجر في الخاتمة إن صح عنه مكفّر او مبتدع عامله الله بعدله والا غفر الله لنا وله آمين.

١٩- هۆنراوەیەکی پاڕانەوە (موناجات)ە ناوی کەسی بەسەرەوە نییە، ئەمیش بەهۆنراوەی مامۆستامان دەزانم، سەرەتاکەی ئاوایە:

يا ربنا اللهم ذا الجلال

يا من هو المنعوت بالكمال

يا من هو الوهاب للعطايا

يا دافع الأعداء والبلايا

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

وأرتجي بالشيخ محي الدين
تمسكاً بحبله المتين
بشيخنا داود يقضي لي وطر
ودام لي العصمة في كل ضرر

٢٠- قەصدەیەکی عەرەبی لە شیوەن و لاواندنەوەی مەولانا خالیدی نەقشبەندییدا

قەسیدەکە ئاوای لەسەر نووسراوە:

هذه القصيدة للاديب الظريف، الشيخ عبداللطيف، يرثي بها حضرة مولانا تاج العارفين، ونخبة الواصلين، شيخ الطريقة، ومعدن السلوك والحقيقة، الغوث الصمداني، الشيخ خالد النقشبندي القادري الكبروي الچشتي قدس الله سره العزيز ونور ضريحه.

سەرەتاکەیشی ئاوایە:

الا سقيت تلك الربوع الهوامد مُلثّاً حدته للربوع الرواعد
وجادت عليها مقلتي بمدامعٍ اذا بخلت فيها العيون الجوامد

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

ديار نعيم حل فيها فبشرت به كاعب من ساكنيها وناهد
واركان بيت الله قد أرخت له: ديار نعيم حلّ فيهنّ خالد

ئەم قەسیدە لەگەڵ دوو قەسیدەی دییدا کە لە هەمان بابەتدا نووسراون بەژمارە (٣٢٧٤٩) لە (د.ع)ش پارێزراوە، قەسیدەکانی دی یەکێکیان بەتورکییە و، ئەوی دیکەیان قەسیدەکەی محەمەد جەوادی کوڕی محەمەدی کوڕی زەینەدینی حەسەنییە. کە سەرەتاکەی ئاوایە:

خدين الهوى خف الخليط المعاضد وأطلال احباب هويت هوامد
معاهدهم عاف القطين قراده لديها وحاكتها الحمام الفواقد

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

نبغت بصدق عن لساني مؤرخاً: مقامك صدق عند مولاي خالد

٢١- دەستخەتی ژمارە (٢١٤٤٣ د.ع)ش حاشییەی (عبداللطیف)ە، بەڵام نازانم ئەم عەبدوڵلەتیفەیە یان نا. نووسەرەوەکەی ئاوا ناوی خۆی نووسیوە:

(عەبدوڵلای کوڕی محەمەدی کوڕی سولەیمانی کوڕی محەمەدی کوڕی مەحموود لە نەجدی [کوربوت] نووسیویەتیەوە (آه ألف رآه لأجل از دزانم انگو نازانن)!.

دوا وتە: وەک پێشتر گوتم ئەم دەستخەتە کە ئەم زانیارییانەم لێ وەرگرتووە بەخەتی مامۆستا شێخ عەبدوڵلەتیف خۆیی دەزانم، جا ئەگەر وابێت ئەوا لەم دەستخەتەدا گەلێ پرسیار و وەڵام و بابەتی دیکە هەیە کە ناخرێنە قاڵبی کتێب و دانراوەوە و حسابی کتێبیان بۆ ناکرێت، ئەوە ئەوانەیش بەچەند بەشێک لە بەرهەمی ئەم مامۆستا دادەنرێن.

دوای سەرنجدانێکی وردی دەستخەتەکە دەبینین ئەم مامۆستامان لە (حساب و ریاضیات)دا زۆر بەتوانا بووە و، گەلێ کاری وای ئەنجامداوە لە زانای بیروورد و تیژ نەبێت ناوەشێتەوە و، لە زانیاریی (فەرائیض)شدا کە بەبیری تیژی ورد و ریاضیات دەزانرێت مامۆستامان دەستێکی باڵای هەبووە.

ئەوەی جێگەی داخە دوای ئەم گەشتە بەم دەستخەتەدا و، دوای ئەوەیش پێشتر دوو جار لە خزمەتی ئەم مامۆستادا لە ڕێگەی بەرهەمەکانیەوە ژیاوم نەمانتوانی درن بەتاریکیی سەر ڕێگەی مێژووی ژیانی بدەین و، ئەوە نووسیومانە و زانیومانە ئەوەیە ئەم مامۆستا لە سەرەتای سەدەی سیازدەی کۆچییدا کەڵە مەلا و کەڵە شاعیر بووە و، تێکەڵاوی زۆری لەتەک میرانی باباندا بووە و بەعەرەبی و فارسی شیعری بۆ گوتوون. ئەم زانیارییانەیشمان لە دوو دەستخەتی (دار العراق للمخطوطات) وەرگرتووە کە یەکەمیان گومانی تێدا نییە کە دەستخەتی ژمارە (٣٠٧٩١ د.ع) کە دەستخەتی مامۆستا خۆیەتی و، دەستخەتی دووەمیش بەگومانی زۆر بەدەستخەتی مامۆستا شێخ عەبدوڵلەتیفی دەزانین. ئەم دانراوانەی کە لێرەدا ناونووسمان کردن و ئەو دوو دانراوەیشی کە لە بەرگی یەکەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایاندا باسمان کردوون بەشێک لە بەرهەمی ئەم مامۆستان و چاوەڕوانی زیاتریشین بەڵکو!

---

(٢) هەروەها بڕوانە بەرگی ٣٠١/١ هەمان کتێب و، گۆڤاری کاروان ژمارە: ٥٠ تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٨: شاعر باباني اشاد بالاعمال الجليلة للامراء البابانيين المعاصرين له بلغة الضاد، محمود أحمد محمد. هەروەها (العراق ژمارە ٥٢٣٥، ١٩٩٣/٥/٦، قصائد بابانيه لشاعر منسي. محمد علي القرداغي).

## جاری پێشوو (چیای قەواڵە) و ئەمجارە (بەرەوڵێ) دەبێ ئەمجارەیان کام چیا بێت؟

٤٣٤

لە ساڵی ١٩٩٤دا وتارێکم لە گۆڤاری (ڕەنگین)دا بەناونیشانی (چیای قەواڵە و قەواڵەی امیر المؤمنین) بڵاوکردەوە و دواتریش لە بەرگی دووەمی بووژاندنەوەی مێژووی زانایاندا لەنگەری گرت. ئەو کاتە ئەو وتارەم بڵاوکردەوە بەسەرهات و ڕووداوی ناو وتارەکە بەلای گەلێ کەسەوە وەک ئەفسانەی کۆن لە قەڵەم درا و باسی کرا و، هەندێ کەس بڕوایان پێ نەدەکردم کە شتی وا هەرگیز ڕوویدابێت. بەڵام خەڵکانێک وتارەکەیان بەهەند هەڵگرت و بەپەرۆشەوە بەدەمیەوە چوون و، ویستیان بچنە بنجوبنەوانی و، لە چەند کەسم بیست کە لە ئێرانەوە شوێنەوارناس بەدەم باسەکەوە هاتبوون و گەلێ سۆراخیان کردبوو، ئیتر نازانم گەیشتبوونە جێی و چییان کردبوو!

شتێک کە ئەو کاتە لە وتارەکەدا نەمنووسی بوو و بواردم، ئەوە بوو ئەو زەلامەی کە سندووقەکەی دۆزیبووەوە و دوایی هاوڕێکەی شتە نایابەکانی لێ دەوهێنابوو لەناو قسەکانیدا وتی: هەندێ کاغەزە کۆنە و (خەریتە و مەریتە)ی تێدا بوو! من وشەی خەریتەم بەلاوە سەیر بوو، وتم: لەوانەیە چونکە ئەم نەخوێندەوار بووە لە هەندێ لە شتەکان نەگەیشتبێ و باسی (خەریتە)م بوارد!

دوای چەند ساڵێک دەرکەوت کە (خەریتە) کە ڕاست بووە و خەریتەیەک بووە ئەگەر لەناو نەچووایەت و دەست کارناسی دڵسۆز بکەوتایەت لەوانەبوو خەریتە و نەخشەی ناوچەیەکی بگۆڕیایەت، بەڵام لەتەک بەختی ڕەشی ئەو ناوچەدا بڵێین چی!؟

چەند ساڵ بەسەر ئەو وتارەدا تێپەڕی و باسەکە کۆن بوو باسێکی دیم بیست ئەمیش - وەک باسەکەی دی- بەلای گەلێ کەسەوە ئەفسانە ئامێزە! بەڵام ئەمیش -وەک ئەو- ڕووداوێکی دیی جێگەی باس و خواستە و دەکرێ زۆری لەسەر بنووسرێت و بگوترێت، بەڵام ئێمە هیچمان لە دەستدا نییە و هیچمان پێ ناکرێت جگە لەوە کە ڕووداوەکە، وەک لە کەسانی جێگەی بڕوای خەڵکی ناوچەکەمان بیستووە وەهای بگێڕینەوە و، لە کۆتاییدا هەمان ڕستەکە لە کۆتایی وتاری پێشوودا نووسیمان، بنووسینەوە:

«جا با بەم چاوەڕوانییەوە دەست لەم بەرکوڵە هەڵبگرین و بزانین ڕۆژانی داهاتوو چیمان پیشان دەدەن؟»

ئەوەی پێش گێڕانەوەی ڕووداوەکە دەبێ لەبیری نەکەم ئەوەیە:

دوو ساڵە ئەم باسەم بیستووە و لە چەند کەسم پرسیوە تا گەیومەتە ئەنجامی تەواو و جێگەی متمانە، لەگەڵ ئەوەدا دوودڵ بووم لە بڵاوکردنەوەی باسەکە و، گومانم لەوەدا هەیە سوودێکی ئەوتۆی هەبێت و، شتێ بەشتێ بکات. بەڵام دواجار هاتمە سەر ئەوە کە لەوانەیە (ئەم هەویرە ئاو زۆر بکێشێت) و ڕووداوگەلی دیکەی بەدوادا بێت و، لەوانەیە ئەم باسەی ئێمە یارمەتیدەری ئەو کەسانە بێت لەمەودوا بەدوای ئەم دەنگوباسەدا دەچن.

ڕووداوەکەیش وەک بۆیان گێڕامەوە ئاوایە:

چەند کەسێک لە دەربەندیخانەوە بەشارەزایی و ڕێنومایی زەلامێک لە گوندی (س)ەوە ڕوویان کردووەتە (دەربەندی بەرەوڵێ) و، لەوێیش لە ئاوایی (ح) یارمەتیدەر و کۆمەکیکەریان بووە. دیارە ئەو کەسانەی کە لە دەربەندیخانەوە هاتوون زانیاریی وردیان لەسەر ناوچە و شوێنەکە پێ بووە و، نەخشەی ڕێگە و شوێنەکەیان بۆ کێشراوە و، پێویستیان تەنها بەوە هەبووە کەسانێک شوێنەکانیان پیشان بدەن و یارمەتیشیان بدەن لە جێبەجێکردنی ئەوەدا بۆی هاتوون.

پاش ئەوەی گەیشتوونەتە شوێنەکە پەیژەی درێژیان دروستکردووە و، خەڵکی کارامەیان ناردووەتە ئەو شوێنەی ویستوویانە و، شوێنەکە تاقێک بوو کە لە شاخەکە هەڵکەندراوە و بەردەمەکەی بەگەچ و جاروو[1] دیوار کراوە. داوا لەو کەسە کراوە کە گەیوەتە بەردەمی تاقەکە دیوارەکە بڕووخێنێ چی تێدایە دەری بهێنێ، هەر ئەوە بووە، ئیتر پاش ماوەیەکی کەم تاقێکی بۆش وەک نیشانەی سامانێکی بێوێنەی بەتاڵانبراو لەپاڵ هەنگەژاڵەکەدا بەجێ بهێڵن!

لەپەنای ئەم گێڕانەوەدا کۆمەڵێ پرسیار سەرهەڵدەدەن:

یەکەم پرسیار: ئەو کەسانە ئاوا بەشارەزایی ڕوویان کردووەتە ئەو شوێنە و ئەو تاقەیان دۆزیوەتەوە کە سەدەها ساڵە لەو شوێنەدایە و خەڵک بەلایدا دەڕۆن و کەسێ پێی نەزانیوە... ئەو زانیارییانەیان لەکوێ هێناوە؟

لەوانەیە وەڵامی ئەم پرسیارە لە سندووقەکەی (چیای قەواڵی)دا بووبێت[2].

---

(١) بیستم مامۆستا عەبدوڕەقیب یوسف ئەم باسەی بیستبوو، شوێن دەنگوباسەکە کەوتبوو، تا ئەنجام گەچ و جارووی ئەو جێگەی لەسەر تەلەفزیۆن پیشانی بینەران دابوو.

(٢) ئێوارەی ٢٠٠٣/٣/٢٤ لە هەولێرەوە بەرگی پێنجەمی کتێبی مێژووی زانایانم دەبرد بۆ سلێمانیی. سەیارەیەکی کۆستەرم بۆ ئەم کارە بەکرێ گرتبوو. سایەقەکەی ناوی کاک محەمەد بوو =

دوای ئەمــە ئەو ســەربازە گــومناوانە کــە ئەوەندە بەتەنــگ شــوێنەوار و ئاســەواری ئەو ناوچەوە بوون کێ بوون؟ دەبێ ئەو ئاسەوارە کە ئاوا بەو بایەخەوە لەو قوشبنەدا پارێزراوە چی بووبێت؟ دەبێ ئێستە لە کوێ بێت؟ دەبێ سەری تێدا نەبرابێت؟ دەبێ چەند مەتەڵ و گرێکوێرەی پێ بکرێتەوە ئەگەر بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە؟؟

دوای ئەم پرســیــارانە و پرســیــارگــەلی دیکەیش دەڵێین: بۆ دەبێ ئەوان لەو ســەردەمــە دێرینەدا ئەوەندە دڵســۆزی خــاک و وڵاتەکــەیان بووبن و بەو شــێــوە و بایەخــەوە بەتەنگ ئاسەوار و مێژووەوە بووبن، کەچیی ئێمە لەم چەرخەدا بەڕۆژی نیوەڕۆ تالانفرۆشی بکەین و بیدەینە دەستی گورگی شوێنەوار؟

لێــرەدا ئەوەیش نابوێرین کــە مــاوەیەک دوای کــارەســاتەکــە و بڵاوبوونــەوەی هەواڵەکــە لێــپرســراوانی ناوچەکــە گــومــانلێکراوانی ئەو کــارەســاتەیان خــســتــووەتە بەر پرســیــار و لێکۆڵینەوە، بەڵام پاش ماوەیەک بەبیانووی ئەوەوە کە هیچیان لەسەر نەبووە و هیچیان لێ دەرنەکەوتووە بێدەنگیی لە باسەکە کراوە و، (فایلی مەسەلەکە) داخراوە!

لە پەنای ئەم باسەدا کە زۆر بەکورتیی دەستی لێ هەڵدەگرم، دەڵێم: ئەو ناوچە یەکێکە لە کۆنترین ناوچە شوێنەوارییەکانی -نەک عێراق بەتەنها- هەموو جیهان و، تائێستایش چەندین شـوێنی تێـدایە نە کنین و پشکنینی زانســتــیــانەی تێـدا کـراوە و، نە هەواڵی بەلاپەڕەکانی مێژووی ئاسەوار گەیشتووە و، گەلێ باس و خواست تا ماوەیەک لەمەوپێش -وبگرە ئێــســتــەش- بەدەم خــەڵکەوە بوون ڕواڵەتی ئەفــســانەییــان هەیە، بەڵام وا دیارە ڕاستن و هەریەکەیان کارەساتێک بووە بۆ خۆی. لەوانە:

(هەنگەژاڵ)ەکــە: هەنگەژاڵ بەشــوێنێــک یان هەنگێــک دەڵێن کــە لە شــوێنێــکی بەرز و یاخیی وادا بێت زەلام نەتوانێ بەئاسانیی بیگاتێ و بیبڕێت.

---

= لە ئۆردوگای پیرەمەگروون دادەنیشت. لە ئەسڵدا خەڵکی ناوچەی مەرگە بوو.

کاک محەمەد وتی: لەم ڕۆژانەدا زەلامێکم هەڵگرتبوو، وتی: خزمێکم -واتە خزمی نەفەرەکە- بۆی گێڕامەوە لای دەربەندیخان لە نزیکی ئەشکەوتێکدا ئوتومبێلێکیان دیوە چەند کەسی لە دەور بووە، ئەمــانیش ئەچن بزانن ئەوانە کـێن و چین. کـە لێــیــان نزیک دەبنەوە دەبینن بێگانەن و کــوردیی و عەرەبیی نازانن. دەگەڕێنەوە ئەم هەواڵە بەهەندێ لێپرسراو دەگەیەنن. ئەو لێپرسراوانە پێیان دەڵێن: خۆمان دەزانین ئەوانە کێن، ناویان بەرن زمانتان دەبڕین!

وتم: کــاکــە حــەمــە ســەرەداوەکــەی لەلای منە و، ئەم باســە لە ئەشکەوتەکــەی چیــای قــەواڵەوە دەستپێدەکات کە لەمەوپێش من باسیم کردووە و، دواتریش وتارێکم لەسەر (بەرەوڵێ) نووسیوە.

دەربارەی هەنگەژاڵێک لەناو قۆپیی قەرەداغدا - ئیتر ئەو هەنگەژاڵەی دەربەندی بەرەوڵێ بووە یان هەنگەژاڵێکی دیی بووە - حیکایەتێکم بیستووە کە گێڕانەوەی بێ سوود نییە، کە ئاوایە:

هەنگەژاڵێک لە شوێنێکی بەرزدا هەبووە چەند جار زەلامیان بەگوریس شۆڕکردووەتەوە بۆ ئەوەی بیبڕێت -واتە هەنگوینەکەی دەربهێنێت- بەڵام کە گەیوەتە بەردەمی هەنگەکە گوریسەکە پچڕاوە و زەلامەکە کەوتووەتە خوارەوە و مردووە!

ئیتر کەس ئەم نهێنییەی بۆ هەڵنەهێنراوە تا زەلامێک گوتوویە: من دەچم بۆی، بەڵام بەسەردا شۆڕم بکەنەوە، کە شۆڕیان کردووەتەوە و گەیوەتە شوێنەکە دەبینێ لەلای کونی هەنگەژاڵەکەدا، کە کونێکی دەستکرد بووە لە بەردێکدا بەئەندازەی لنگە دەستاڕێک یان بەرداشێک، تیغێکی دوو دەم لە شاخەکە چەقێنراوە، هەرکەس کە بەگوریس شۆڕکراوەتەوە و گەیوەتە لای تیغەکە - تیغەکە گوریسەکەی بڕیوە و، کابرا کەوتووەتە خوارەوە. جا ئەم زەلامە کە بەسەرا شۆڕکراوەتەوە پێش ئەوەی بگاتە تیغەکە خەمی خۆی خواردووە و، بەچەکوشێ یان شتێک کە لەگەڵ خۆی بردووە، تیغەکەی شکاندووە و هەڵیانکێشاوەتەوە بۆ سەرەوە. دوای ئەوە بەشێنەیی جاری دووەم هاتووەتەوە خوارەوە و بەردی بەردەمی هەنگەژاڵەکەی لابردووە، کە بەردەکە لادەچێ دەبینێ لەناوەوە تاقێک یان ئەشکەوتێکی گەورەیە کراوە بەهەنگەڵان و، جێگە بۆ هەنگ سازکراوە کە بەویستی خۆیان کار بکەن و هەنگوین بەرهەم بێنن، دوای ئەمە هەنگبڕان هەرچییان هەبووە لە مەنجەڵ و تیانچە و دەفر پڕیان کردووە لە هەنگوین و، چەند کێشەیان لێ کردووە هەنگوین لەبن نەهاتووە!

دیارە ئەمەیش کاری دەستەڵاتدارێکی گەورە و، بەتوانا بووە و، دەبێ چەند کاری وای کردبێت و، بیری بۆ لای شتگەلی دیکەی چۆن چووبێت؟

هەر لە دامێنی ئەم باسانەدا باسێکی دیکەیش دەگێڕمەوە کە زۆو منداڵ بووم - بیری منداڵی تیژە - بیستوومە شتێکی کەمیم لەبیر ماوە:

دەڵێن: کابرایەکی جوولەکە هاتوەتە تەکیە و، زەلامێکی بەکرێ گرتووە و، لەتەک خۆیدا بردوویەتی بۆ ناو دەربەند - ئیتر دەربەندی تەکیە بووە، یان بەرەوڵێ، یان دەربەند گەور...؟ نازانم - لەوێ شوێنێکی بەرزی پیشان داوە، گوتوویەتی: لەوێ کونێکی تێدایە دەمی کونەکە بەشتێک گیراوە، شتەکە لاببە و دەمی کونەکە بەڕەڵا بکە، ئیتر حەقت بەسەرییەوە نەبێت هەرچی لێ دەرچوو با بۆ خۆی بڕوات. کابرای کرێکار بەقسەی دەکات

و کونەکەی بۆ بەردەدات، هەر لەگەڵ کونەکە بەردەدات وەک شارە زەردەواڵە بەربێت بەو جۆرە شتێکی لێ دەردەچێت و ماوەیەک هەروا شتی لێ دەڕوات، دوایی کابرا دەڵێ: با بزانم چییە؟

کە دەستی دەداتە بەر دەڕوانێ ئەوەی کە دەڕوا هەمووی ئاڵتوونە لە کونەکەوە دەردەچێت و کابرای جوولەکە دەیچنێتەوە!

ڕەنگە دەیان حیکایەتی وا، یان ڕووداوی وا کە بەدەم خەڵکەوەن هەموویان، یان بەشی زۆریان ڕووداوی ڕاست و دروست بن و، دەیانی دیکەیش هەر لەبیر نەمابن و لەبیر چووبنەوە.

هەرچۆن هەیە و هەرچۆن بووە مەبەستمان لە گێڕانەوەی ئەم باس و بەسەرهاتانە ئەوەیە کە بڵێین: لەم چەرخەدا گەلانی جیهان، نەک بەچراوە، بەمیکرۆسکۆبەوە بۆ پاشماوەی کەرەستەی مێژوویی و شوێنەواریان، نەک لە وڵاتی خۆیاندا، لە وڵاتانی جیهاندا دەگەڕێن و، لە هۆڵی ئەوەدان بەهەر شێوەیەک یاسای نێودەوڵەتی یارمەتییان بدات ئەو شوێنەوارانە دەست بخەنەوە و بیانهێننەوە وڵات و ژێر ڕکێفی خۆیان، کەچی کەسانێک لە گەلی ئێمە وەک لە گوێی گادا نووستبن ئاگایان لە جیهان نییە و، بەخۆی و دەسکەلایی بێگانەوە خەریکی کنین و پشکنینی نایاسایی و ناشەرعی دەبن و، هەرچییان چنگ دەکەوێت بەنرخی پیاز و کەمتریش تالانفرۆشی دەکەن و، ئاوارە و ئاودیوی سنووری دەکەن و، بەم کارەیش دەیان ئەڵقەی پڕ بایەخی مێژووی ناوچەکە دەدەنە دەست کەسانێک کە ئەوەی لە بیریاندا نەبێت بەتەنگەوەهاتنی مێژووی ئەم ناوچە دێرینە ئەفسووناوییەیە!

ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بیر لەوە بکرێتەوە کۆتایی بەم کارەساتە ناهەموار و ماڵکاولکەر و خانوومان سووتێنانە بێت و شوێنەوارەکانمان بخرێنە قاڵبی شیاوی خۆیان لە بایەخ پێدان و ڕێزلێگرتن؟

## بنەماڵەی سنەیی مەردۆخیی

٤٣٥

لەناو ئەو بنەماڵانەدا زانیاریی کەم تا زۆرم دەربارەیان کۆکردووەتەوە و، بەهیوا بووم بەدرێژایی لەسەر یەکە یەکەی زانایانیان بنووسم، بنەماڵەی سنەیی مەردۆخیی بوو. پیاوانی ئەم بنەماڵە -بەزۆریی- گەیشتبنە هەر شوێنێک زۆری پێ نەچووە بەزیرەکیی و بلیمەتیی و لێهاتوویی خۆیان ناویان دەرکردووە و، جێگەی خۆیان لەناو کۆڕ و کۆمەڵی زانایاندا کردووەتەوە و، دەوری کاریگەریان لە بەرەوپێشەوە بردنی ڕەورەوەی ڕۆشنبیریدا گێڕاوە و، لەگەڵێ جێگەیشدا وەک شیاویان بێت ڕێزیان لی گیراوە و، شوێن و مەدرەسەی دیار و، پلەوپایەی بالآیان دراوەتێ.

یەکێک لەو بنەماڵانەی لە سنە دەرچوون، یان دروستر بڵێین یەکێک لەو پیاوانەی لە سنە دەرچووە و پاش ماوەیەک بنەماڵەیەکی گەورەی زانیاریی لێ کەوتووەتەوە، بنەماڵەی سنەییە لە بەغدا. بەبۆنەی ئەوەوە بەشی زۆری دانراو و شوێنەواری ئەو پیاوانەی لەو بنەماڵەدا بوون پارێزراوە و، چەپۆکی چەرخی چەپگەرد -تائێستە- دای نەپلۆسیوە و، منیش دەستم بەو شوێنەوارانەدا گەیوە و زانیارییم لێ وەرگرتوون... ئاشنایەتیی زیاترم لە تەک ئەم بنەماڵەدا هەیە و، ویستوومە بەشێنەیی و باشی لەسەریان بنووسم و، ئەوەی لە تواناداد بێت بۆیان بکەم. بەڵام هەرچەند تا ئێستە چەند جار و لە بۆنە و دەرفەتی جیاجیادا شتم دەربارەی چەند کەسێک لە زانایانیان نووسیوە، ئەوەی کردوومە ئەوە نییە من دەمەوێت و دەمویست.

یەکێک لەو کارانەی کە بەهیوابووم بیکەم و گەلاڵەی سەرەتاییشیم کردووە کاری (فـهـرسـت مـخطوطات المكتبـة السنوية فـي بغـداد) بوو؛ چونکە بەشی زۆری دەستخەتەکانی ئەم بنەماڵە لە (دار العراق للمخطوطات)دا لەنگەریان گرتووە و، منیش پێیاندا گەڕاوم و، زانیارییم لەسەر وەرگرتوون و، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە بێت و، لەش و کات مۆڵەت بدەن، بەیارمەتیی خودا ئەو کارە یەکێکە لە ئاواتەکانم و دەبێ ئەنجامی بدەم. ئەو دەستخەتانە نزیکەی دووسەد دەستخەتی نایابن و، پاشماوەی شوێنەواری ڕەنجی چەند پشتی پیاوانی ئەو بنەماڵەن و، خوالێخۆشبوو پارێزەر عەبدوڵلا سنەیی داونی بەکتێبخانەی ناوبراو.

تا ئێستە ئەوەم بۆ ئەنجام نەدراوە و، ئێستەش لەم بەرگەی ئەم کتێبەدا ناو و بەرهەمی

دوان سیانێک لە پەلێکی دی پیاوانی بنەماڵەی سنەییم خستووەتە بەر شەن و بای باس و لێکۆڵینەوە و، کێیش دەزانێ دنیا چۆن دەبێت و، کێ دەڵێ جارێکی دی هەلی ئەوە دەڕەخسێتەوە بۆم بلوێ بێمەوە سەر لایەنێکی دیکەی زانایانی ئەم بنەماڵەیە و، هەموو دواکەوتنێکیش مەترسی لەناوچوون هاوڕێیەتی... بۆیە وام بەباش زانی ناوی ئەو زانایانەی لەمەوپێش تۆمارم کردوون و، ئەو سەرچاوانەی ناو و زانیارییەکانم لێ وەرگرتوون بخەمە دووتوێی ئەم بەرگە، بۆ ئەوەی ئەگەر من بۆم نەلوا و دوای من کەسانێک ویستیان ئەم کارە ئەنجام بدەن، سەرچاوە و سەرەکشتەکی باس و لێکۆڵینەوەیان لە دەستدا بێت و، بتوانن بەئاسانی باسەکەیان تێروتەسەل و دەوڵەمەند بکەن.

ئەوەیش بەخوێنەری ئازیز دەڵێم: لە کتێبی (ورود الکرد فی حدیقه الورود)دا کە بەزمانی عەرەبیی نووسیومە شتێکم بۆ چەند زانایەکیان کردووە.

## بنەماڵەی سنەیی لە بەغدا

ئەم بنەماڵە لە زانای گەورە شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ محەممەد قەسیمی کوڕی شێخ ئەحمەدی دووەمەوە دەستپێدەکات، کە نازانین کەی چووەتە بەغدا. بەگوێرەی دەستخەتی ٥٩٤٦ د.ع ئەم مامۆستا شەشی مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٠٨ لە دایک بووە. دوای تەواوکردنی خوێندن بەگوێرەی دەستخەتی ٣٢٧١٣ د.ع لای شێخ محەمەد قەسیمی گۆرانیی ئیجازەی وەرگرتووە، ئیجازەکە ساڵی ١٢٦٨ نووسراوەتەوە، دیارە دوای ئیجازە وەرگرتنەکە بووە.

لە سەرچاوەکانی بەردەستماندا باسی شێخ ئەحمەدی یەکەم و دووەمی تەختەیی هەیە، بەڵام باسی ئەم شێخ ئەحمەدە نییە و، ئەمیش دەبێ بەشێخ ئەحمەدی سێیەم.

ئەم مامۆستا کە لە بەغدا نیشتەجێ بووە، بووە بەمامۆستای مزگەوتی حسێن پاشا و، لەو شوێنەدا دەرسی گوتووەتەوە و، خزمەتی زانیاریی کردووە تا بەیەکجاریی ماڵئاوایی لە جیهان کردووە. دوای ئەمیش شێخ تاهای کوڕی لە هەمان جێگەدا دەرسی گوتووەتەوە و، خزمەتی زانیاریی کردووە تا یەکجاریی ماڵئاوایی لە جیهان کردووە. دوای ئەمیش شێخ تاهای کوڕی لە هەمان جێگەدا دەرسی گوتووە و خزمەتی ئایینی کردووە. دوای کۆچی دوایی شێخ تاها لەبەرئەوە عەبدولوەهابی کوڕی منداڵ بووە عەبدولفەتاح لە جێگەی دانراوە. دوای کۆچی دوایی عەبدولفەتاح شێخ عەبدولمەجید دانراوە. دوای ئەویش شێخ مستەفای مودەڕیس جێگەدار بووە لەو مزگەوتەدا.

وهذه المرتبة أعلى من المرتبة الأولى ومستلزمة لها وثالثها مرتبة
توحيد الذات وهنالك تمحى الإشارة وتنطمس العبارة ولا أجد
من الوقت المساعدة للخوض فيه فإنه بحر عميق ويكفي في تحقيق
هذه المرتبة المأثورة عن أمير المؤمنين ويعسوب الموحدين
علي كرم الله وجهه في جواب كميل بن زياد صاحب سره وقال
جده وبره فلينظر المستبصر فيه بنظر دقيق ويتفكر فيه بفكر
عميق ليتجلى عليه أنوار التحقيق

تم بحمد الله وحسن توفيقه على
يدي الجاني محمد القسيم بن
أحمد ابن الشيخ محمد قسيم الأردلاني
في جمادى الأولى سنة ١١٨١
مدة كوني مستوطنا
عند الصاحب الأكمل
المرشد بتوفيق الله
الشيخ عبد الله
ابن ... الله
[illegible]
[illegible]

غوونه له دەستخەتی محەمەد قەسیمی سنەیی

لە شوێنەواری ئەم مامۆستا چەند شتێکمان دەست کەوتووە کە ئەمانەن:

١- خلاصة المنطق: کە لێکدانەوەی هۆنراوەیەکە لە مەنتیقدا کاتێ هاتووە بۆ بەغدا پێشکەشی کردووە بەعەلی ڕەزا پاشا. بەژمارە (٣٢٧٢٠ د.ع) پارێزراوە.

٢- حاشیەی بەسەر بەیضاویی و تەفسیری ئەبو سعوودەوە، بەڵام ناتەواوە، بەژمارە ٣٢٦٧٤ لە کتێبخانەی ناوبراودا پارێزراوە.

٣- دەستخەتی ٣٢٧٣٧ش (الورقات)ە لە (اصول الفقه)دا بەخەتی ئەم مامۆستا.

٤- دەستخەتی ٣٢٧٣٤ش (الرسالة الکمیلیة)ی شێخ مەحموودی کوڕی حەسەنی حسێنییە بەخەتی مامۆستا شێخ ئەحمەد، ساڵی ١٢٨٧ نووسیویەتیەوە.

٥- دەستخەتی ٣٢٧٣٩ش کتێبی (اثبات الواجب)ی جەلالەدینی دەوانییە.

مامۆستا شێخ ئەحمەد ساڵی ١٢٥٦ نووسیویەتیەوە، دەستخەتەکە گەلێ زانیاریی تێدایە، بەداخەوە کاتی خۆی ماوەی تۆمارکردنیانم نەبوو.

٦- دەستخەتی ٤٤٠١٩ش (شرح ملا صدرا علی الهدایة الاثیریة)یە مامۆستا مەلا ئەحمەدی گۆرانیی نووسیویەتیەوە بەڵام تەواوی نەکردووە.

ئەم مامۆستا ساڵی ١٢٧٤ی کۆچیی لە جیهان دەرچووە. یەکێک دوای خۆی، نازانین چ بەڕێزێک بووە، ئەم کارەساتەی بەشیعر نووسیوە و، شیعرەکانم لە پارچەکاغەزێکی بچووکدا دی، هەرچەند هەندێکیم باش بۆ نەخوێنرایەوە وا لێرەدا وەک خۆی دەینووسم:

الا إن شیخ العالم أحمد قد مضی
لجنات عدن فهو فیها مخلد
فلم یخش... قال بقسم أرخوا
لقد دخل الفردوس والله أحمد

لە خوار ئەمەوە نووسراوە (٥)ی سەفەری ساڵی ١٢٧٤.

لە خوار ئەمەیشەوە مێژووی کۆچی دوایی شێخ جەعفەریی کوڕی شێخ ئەحمەد بەم شێوە نووسراوە:

«تأریخ وفاة الشیخ جعفر ابن الشیخ احمد السنوي -رحمهما الله
اذا زرت هذا القبر فاعلم بأنه
لمن حظة من فضل مولاه اوفر

مێژووی کۆچی دوایی شێخ ئەحمەدی گۆرانی و جەعفەری کوڕی

سعی سابقا للخیر والیوم ارخوا
جری لاحقا للقبر بالبر جعفر
١٣٠٠

## شێخ تاهای کوڕی شێخ ئەحمەدی سنەیی مەردۆخیی گۆرانیی

٤٣٦

ئەم مامۆستایە یەکێک بووە لە بلیمەتەکانی چەرخی خۆی و، ساڵی ١٢٣٠ لە شاری بەغدا لەدایکبووە. گەلێ کاروباری ئەو سەردەمەی بینیوە لەوانە: قازییێتیی کەربەلا و نابلوس و سەیدا و حیللە و بەسرە و مووسڵ و، دواکاریش پێی سپێرابوو (نیابة)ی شارەزوور بوو، بەڵام لە ڕێگەی چوونیدا بۆ ئەوێ ساڵی ١٣٠٠ لە مووسڵ کۆچی دوایی کردووە و، لە گۆڕستانی (نبی شیث) بەخاک سپێراوە.

پێش ئەم کارانەی لە مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم لە بەغدا مامۆستا بووە و، لەو سەردەمەدا کتێبی (هدی الناظرین)ی لە شەرحی تەهذیبدا داناوە و، بەرانبەر بەوە خەڵات

کراوە و مووچەیەکی ۲۰۰ قرووشی تا لە ژیاندا بێ بۆ براوەتەوە. جگە لەو کتێبەی چەند دانراوی دیکەی بووە لەوانە:

۱- شرح قسم الکلام من التهذیب. بەبالابرینی مامۆستایان:

أ- محەمەد فەیضی زەهاویی.

ب- عەبدولفەتاحی برای شێخ تاهای دانەر.

ج- مەلا حسێنی پشدەریی.

د- جەعفەری برای دانەر.

ه- محەمەد شاکیری ئالووسی.

و- عەبدولوەهابی حسێنیی (امین الفتوی)ی بەغدا.

ز- محەمەد روحی کوڕی زینەلعابیدینی حسێنیی. ۳۲۷۲۳ د.ع. بەسەرەوە.

۲- ۳۲۷۱٤ش هۆنراوە و شەرحی (مختصر المنار)ە.

۳- ۳۲۷٦۲ش نامیلکەیەکی بچکۆلەیەتی لە (هیئة)دا ساڵی ۱۳۰۱ چاپکراوە.

٤- کتێبێکی دی بەناونیشانی (إثبات نبوة خیر من أوتی الحکمة وفصل الخطاب) هەیە، دوو ژمارەی لە (د.ع)دا هەیە، یەکەمیان ژمارە (۳۲۷٦٥) رەئفەتی کوڕی دانەر ساڵی ۱۳۲۱ نووسیویەتیەوە. دووەمیان بەژمارە (۳۲۷٦٤) پارێزراوە و، نوسخەیەکی جوانە، ناوی نووسەرەوە و مێژووی نووسینەوەی پێوە نییە.

٥- دەستخەتی ژمارە ۳۲۷۲٤ش کۆمەڵێک شیعر و قەسیدە و مەقاماتی تێدایە، بەشی زۆریان بەرهەمی شێخ تاهان. لە دەوروبەری ۱۲۸۹دا نووسراونەتەوە.

٦- دەستخەتی ژمارە ۳۲٦۹۱ش مەقامە و پەخشانی شێخ تاهایە و بەخەتی خۆیەتی ۱۷ی زیلحەجەی ۱۲۹۹ نووسیویەتیەوە.

۷- لە دەستخەتی ٥۹٤٦شدا پارچە پەخشانێکی بەعەرەبیی هەیە.

۸- سەرەتا و کۆتایی دەستخەتی ٥۷۲۱ش بەخەتی مامۆستا شێخ تاهایە و ۲۲ی شەعبانی ساڵی ۱۲۹۳ نووسیویەتیەوە.

۹- لە کتێبخانەی ئەوقافی مووسڵدا دوو دانراوی هەیە:

یەکەم: (الصلوات المبارکة).

دووەم: (حاشیة علی المسألة الشعیریة).

شایانی باسە شێخ عەبدوڵڵای کوڕەزای کتێبێکی لەسەر ژیان و شوێنەوارەکانی نووسیوە، بەهیوام خودا یاربێت شتێکی لەتەکدا بکەم.

جگە لە شێخ تاها کوڕانی شێخ ئەحمەد مەلا و خوێندەوار بوون، بەڵام کەسیان وەک شێخ تاها دیار و ناودار نەبوون، شوێنەواریان یان دانراوی دیاریانم نەدیوە. بۆ کۆچی شێخ جەعفەر کە تەقریظی (بەباڵابڕینی) لەسەر کتێبی شێخ تاهای برای نووسیبوو چوار خشتەکییەکم دی کە پێشتریش نووسیم:

اذا زرت هذا القبر فاعلم بأنه
لمن حظه من فضل مولاه أوفر
سعى سابقا للخير واليوم أرخوا
(جرى لاحقا للقبر بالبر جعفر)

ئەم نیوە بەیتەی دوایی دەکاتە ساڵی ١٣٠٠ کە مێژووی کۆچی دوایی شێخ جەعفەرە.

## شێخ عەبدولمەجیدی سنەیی

٤٣٧

یەکێکی دی لە زانایانی بنەماڵەی سنەیی لە بەغدا مامۆستا شێخ عەبدولمەجیدی کوڕی شێخ تاهای کوڕی شێخ ئەحمەدە، کە ئەمیش یەکێک بووە لەوانەی لە مزگەوتی حسێن پاشادا مامۆستا بووە و، پلەی (مدرس)ی بووە. ئەم مامۆستا چەند شوێنەواری هەیە:

١- شرح منظومة الدرر الغرر: باسی ئەم دانراوەیم لە لاپەڕە ١٦٤ی بەرگی چوارەمی ئەم کتێبەدا کردووە. ئەم کتێبە بەناوی (التحفة السنوية)وە چاپکراوە. سێ نوسخەی دەستخەتی لە (د.ع)دا بەژمارەکانی : ٣٢٧٢٢ و ٣٢٧٢٧ و ٣٢٧٢٨ هەیە.

٢- بەڵگەنامەیەکی مێژوویی باسی نیابەتی مامۆستای ناوبراوی تێدایە بەژمارە ٣٢٧٦٧ پارێزراوە.

٣- متن تهذیب المنطق: بەژمارە ٣٢٧٣٧ پارێزراوە، مامۆستا عەبدولمەجید ساڵی ١٢٩٩ نووسیویەتیەوە.

٤- وەضع و ئیستیعارەی مەلا ئەبوبەکری میر ڕۆستەمیی ژمارە: ٣٢٧٢٦ نوسخەیەکیەتی بەخەتی مامۆستا عەبدولمەجید ساڵی ١٢٩٢ نووسیویەتیەوە. ژمارە ٣٢٧٦٠ش نوسخەیەکی دییەتی ساڵی ١٢٩٣ نووسیویەتیەوە.

## شێخ عەبدوڵلای سنەیی (پارێزەر)

٤٣٨

ساڵی ١٩٠٤ لەدایکبووە ١٩٢٦ زانکۆی حقوقی تەواو کردووە، گەلێ کاروباری دیوە لەوانە:

١- عضو نقابة المحامين.

٢- عضو اتحاد المحامين العالمي، وعضو لجنة إلغاء حكم الاعدام فيه.

٣- المشاور القانوني لأمانة بغداد، ١٩٥٥-١٩٦٢.

ساڵی ١٩٨٣ کۆچی دوایی کردووە. جگە لەو دانراوەی باسمان کردن دانراوێکی دی هەیە (وا بزانم) ناوی (أمجاد أسلاف الاشراف)ە. باسی مێژووی سنەییەکان باوباپیری دەکات. لێرەدا باسی سنەییەکانی بەغدا تەواو دەبێت.

## شێخ محەمەد قەسیمی گۆرانیی

٤٣٩

ئەم زانا مەزنە باپیرە گەورەی بەشێکی زۆر لە زانا ناودارەکانی بنەماڵەی سنەیی مەردۆخییە. مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە (بنەماڵەی زانیاران)دا بەدرێژیی لەسەری نووسیوە. لە (د.ع)دا دەستخەتی ژمارە ٣٢٧٣٣ هەیە کە ئەم مامۆستا ساڵی ١١٨٧ لە گوندی سیاگوێز لای مامۆستا مەلا عەبدوڵلا نووسیویەتیەوە.

لەسەر بەرگی دەستخەتەکە نووسراوە: (قسم الكلام من التهذيب) بەخەتی محەمەد قەسیمی سنەیی گۆرانیی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ محەمەد قەسیمی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مستەفا. دەستخەتی ٣٢٧٥١ د.ع ش کتێبی شەرحی تەسریفی تەفتازانییە، ئەمیش بەخەتی مامۆستا محەمەد قەسیمی گۆرانییە. مامۆستا قەسیمێکی دیوان هەیە دەڵێ: قەسیمی کوڕی وەسیمی کانی مشکانیی. ساڵی ١٢٠٩ شەرحی قەسیدەی بوردییەی لە شاری سنە نووسیوەتەوە، لە مەدرەسەی مەولانا محەمەد سەلیم.

شەرحەکە دانراوی فەخرەدینی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەبوبەکر(*).

(*) دوایی جارێکی دیکە گەڕامەوە سەر ئەم دەستخەتە دیاربوو لە کاتی بەرگ تێگرتنەوەیدا ئەم قەسیدە کەوتبوو!

## شێخ عەبدولقادری موهاجیر

٤٤٠

مەبەستی سەرەکیم لەم نووسینەم دەربارەی بنەماڵەی سنەیی زیاتر ئەوەیە جێگە و شوێنی ئەو شوێنەوارانەیان دیاریی بکەم کە لە چنگی مۆتەکەی لەناوچوون ڕزگاربوون و، لە پەنای ئەوانەیشدا ئەگەر زانیاریی نوێ و نەبیستراوم دەستکەوت بیخەمە سەر ئەو باس و زانیارییانەی لەمەوپێش نووسراون.

مامۆستا شێخ عەبدولقادری موهاجیر بەبۆنەی ئەوەوە لەبەر بۆنەیەکی زانراو لە کوردستانی ئەودیوەوە هەڵهاتووە و، لە سلێمانیی گیرساوەتەوە، ناوبانگی موهاجیری بۆ ماوەتەوە. دوای ئەوەیش کە لە سلێمانیدا دانیشتووە و، بووە بەمامۆستا و، لەلایەنی دەوڵەتی عوثمانییەوە ڕێزی تایبەتی لێ گیراوە و، خۆیشی زانایەکی بەتوانا و پایەبەرز بووە: لەگەلێ لە پیاوانی ئەم بنەماڵە زیاتر ناسراوە و، دانراوەکانیشی لەناو فەقێ و مەلایاندا بڵاوبوونەتەوە و، بوون بەکتێبی مەنهەجی خوێندنی فەقێیان و، مامۆستایان لە شارە جیاجیاکانی کوردستاندا بەدەرس گوتوویاننەوە و، دەیان و سەدان دانەیان لێ نووسراوەتەوە و، هەموو سووچ و قوشبنێکی کوردستانیان گرتووەتەوە. بەتایبەتی کتێبی (تقريب المرام شرح تهذيب الكلام). ئەم کتێبە دەیان دانەی گەیوەتە (د.ع) و لێرەدا ژمارەی هەندێکیان دەنووسین:

١- تقريب المرام شرح تهذيب الكلام: ئەم نوسخە بەژمارە ٤٣٩٢٤ د.ع پارێزراوە و، لەناو ئەو نوسخانەدا من دیومن ئەمە کۆنترینیانە؛ چونکە ساڵی ١٢٨٥ محەمەد ئەمینی کوڕی لە سەردەمی ژیانی دانەریدا نووسیویەتیەوە.

٢- ژمارە ٥٨٥٣یش نوسخەیەکی دییەتی محەمەدی کوڕی حسێنی دێلێژەیی لەبەر خاتری محەمەد ساڵحی کوڕی سەیید مەحموودی دێلێژەیی -دیارە مامۆستا بووە- ساڵی ١٢٩٠ نووسیویەتیەوە.

٣- ژمارە ١٨٣٢٠ش نوسخەیەکی دییە شێخ محەمەد ئەمین دەلووجەیی ساڵی ١٣٠١ لە مزگەوتی شێخ مستەفای موفتیی لە سلێمانیی نووسیویەتیەوە.

٤- دەستخەتی ژمارە ٢٥٠٦٦ د.ع نوسخەیەکی زۆر نایابی (تتميم المرام)ی مامۆستایە، ئەم نوسخە مەلا مەحموودی مەزناویی نووسیویەتیەوە. گەلێ زانیاریی بەسوودی تێدایە، لێرەدا دەقێک لەوانە دەنووسین کە مامۆستای مەزناویی نووسیویەتی:

«سألت عن مولاي وأستادي دام بركته في أول محرم الحرام في سنة ١٢٩٥: ما عدد سن عمركم الشريف؟ أجاب: نال عمري في الشوال البارح من ١٢٩٤ اربعة(!) وثمانين سنة. وكان تأليفه للشرح الجديد غير هذا الشرح في سنة ١٢٩٣، وأجازني بتعليم الشرح الجديد عند قراءتي إياه لدى خدمته من أوله إلى آخره للطالبين المستحقين. والصلاة والسلام على سيدنا محمد وآله أجمعين».

لێرەدا کە باسی مامۆستای مەزناویی دەنووسین دەبێ بەسەر ئەوەدا نەڕۆین کە لە کتێبی (تتميم المرام)ی ئەم مامۆستادا کە ئەو دەقەی سەرەوەمان لێ وەرگرت و، لە چەند دەستخەتی دیکەیشەوە دەردەکەوێ مامۆستای مەزناویی شاعیریش بووە و شیعری فارسیی و کوردیی هەبووە و، نازناوی (هجری) بووە و، باسی ئەم کتێبەمان بەدرێژی لە بەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا نووسیوە.

٥- دەستخەتی ١٦٤٢٩ش نوسخەیەکی دیکەی (تقريب المرام شرح تهذيب الكلام)ی مامۆستای موهاجیرە، مەحموودی کوڕی مەلا سەعیدی کوڕی مەلا مەحموودی کوڕی مەلا ئەحمەدی قەمچووغەیی ساڵی ١٣٠٥ لە خزمەتی شێخ نەسیمی برای مامۆستا شێخ عەبدولقادری دانەرەکەیدا نووسیویەتیەوە.

٦- دەستخەتی ژمارە ٢١٦٩٠ش دانەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە و، کۆتاییەکەی ئاوایە:

«الحمدلله الملك العلام على اتمام تهذيب الكلام للعلامة التفتازاني الهمام، وشرحه الفائق الملائق تقريب المرام، للشيخ الفاضل الكامل المهاجر بأنملة سميه عبدالقادر، نجل عبدالمؤمن الجوانرودي المير عبداللهي حفهما الغفران ولطفه... مع حواشي استادي ومن به اعتمادي، شمس فلك العرفان سمي ابن عوف عبدالرحمن، تالی الفاضل القزويني، مولانا المحقق الپينجويني، ووقع ختم قراءته لدى ذلك الجناب لازال ظله العالي على زمرة الطلاب. ١٣١٣هـ».

٧- ژمارە ١٦٧٨٥ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە محەمەدی... کوڕی مەلا عەبدوڵڵای نازەنینیی لەبەر خاتری مەلا عەلی [دارسی!] کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەمەدی کوڕی حسێنی کوڕی حەسەنی کوڕی مەحموودی کوڕی نەبیی (دارسی) هێرۆیی ساڵی ١٣١٥ نووسیویەتیەوە.

٨- دەستخەتی ٤٢٤٢٤ش نوسخەیەکی دییەتی عەبدولقادری (خوچ خوچی) ساڵی ١٣٢٨ نووسیویەتیەوە.

٩- دەستخەتی ٤٣٣١ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە عەبدوسەمیعی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەلی چنارەیی ساڵی ١٣١٦ لە قەڵای ئەربیل لای ماموستا مەلا ئەبوبەکری ناسراو بەمەلا گچکە نووسیویەتیەوە.

١٠- دەستخەتی ٤٣٩٠٩ش نوسخەیەکی (تتمیم المرام)ی شەرحی (تهذیب الکلام)ی دانراوی ماموستای موهاجیرە. مستەفای کوڕی سەعید ئەفەندیی قەڵەندەر ساڵی ١٣٠٢ نووسیویەتیەوە.

١١- دەستخەتی ژمارە ٢١٦٩١ش نوسخەیەکی دییەتی سولەیمان جوانڕۆیی لە شاری ساوجبلاغ نووسیەتیەوە.

جگە لەمانەی سەرەوە ژمارەی چەند دەستخەتی دیکەی ئەم کتێبە تۆمار دەکەم کە لە کارتەکانی لای خۆمدا ناوی نووسەرەوە و ساڵی نووسینەوەیان نەنووسراوە، ئیتر نازانم کاتی خۆی لەبەر پەلەپەل هەر ناو و ژمارەکانیانم نووسیوە، یان هەر خۆیان بێ ساڵ و ناوی نووسەرەوە بوون:

١٧١٢٠، ١٨٣٧٤ قەسیدەیەکی شێخ ڕەزای تاڵەبانیی لە سەرەتاکەیەوەیە. ١١٩٦٠ (قسم الالهیات)، ١٥٨٩، ١٤٥١٢، ١١٣١٢، ٣٥٩٣٦، ٧٢٦٠.

ماموستای موهاجیر جگە لە دانراوەکانی (تقریب المرام) و (تتمیم المرام) چەند دانراوی دیکەیشی هەبووە، ڕێگەمان لە چەند دانەیەکیان کەوتووە لێرەدا ناو و ژمارەکانیان تۆمار دەکەین:

دەستخەتی ژمارە ٤٣٢١٥ د.ع سێ دانراوی ئەم ماموستای تێدایە، هەرسێکیان بەخەتی ماموستا مەلا مەحموودی مەزناوییە، ساڵی ١٢٨٥ نووسیویەتیەوە، بەم جۆرە:

أ- شرح النموذج في العقائد. شەرحەکە و مەتنەکە هەردووکیان دانراوی ماموستا موهاجیرن.

ب- شرح الزوراء والحوراء.

ج- حاشیەی ماموستای موهاجیر بەسەر (اللاری)یەوە.

٢- دەستخەتی ٢١٣١٦ش کۆمەڵێک دانراوی ماموستای موهاجیری تێدایە بەم شێوە:

أ- تتمیم المرام.

ب- رسالة في الإمامة.

ج- حاشیەی بەسەر مەسئەلەی عیلمی خوداوە کە دانراوی عەبدولحەکیمە.

د- رسالة في العقل.

هـ- رسالة في الزمان والزماني.

ئەم دەستخەتە لە کۆتاییەوە ناتەواوە.

٣- شەرحی مەسئەلەی عیلمی خودا دانراوی عەبدولحەکیم. بەژمارە ٣/٧٨٢١ پارێزراوە. محەمەد سابیری کوڕی عەبدوڵلای گردمەلایی ساڵی ١٣٧١ لەبەر خاتری مەلا تەبیبی دووشیوانیی نووسیویەتیەوە.

٤- الشرح العجيب على الدواني. سەید مەحموودی مودەڕیس، خەتیب لە سلێمانیی ٣ی شەوالی ١٢٧٢ نووسیویەتیەوە.

رفع الحاجب في إثبات الواجب، لەسەر ریسالەی جلال الدوانی. ساڵی ١٢٨٩ نووسراوەتەوە.

٦- دەستخەتی ژمارە ٥٠٧٥ د.ع ش کۆمەڵێک دانراوی - مامۆستا موهاجیرە لەوانە:

أ- حاشیەی بەسەر (اللاری)یەوە.

ب- حاشیەی بەسەر عەقائیدی دەوانییەوە. لەتەک چەند نامیلکەی دیدا.

٧- دەستخەتی ٣٥٦٢٥ش نامیلکەیەکی مامۆستای موهاجیرە، لە کۆمەڵێک دانراو دەرهێنراوە سەرەتاکەی ئاوایە:

«نحمده على ما هدانا الى عقائد الاسلام، ونشكره على ما اولانا... وبعد: يقول العبد الضعيف المهاجر الفقير الى رحمته تعالى عبدالقادر: لما كان نبذ من عقائد أهل الحق صعب المنال».

٣٢ لاپەڕەیە، کۆتاییەکەی ئاوایە:

«وإن كنت جاهلاً من جميع هذا فاعلم أنه لاقيمة لك، ولا نقد لك من جملة الموجودين الى تفصيل النشأتين».

٨- دەستخەتی ١/١٧٥٦٣ ش (شرح العقائد)ی دانراوی شێخ عەبدولقادری موهاجیر.

٩- دەستخەتی ٥٥٦٩ د.ع ش (دلائل الخيرات)ە بەخەتی مامۆستای موهاجیرە، بەڵام مێژووی تێدا نییە خەتەکەی زۆر خۆشە.

ئەمانەی لێرەدا تۆمارکران ئەو شوێنەوار و دانراوانەی مامۆستای موهاجیرن کە لە

(د.ع)دا پارێزراون و دیومن. لە کتێبخانەکانی ئەوقافی سلێمانیی و بەغدا و شوێنانی دیکەیشدا شوێنەواری ئەم مامۆستا زۆرن و، لە فیهرەستەکانیانیشدا باسکراون و، خوێنەر و لێکۆڵەرەوە دەتوانێ بەپشکنین هەواڵیان بزانێ و سوودیان لێ وەربگرێ.

## شێخ محەمەد جەسیم

٤٤١

یەکێکی دی لە زانایانی ئەم بنەماڵەیە شێخ محەمەد جەسیمە. مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە بنەماڵەی زانیاراندا باسی ئەم مامۆستای کردووە و دەفەرموێ: کوڕی سێهەمی شێخ محەممەد سەعید و لەپاش کۆچی دوایی شێخ محەمەد وەسیم ماوەیێ لە مەدرەسەی (دار الاحسان) دەرسی گوتووەتەوە و نامیلکەی (کشف الغطا)ی لە عیلمی کەلامدا داناوە. زۆر نەماوەتەوە لەو مەدرەسەدا و ساڵی ١٣٠٦ لە شاری سنە کۆچی دوایی کردووە. مامۆستای ڕۆحانیش لە (مشاهیر کرد)ا ساڵی ١٣٠٥ی بۆ کۆچی دوایی داناوە[1]. لە دەستخەتەکاندا شتێکی ئەوتۆم دەربارەی ئەم مامۆستا دەست نەکەوت، تەنها دەستخەتی ٥٣٨٥ د.ع نەبێت کە لە کۆتاییەکەیەوە نووسراوە:

«قد تم تحرير هذا الكتاب الشريف والزبر المنيف (الترتيب الحسن، فهرس آيات القرآن الكريم) برسم الأمير الكبير، ذي المجد الجدير والوجه المنير، حضرة الأمير حسن بيك دفع الله عنه كل المحن، وشيد له في الأمور ما وهن، بقلم الحقير الداعي محمد الجسيم في خامس عشر شهر ربيع الأول، بعد مضي ألف ومائتين وأربع وثلاثين والحمدلله رب العالمين».

بەپێی ئەم دەقە و کۆچی دوایی کە دیاریکراوە دەبێ مامۆستا شێخ محەمەد جەسیم یەکێک لە مامۆستا بەتەمەنەکان بووبێت و لە ٩٠ ساڵ زیاتر ژیابێت.

## محەمەد سەلیمی یەکەم

وەک گەلێ جار نووسیومە و گوتوومە کوردستان دەیان بنەماڵەی زانیاریی پان و بەرینی تێدا بووە کە پشتاوپشت میراتی کوڕ لە باوک و باپیرانییەوە تەنیا زانیاریی و کتێب و ڕشتەی ئیجازە و مەدرەسە بووە و، شانازییان بەباوک و باپیرانیانەوە لەو ڕووەوە بووە کە

---

(١) بڕوانە: بنەماڵەی زانیاران، ل: ١٤٥. مشاهیر کرد، بەرگی دووەم. ل: ٢٣.

مەلا چاک و خاوەنی مەدرەسە بوون و، لای فلان مەلا چاک ئیجازەیان وەرگرتووە و، فلان مەلا و فلان مەلایش لە موجازەکانی ئەوان بوون.

شانازیی کردنیش بەباو باپیرانەوە گەلێ دیمەنی لەخۆ گرتووە، یەکێکیان ئەوە بووە کوڕ کە بووە بەمەلا و خاوەنی مەدرەسە و فەقێ و ماڵ و خێزانی پێکەوە ناوە و خودا کوڕی پێ بەخشیوە کوڕەکەی بەناوی باوکی خۆیەوە ناو ناوە؛ چونکە باوکی مەلا چاک بووە و ئەمیش ئاواتی ئەوە بووە کوڕەکەی لەسەر ڕێبازی باوکی بڕوات و پەیڕەوی ئەو ڕێگە و ڕەوشتە بکات ئەو لەسەری ڕۆیشتووە. بۆیە دەیان جار ناوگەلی وەها دەخوێنینەوە، وەک لەم بەرگەدا و لە بنەماڵەی حەیدەرییەکاندا ئەوە زۆر بەڕوونیی دەبینین، وەک ئەحمەدی کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەد... کێ و کێ.

بنەماڵەی مەردۆخیش پەیڕەویی هەمان ڕێبازیان کردووە و، لەناو زاناکانیاندا دووپاتبوونەوەی ناوی یەک کەس چەند جار دیاردەیەکی نامۆ نییە، وەک محەمەد وەسیمی یەکەم و، محەمەد وەسیمی دووەم و، محەمەد سەلیمی یەکەم و محەمەد سەلیمی دووەم...

## محەمەد سەلیمی ئەردەڵانیی یەکەم:

### ٤٤٢

ئەم مامۆستایە - وەک مامۆستا محەمەد وەسیمی یەکەم - نیسبەتی ئەردەڵانییان لەتەک ناوەکانیاندا پاراستووە و، ئەمەیش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم مامۆستایانە لە بنەڕەتدا خەڵکی ئەردەڵان و کوردستانی ئەودیو بوون و، سا یا بۆ خوێندن یا بۆ دەرسوتنەوە و گەشەدان بەڕۆشنبیریی هاتوون بەمدیودا و ئیتر لەم وڵاتە گیرساونەتەوە و، لە مەدرەسە و شوێنە دیارەکاندا لەنگەریان گرتووە و، دوا قۆناغی ژیانیان لەو شوێنەدا کە بەدڵیان بووە و بۆ خۆیان هەڵبژاردووە ژیاون و، هەر لەو شوێنانەیشدا ماڵئاواییان لە دنیا کردووە و، ئارامگای هەمیشەییان لەوێدا بووە. بەڵام بەداخەوە کەمیان خەمیان خوراوە و، بەزۆریی ناو و شوێنەواریان کوێربووەتەوە. مامۆستا محەمەد سەلیمی یەکەم یەکێکە لەو زانایانە و لە ئەردەڵان هەڵکەنراوە و ڕەنگە گەلێ جێگە گەڕابێت تا دوا قۆناغ لە مووسڵ گیرساوەتەوە، لەوانەیە هەر لەوێش کۆچی دوایی کردبێت.

سەرچاوەکان دەربارەی ئەم مامۆستا دەڵێن: خەڵکی شاری سنە بووە و، تا کۆتایی سەدەی دوازدەی کۆچیی لە ژیاندا بووە، لای سیبغەتوڵلای حەیدەریی و چەند کەسی دی ئیجازەی وەرگرتووە، دوای ئەوەی خوێندنی تەواو کردووە لە مزگەوتی عومەریی مووسڵ

بووه بەمامۆستا و گەلێ قوتابیی لە زانیاریی و ڕەوشتی بەرزی بەهرەمەندبوون و، هەر لەوێیش لە جیهان دەرچووە[1].

ئیتر ئەم مامۆستا چ دەورێکی بووە لە موسڵدا، دەرسی بەکێ گوتووە، ئیجازەی بەکێ و کێ داوە و...؟ هیچ دەربارەی ئەمانە نەزانراوە و، شوێنەوارەکانی بێ سەروشوێن. لە ئەنجامی گەڕان و پشکنینی دەستخەتەکاندا یەک ئاماژەم دەربارەی قوتابییەکی ئەم مامۆستا دەستکەوتووە لێرەدا وەک خۆی تۆماری دەکەم:

لە دەستخەتی ژمارە: ٣٢٧٣٣ی (د.ع)دا نووسراوە:

«تمت باليمن كتابة إجازة الشيخ العلامة الحبر ابن حجر بعونه وتوفيقه في سنة ١١٧٩ على يد أقرب الطلاب الى العذاب. إلا أن يعفو بكرمه الوهاب، مصطفى بن عبدالغني بن شيخ يحيى البلاوي، لأجل استاذه العزيز ملا سليم الأردلاني موطنا، الموصلي مسكناً، في جامع علي العمري. آه من الموت وحالاته! تغربت على أهلي أطول غربة. يا شعري هل أموت غريباً؟! وقيل في حقه: لقد ذلت له سبل المعاني * وفاق الخلق طراً بالبيان.

جاني المحبوب في وقت الغلس

قمت إجلالا له حتى جلس»

في سنة ١١٨١.

لە بەرگی هەشتەمی (فهرس المخطوطات مكتبه الاوقاف العامه فى الموصل)شدا دەربارەی ئەم مامۆستا هاتووە: ئەم مامۆستا لە مەدرەسەی مەلا زەکەریا لە مووسڵ مامۆستا بووە و، گەلێ کەس لە خزمەتیدا خوێندویانە و سوودیان لە زانیارییەکانی وەرگرتووە، لەوانە (الخطيب العمرى) خاوەنی کتێبی (منهل الأولياء) و، چەند کەسی دی. تا لە ساڵی ١٢٠٣دا کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (نەبی شیث) بەخاک سپێراوە[2].

دیارە وەک لە دەقەکەی پێشوودا ڕابورد ئەم مامۆستا لەپێشدا لە مزگەوتی (على العمرى) بووە و دوایی هاتووەتە ئەم مزگەوتە، چونکە ئەم مزگەوتە ساڵی ١٢٠١ دروستکراوە و مامۆستای ئەردەڵانی ساڵی ١١٧٩ لە مزگەوتەکەی دی بووە.

---

(١) بڕوانە: مشاهير كرد. بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٢٥٢.

(٢) بڕوانە: سەرچاوەی ناوبراو، ل: ٢٠٦.

## شێخ محەمەد سەلیمی دووەمی سنەیی

### ٤٤٣

لە لاپەڕەکانی مێژوودا و، لە کۆتایی و پەراوێزی دەستخەتەکاندا ناو و -هەندێ- بەرهەمی چەند مامۆستایەک دەخوێنینەوە کە ناوەکانیان ئاوایە: محەمەد قەسیم، محەمەد نەسیم، محەمەد وەسیم، محەمەد سەلیم، محەمەد جەسیم... ئەم پیاوە زانا و مامۆستایانە لە شاری سنەی کوردستانی ئێران و دەوروبەریدا هاتوونەتە جیهان و، دوای سەرەتای خوێندنیان لەو زادگایانەیاندا بۆ خوێندن و گەشەکردنی زانیاریی و بڵندکردنی پلەی خوێندەوارییان ملیان بەشار و شارۆچکە و گوندەکانی کوردستانەوە ناوە و، دەیان شوێن گەڕاون و، لای چەندین مامۆستا خوێندوویانە، تا گەییون بەو پلەی ویستوویانە یان بۆیان لواوە.

ئەم مامۆستایانە شوێنی دیار و دەوری کاریگەریان بووە لە گەشەپێدان و بەرەو پێشبردنی ڕەوتی زانیاریی و ئەدەب لە کوردستاندا و، ماڵئاواییان لەم جیهانە نەکردووە تا شوێن دەست و پەنجەی خۆیان بەرووی ڕۆژگارەوە بەجێهێشتووە و، شوێنەواریان ئەسپەردەی ڕۆژگار و چەرخ کردووە، بەڵام -وەک هەموو جارێ وتوومانە و دەیڵێین- دوای خۆیان خەمخۆری بەرهەم و مێژووی ژیانیان لەناو ڕۆشنبیرانی گەلەکەیاندا -کە زۆریان دەسنێژی خۆیان بوون- نەبووە و، ئێستەیش شوێنەوارەکانیان وردە - وردە کوێر دەبنەوە و، ئەو زانیارییە کەمەی دەربارەیان ماوە لەبیر دەچێتەوە.

مامۆستا بابا مەردۆخ لە (مشاهیر)ەکەیدا باسی مامۆستا شێخ سەلیمی کردووە، بەڵام باسێکی کورت و بێ ئەوەی باسی دانراو و بەرهەمەکانی بکات. بەڵام ئێمە دوای پشکنین و گەڕان لە (د.ع)دا هەندێک شوێنەواری ئەم مامۆستامان دۆزیوەتەوە لێرەدا ئاماژە بۆ شوێنەکانیان دەکەین، بەڵام دوای کورتەیەکی ژیانی.

### کورتەیەکی ژیانی مامۆستا محەمەد سەلیمی مەردۆخی دووەم

ئەم مامۆستا کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ عەبدولکەریمی کوڕی شێخ عەبدولغەفارە، لە نەوەی شێخ ئەحمەدی عەللامەی مەردۆخییە. ساڵی ١٢٧٤ لە گوندی تەختە لە دایک بووە.

دوای ئەوەی سەرەتای خوێندنی گوزەراندووە بۆ تەواوکردنی خوێندن سنە و ساباڵاخ و

چەند شوێنی دیکە گەڕاوە، ئەنجام چووەتە شاری سلێمانی و لای مامۆستا شێخ عەبدولقادری موهاجیر چەردەیەکی خوێندووە، دوای ئەوە چووەتە بیارە لای مامۆستا مەلا عەبدولقادری کانی کەوەیی خوێندنی تەواوکردووە و هەر لای ئەویش ئیجازەی دەرسوتنەوەی وەرگرتووە. هەر لەو تاوەدا ڕێبازی تەریقەی نەقشبەندیشی هەڵبژاردووە و، بووە بەموریدی شێخ عومەری بیارە -فەوزیی- و لای ئەویش ئیجازەی ئیرشادی وەرگرتووە و، دوای ئەوە گەڕاوەتەوە بۆ شاری سنە و، لەوێ بەدەرسوتنەوە و ئیرشادەوە خەریک بووە تا لە تەمەنی ٦٣ ساڵیدا ساڵی ١٣٣٧ کۆچی دوایی کردووە.

بە سێ زمان: کوردی و، فارسی و، عەرەبی شیعری گوتووە، شیعرەکانی بەزۆری لە بواری (تەصەوف) دان[١].

کە لەم کورتە ژیانە ورد دەبینەوە و لەتەک ئەو زانیارییانەدا بەراوردی دەکەین کە بەهۆی گەڕان بەناو چەند دەستخەتدا دەستمان خستوون دەگەینە ئەنجامی ئەوەی کە گەلێ زانیاریی لە دەستدا نین و، سەرچاوەکانی بەردەستمان بەزۆر شتدا نەگەیشتوون و، ڕەنگە گەلێ شتیش هەر بەیەکجاریی لەناوچووبن. لەلایەکەوە گەلێ شیعری عەرەبی و فارسی ئەم مامۆستام دۆزیوەتەوە کە هێشتا لە سەرچاوەکاندا ناویان نییە و، کەس باسی نەکردوون.

جگە لەمانەیش چەند مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بەشوێن شوێنەواری شێخانی تەریقەتی نەقشبەندیدا گەڕاوە و، چەندی لەنامە و شیعرەکانیان کۆکردووەتەوە، هێشتا -وا دیارە- ئەوانەیان نەزانراون و نەبیسراون زۆرن و زۆرتریش دەردەکەون.

زیاد لەو شیعرە عەرەبی و فارسییانەی مامۆستا شێخ سەلیمی مەردۆخیی کە ئاماژەمان بۆ کردن، ناوی شاعیرانی وەک: (فیراقیی) و (عەیشیی) و (مەحرووق) و کێ و کێ لەوانەن کە لە سەرچاوەکاندا باسیان نییە و، لە ڕیزی مەنسووب و موریدەکانی شێخانی تەریقەتی نەقشبەندیشدا ناویان تۆمار نەکراوە.

جا دەبێ ئەگەر هەوڵی زیاتر بدرێت و، دەستخەتی زۆرتر بدۆزرێتەوە و، لێکۆڵینەوەی باشیان لەسەر بکرێت چی دیی دەربکەوێت؟

---

(١) بڕوانە: مشاهیر کرد، بابا مردوخ روحانی، جلد دوم، ل: ١٤٤.

**شیعرەکانی مامۆستا محەمەد سەلیم:**

مامۆستای ئەردەڵانیی یان تەختەیی یان سنەیی، جگە لەوە لە بابەتە جیاجیاکانی زانیارییدا دانراوگەلی جۆراوجۆری بەکوردی و عەرەبی و فارسی هەبووە، لە بواری ئەدەب و هۆنراوەی ئەدەبیشدا شوێنەدەستی دیارە و، شیعری جوان و ناسکی هەیە، بەتایبەتی لە بواری تەصەوفدا و، بەزۆریی بۆ شێخ عومەری بیارە -شێخی ضیائەدین-. مامۆستا مەلا عەبدولکەریم لە (یادی مەردان)[1]دا چەردەیەکی لەو شیعرانە نووسیوە و، نموونەی هەندێکیانی تۆمار کردووە، بەڵام دیارە شیعرەکانی لەوە زیاتر بوون کە لەوێدا نووسراون و، ڕەنگە گەلێکیشیان هەر بەیەکجاری سەریان تێدا چووبێت.

شیعرەکانی مامۆستا شێخ محەمەد سەلیم، ئەوانەیان ماون، شیاوی ئەوەن لایان لێ بکرێتەوە و کۆبکرێنەوە و ببووژێنرێنەوە. ئێمە لەم هەلەدا خوێنەری ئازیز و، مامۆستایان و پسپۆڕان بۆ لای سەرچاوەی شیعرەکانی ئەم مامۆستا -ئەوەی پەیمان پێ بردووە- ڕێنومایی دەکەین بەڵکو بتوانرێ ئەوەی شیاویانە بۆیان بکرێت و لە لەناوچوون بپارێزرێن.

دەستخەتی ژمارە (٢/١٤٢١٥)ی (دار العراق للمخطوطات)

پارچەیەک شیعری شێخ سەلیمی سنەیی تەختییە، لە پیاهەڵدانی شێخ محەمەد نەجمەدینی کوڕی شێخ عومەری عوثمانیی بیارەدا فەرموویەتی.

سەرەتاکەی ئاوایە:

فتنتُ بفتانَيْ فتى ذي تدلُّل
أغنّ غضيض الطرف اعين اكحل
سبي القلب مني ما سلب الحجى
بطرف خفي أو بجيد معطّل

پارچە شیعرەکە ٢٢ بەیتە، کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

ويُفضِي كما يُفْضى حياء وهيبة
فأَحسن به من كامل ومكمل!

---

(١) بڕوانە: یادی مەردان. بەرگی دووەم، ل: ٥٤١.

فـيـا رب هب لي فـيـه قلبـاً مـصـدّقـاً
(سليـمـ)ـاً من الزيـغ وسـوء التـبـدل

تمت القصايد شيخ سليم التختي السنندجي في مدح شيخ بيارة المشهور بنجم الدين دام عمره الى مديد الزمان. اللهم اغفر لي ولوالدي ولجميع المسلمين بحرمت محمد ٢٣ شهر جمادي الاول ١٣٢٤. در خدمت ملا محمد حسين باغلوجي دام عمره آمين.

نووسـەرەوەی دەسـتـخـەتـەکـە -وەک لە شـوێـنـێـکی دیدا نووسـیـویە - نـاوی سـەلامی بانەییە.

دەستخەتی ژمارە (٢/٢٣٣٢٢)ی (دار العراق للمخطوطات)

شـیـعـر و قـەسـیدە عـەرەبـیـەکـانی شـێـخ (مـصلح الدیـن) سـەعدیی شـیـرازییە بەزمـانی عـەرەبی، مـامـۆسـتـا شـێـخ سـەلـیـمی سنەیی تەخـتـیی دێڕ بەدێڕ یان بەجـیـا -بەفـارسی- تەرجەمەی کردوون. محـەمەد حسەینیی (گیزلی) لە گوندی (ساخلەنە)ی سەر بەناوچەی (انعـبـر!) لەبەر خـاتری مـامـۆسـتـا مـەلا عـەبدوڵڵای (خـرمـتـانی) سـاڵی ١٣٣٠ نووسیویەتیەوە، خەتەکەی خۆشە و سەر و بۆری بۆ شیعرە عەرەبییەکان کردووە.

دەستخەتی ژمارە (٣/٧٨٩٥)ی (دار العراق للمخطوطات)

چەند پارچەی تێدایە:

پارچەیەک شـیـعری شـێخ سـەلـیمی سنەییە لە پیاهەڵدانی ضـیـائەدین شـێخ عـومـەری بیارەدا.

سەرەتاکەی ئاوایە:

رأيت الناس في الآفـاق للشبـان عـشـاقـا
وإني عـاشق شـيـخـا اليـه كنت مـشـتـاقـا
بثعبان الهوى أمسى (سليم) القلب مسموما
ويضـحي لحظ فـتـانيـه للسـمـوم ترياقـا

پارچە شیعرەکە ٢٦ بەیتە، ئەمە کۆتاییەکەیەتی:

مليك ذو اقـتـدار يفـعل مـا شـاء بالأسـرى
فـإن أومى بلطف أورق الآمـال إيراقـا

ألا يا سـيـدي قلبي لك المُلْكُ تَصـرّفْ مـا
تشـا ء فـيـه قـد كنتُ لما ترضاه مـشـتـاقـاً

دوا بەدوای ئەمە بێ ناوی کەس پارچەیەک شیعری دی نووسراوە - دیارە ئەمیش هی شێخ سەلیمە - سەرەتاکەی ئاوایە:

أخـلـيـلـي دعـــاني يـتـــبـينُ بـي داء
أتـواري ألمُ قـــام علـيـــه الشـــهـــداء
ســـهـــرُ الـلـيـلِ وصـــرع وجنونٌ وأنـينٌ
عـــبـــرات ودمـــاءٌ، زفـــرات وبـكـا ء

ئەم پارچە (٣٠) بەیتە و کۆتاییەکەی ئاوایە:

أتمنى أنا إن كنت قـــتـــيـــلا بلـحـــاظ
له لايـخلف في حـــضـــرة ذي الجـود رجـا ء
أحـبـيـبي لم لاتجـعل لي القلب (سليمـ)ـا
ولـدى جـــودك ذوالذل وذو الـعـــزّ ســـوا ءُ

ئەم شـیـعـرانە لە دەسـتـخـەتێکدان کـۆمـەڵێ دانراو و شـیـعـری جـۆراوجـۆری تێـدایە، دەستخەتەکە بەخەتی خوالێخۆشبوو مامۆستا مەلا محەمەد ئەمینی (هەوائیی)یە. ئەم مامۆ ستا خۆی شاعیر بووە و شیعری جوانی بەزمانەکانی کوردی و فارسی و، عەرەبیی هەبوە بەداخەوە دیوانی کۆنەکراوەتەوە و، شیعرەکانی -ئەوانەیان مابن- لە پەراوێز و کۆتایی دەستخەتەکاندا بێ ناز چاوەڕوانی دەستێکی دڵسۆزن. لەم دەستخەتەیشدا پارچەیەک شیعری بەعەرەبی هەیە کە پێنچ خشتەکییە لەسەر شیعرێک کە دراوەتە پاڵ حەزرەتی ئەبوبەکرو ئەمە سەرەتاکەیەتی:

عـــبـدك الـعـــاصي اتاك يـا إلهي بالـعـــويلْ
دمـعــه الـقــاني على خـديه كـالسـيـل يـسـيلْ
حين عـــزم الســـفـــر لـلـقــبْـي والبَـــرِّ الطويل
جـــــد بـلـطـفـك يـا الـهـي من لـه زاد قـلـيـل

مامۆستای هەوائی ئەم دەستخەتەی ساڵی ١٣١٥ لە شاری ئەربیل نووسیوەتەوە.

سەرنجڕاکێش ئەوەیە لە سێ دەستخەتدا کە شیعری مامۆستا شێخ سەلیمی تەختییان تێدایە شیعرەعەرەبییەکانی شێخ سەعدیشیان تێدایە.

دەستخەتی (٥٢٠١)ی (دار العراق للمخطوطات).

دەستخەتێکی بچکۆلەیە هەمووی شیعری مامۆستا شێخ سەلیمی سنەییە. هەندێکیان ئەو شیعرانەن لە دەستخەتەکانی دیشدا هەن و بەکورتی باسمان کردوون، هەندێکیشیان جیاوازن بەم جۆرە:

پارچەی یەکەم:

شاب شعري وشابني كل داء
هل لذا الداء -سادتي- من دواء؟

ئەم پارچە ٤٣ بەیتە، کۆتاییەکەی ئاوایە:

وعليكم من السليم سلام
ذو اريجٍ مقارنٌ لدعاء

پارچەی دووەم ئەوەیە کە لە نوسخەکەی دیدا لەسەری نووسراوە لە پیاهەڵدانی شێخی ضیائەدیندا وتوویە و، سەرەتاکەی (رايت الناس في الآفاق للشبان عشاقا)ە.

پارچەی سێیەم لەسەری نووسراوە (وله هذه القصيدة الهائية ذات القافيتين): سەرەتاکەی ئاوایە:

يا فاعلاً ما شاء بالأسرى بعين خافية
يا قاتلاً بلحظ طرفه الخفي...
أوقدت في كانون صب مستهام هاويه
اذا يقال: ماهية؟ تقول: نار حامية

ئەم پارچە ٢٣ بەیتە کۆتاییەکەی ئاوایە:

يا رب آتنا لما يرضاه اذنا واعيه
واجعل لنا همته من كل شر واقيه
لاينتهي مديحه نثراً ونظماً قافيه
كيف تُحيطُ مايجا قطرة ماء واهيه

دوای ئەمەیش ئەو پارچە دێت کە سەرەتاکەی (فتنت بفتانيْ فتى ذي تدلل)ە و لەسەرمان نووسی، لێرەدا دەڵێ:

(وله هذه اللامية المخدعية)

پارچە شیعری پێنجەمی ناو ئەم دەستخەتە سەرەتاکەی ئاوایە:

كلفي يا كنف الحيّ بطرف مَـــهَـــويّ
وظَبي ظبـيــة وعـــســاء وجـيــد رشـأيّ
وغــشى القلب تبــاريج هـواه المتــمــادى
فـكـواه وشـــوى نـارُ جـــواه اللّـظوي

ئەم پارچە ٢٩ بەیتە کۆتاییەکەی ئاوایە:

نال باللّمـــحــة من أخلص خُلْقـا ملكيّـا
لـو إليـــه التـــفت الشـــيخ بشكل ملكي
دام مـــا اشـــرق نجم وبـه الســالك يهـدي
واهتـــــدى منه (سليم) برشــــاد أبديّ

پارچەی شەشەم ئەو پارچەیە کە سەرەتاکەی (اخليلي دعاني يتبين بي داء)ە کە باسیمان کرد. دوای ئەمە دوا شیعری ناو دەستخەتەکە دێت کە لەسەری نووسراوە:

(وله هذا التخميس على كلام الشيخ ضياءالدين)

زمـانـاً كنت مـشــتـاقـاً لما العـشـاق تـهـواه
شـديداً من شــراب مَنْ مِن السّـاقي تعـاطاه
ينال الحق حـــقـــاً لايرى في الكون إلا هو
أدار الكأس شـيخ الوقت، مـولى الحق أبقاه
فـــأحـــيـــانا بروح الودّ ربُّ الخلق أحـــيـــاه
انار القلب من فضل، وزكّى النفس من مجد
ووافـــانا بما أهداه ليلى في ثَرى نجـــد
فلمـا كــان مـا أهداه أحلى كلُّ مـا يجـدي
اذاق الســرَّ والرُّوح كــمــال الرّوح والوجـد

ئەم دەستـخـەتە لێـرەدا بێ ئەوەی شیـعـرەکـان تەواو بن دەبڕێـتەوە و، دیارە ناتەواوە و ناوی کەسی بەسەرەوە نییە و، نازانین کەی نووسراوەتەوە یان کێ نووسیویەتییەوە. لە

کاتی جزوبەندکردنەوەیدا لاپەڕەکانی نمیان کێشاوە و لکاون بەیەکدا و هەندێ شوێنی شیعرەکان باش ناخوێنرێنەوە.

شیعرگەلی دیکە:

لەناو ئەو پارچە پارچە و دەستخەتە ناتەواوانەدا کە وێنەم گرتوون و لای خۆم پاراستوومن، وێنەی چەند پارچەی دیکە شیعری مامۆستا محەمەد سەلیمم لایە، لێرەدا لەگەڵ دیاریکردنی سەرەتا و کۆتایی ئەو پارچە شیعرانەدا ئاماژەیان بۆ دەکەم، دەبێ لەپێشدا ئەوە نەبوێرم کە ئەم مامۆستا دوو نازناوی شیعریی بەکارهێناوە، یەکەم (سالم) و دووەم (سلیم).

ئەم پارچە شیعرانەی ئێرەیش وەک ئەوانی دی هەر لە بواری (تصوف) و پیاهەڵدانی شێخ عومەری -فەوزیی شێخی ضیائەدین-دا دانراون.

١- شیعرەکان بەفارسی و بەعەرەبین، ئەمە سەرەتای پارچەیەکیانە:

ماهیت مرا بر افق چرخ معالی

ماه فلک از نور جمالش متلالی

ئەم پارچە ٢٥ بەیتە، لە سەرەتاوە فارسییە و لە کۆتاییەوە دەبێ بەعەرەبی و ئەمە دوا بەیتیەتی:

یا (سالم) لاتخش وان کنت أثیما

مولاک رحیم یتولێ بنوال

٢- پارچەیەکی دی شیعرەکانی ئەم مامۆستا پارچەیەک شیعرە کە لەسەری نووسراوە:

«از تحریرات جناب استاذ فاضل مولانا شیخ محمد سلیم المتخلص بـ(السالم)».

ئەم پارچە (٢٧) بەیتە سەرەتاکەی ئاوایە:

بگرد لبت صف بصف دل نشیند

چه بر شاخ گلبن بالایی نشیند

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

سلیم از لباس خودی منسلب شو

که اخو دداری با یار مشکل نشیذ

٣- دوو پارچە یان دوو چوار خشتەکیی عەرەبییە، یەکەمیان لەسەری نووسراوە:

لکاتبه محمد سليم الأثيم خطاباً لشيخه ضيا ءالدين روحي فداه.

علام القلب تكويه وبالهجران تشويه؟

دووەمیان، لەسەری نووسراوە:

لحضرة الشيخ قدس سره في الجواب:

علام فكرك هجري        اذا ذكرتك ذكري

وا دیارە ئەم لاپەڕە بەخەتی مامۆستا شێخ محەمەد سەلیم خۆیەتی.

٤- پارچەیەک شیعری عەرەبییە کە (٣٠) بەیتە و لە ستایشی شێخی ضیائەدین دایە، سەرەتاکەی ئاوایە:

حبيبي ضيا ءالدين نائب أحمدا

ومرشدنا الهادي الى منهج الهدى

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

فيا ربٌ لاتسلب محبَّتَهُ وزد

بقلبٍ (سليم) فهي منجية غدا

ئەم دەستخەتە کە وێنەی لە کتێبخانە بچکۆڵەکەی خۆمدایە، جگە لە شیعرەکانی مامۆستا شێخ محەمەد سەلیم و (فەوزیی) شێخ عومەری ضیائەدین، شیعری چەند شاعیری دیکەی تێدایە، کە هەندێکیان ناسراو نین، لەوانە:

١- (باکی) کە شیوەنێکی فارسی بۆ شێخی ضیائەدین نووسیوە و دوا بەیتی ئاوایە:

دم مزن (باكى) برو بر حالت فرد گريه كن

همچو تو سرگشتهء راه و حسر در خوراست

٢- (فیراقی) لە پیاهەڵدانی شێخ ضیائەدیندا پارچەیەک شیعری گوتووە بەزمانی فارسی دوا بەیتی ئاوایە:

گر (فراقى) پر خلل باشد چه باك

يكنظر كافيست از قطب زمان

٣- شاعیرێکی دی کە باشە نووسەرەوەی دەستخەتەکە ناوی شاعیرەکەی پێش

نازناوەکەی نووسیوە. ئەم شاعیرە ناوی مامۆستا مەلا لوطفوڵڵای ئەفشاریییە و، نازناوی (وەحشی)یە.

ئەم مامۆستا سێ بەیتی بۆ شێخی ضیائەدین نووسیوە و، شێخیش بەچوار بەیت وەڵامی داوەتەوە.

٤- شاعیرێکی دیش پارچەیەک شیعری لە پیاهەڵدانی شێخی ضیائەدیندا وتووە کە دیارە نازناوی (محروق - مەحرووق)ە و دوا بەیتی پارچە شیعرەکەی ئەمەیە:

(محروقا) غم مخور مشو دلرنج

کافی است شیخ را جفا کردن

٥- شاعیرێکی دیش نازناوی (عیشی - عەیشی)یە و سێ پارچە شیعری لە ستایشی شێخی بیارە و باسی مەدرەسەدا وتووە. دوا بەیتی ئەمەیە:

(عیشی) سلطان مبادا بگزری از درگهش

تو مریض و او حکیم حاذق و داناستی

٦- دوا بەدوای ئەمەیش جارێکی دی فیراقی پارچەیەک پێنج خشتەکی درێژی لە ستایشی شێخ عومەردا نووسیوە. شیعرەکان لەسەر شێوەی (تەرجیعبەند)ن و دوا بەشیان (عمر است)ە.

٧- دوای ئەمانە و چەند پارچە شیعری فەوزیی -شێخ عومەری ضیائەدین- دوو پارچەی دی دێت یەکێکیان نازناوی تێدا نییە و، وا دیارە ئەوەکەیان شیعری (قادر) ناوێکە چونکە دوا بەیتی ئاوایە:

(قادرا) بر حضرت شیخ جلیل

کن مبارک عیش بی ساز و نواز

## محەمەد نەسیمی کوڕی محەمەد وەسیم

### ٤٤٤

زانایەکی دیمان هەیە بەناوی مـحـەمـەد نەسـیـمی کوڕی مـحـەمـەد وەسـیم، نـازانم لە مـامۆسـتـایانی بنەماڵەی مـەردۆخیی سنەییە یان نـا. لەو بنەماڵەدا دوو محـەمـەد وەسـیم هەیە -وەک لێرەدا دەیبـیـنی- هەروەها مـامـۆسـتـایان مـەلا عـەبدولکەریمی مـدرِس و بابا مـەردۆخی ڕۆحانیی باسی محـەمـەد نەسـیـمی کوڕی محەمـەد سەعـید دەکەن، بەڵام وەک گوتم باسی محەمەد نەسیمی کوڕی محەمەد وەسیم ناکەن.

لەناو دەستخەتەکاندا لە دوو جێگەدا ناوی ئەم مامۆستام دیوە:

یەکەم: وەک لە دەسـتـخەتی (٣٨٠٢ د.ع)دا هاتووە کە دەسـتـخـەتێکی گەورەیە و چەند دانراوی تێدایە، بۆ شێخ عـومـەری ضـیـائەدین فـەوزیی نووسراوەتەوە و، شـیـعـری فـەوزیی خۆیشی بەخەتی خۆی تێدایە... ئەم مـامـۆسـتـا ساڵی ١٢٧٠ کـتـێـبی (الأجوبة المرضية)ی شێخ عەبدولوەهابی شەعرانیی بۆ شێـخی ضیـائەدین نووسیـوەتەوە و، دەڵێ: «بقلم العبد الاثيم المحتاج الى رحمة ربه الكريم وشفاعة رسوله الرؤف الرحيم، العـاصي الضعـيف محـمد نسـيم بن مـحمد وسـيم» لە بەرگی یەکـەمی ئەم کـتـێبەدا هەندێـک بەدرێژیی لەسـەر ئەم دەستخەتەم نووسیوە.

دووەم: کـتـێـبی (ابن العـابدين) کـە بەژمـارە ٢٢٥٧٨ د.ع پارێزراوە. ئەم کـتـێـبەیش مامۆستا محەممەد نەسیمی کوڕی محەمەد وەسیم لەبەر نوسخە چاپەکە لەبەر خاتری شێخ محەمەد (ابو البهاء) نووسیویەتیەوە، لە کۆتاییەوە نووسیویە:

«كتبه على النسخة المطبوعة محمد نسيم بن الملا محمد وسيم... أمـتـثـالا لأمر القطب الأكرم الأمـجد الارشد، محبوب الواحد الأحد، شيخنا ووسـيلتنا الى الله الملك الصمد، أبي البها الشيخ محمد... ١٢٨٧».

ئەگەر ئەم مـامـۆسـتـا لە بنەمـاڵەی مەردۆخیی بێت دەبێ کـوڕی شـێـخ مـحـەمـەد وەسـیمی دووەم بێت.

## شێخ یوسفی سنەیی نەقشبەندیی

٤٤٥

یەکێکی دی لەو زانایانەی لە سنەوە هاتوونەتە کوردستانی ئەمدیوو شوێن و جێگەی دیاریان هەبووە، مامۆستا شێخ یوسف بووە، کە لەو مزگەوتەدا نیشتەجێ بووە کە لەلای گومرگە سووتاو و سەرشەقامدایە و پێی دەڵێن: مزگەوتی شێخ وسو -شێخ یوسف-

ئەم مامۆستا کتێبخانەیەکی باشی هەبووە و دەستخەتەکانی لە (د.ع)دا لەنگەریان گرتووە و، خەتێکی زۆر خۆشی هەبووە، بەخەتی خۆی لەسەر هەندێک لە دەستخەتەکان زانیاریی نووسیوە و، کۆتایی نووسینەکانی بە (يوسف السنندجي) هێناوە، بەڵام دوایی ئەو ناو و شۆرەتە کووژێنراوەتەوە و بەناوی (يوسف النقشبندي)ەوە نووسراون.

بەپێی ئەو دەستخەتانە ئەم مامۆستا وەک لە دەستخەتی (٥٥٥٣ د.ع)دا نووسراوە -کە (تفسير المواهب)- و (تملک)ی ئەوی بەسەرەوەیە ساڵی ١٢٧٤ لە ژیاندا بووە.

بەگوێرەی دەستخەتی (٥٥٥٠ د.ع)ش ئەحمەدی کوڕی ساڵی ١٢٦٤ و عەبدوڵڵای کوڕی ساڵی ١٢٦٦ لە دایک بوون.

(تملک)ی بەسەر دەستخەتی ٥٥٥١ و ٥٥٥٤ و چەند دەستخەتی دیکەیشەوە هەیە.

لە کۆتایی ئەم باسەدا ئەوەیش بەخوێنەری ئازیز دەڵێم: دەستخەتی ژمارە ٣٣٥٦٨ د.ع دەفتەرێکە گەلێک زانیاریی لەسەر بنەماڵەی سنەیی بەغداد تێدایە کاتی خۆی نەمپەرژا بیاننووسمەوە و بۆیشم نەگونجا وێنەی بگرم.

هەروەها دەستخەتەکانی ٢٣٥٠٨ و ٢٣٦٨٨ و ٢٣٦٦٩یش دەستخەتگەلێکن تایبەتن بەم بنەماڵەوە و، ماوەی ئەوەم نەبوو بیانبینمەوە و لەسەریان بنووسم.

## یادکردنەوەیەکی مامۆستا شێخ محەمەد وەسیمی مەردۆخیی(*)

٤٤٦

لە کوردستاندا گەلێ بنەماڵەی زانیاریی هەڵکەوتوون ماوەیەکی دوورودرێژ باوک و کوڕ و کوڕان و نەوەیان خزمەتی پانوبەرینی زانیارییان کردووە و، مەشخەڵی ڕووناککردنەوەی ڕێگە و لابردنی تاریکی نەزانیی بوون، وەک بنەماڵەکانی حەیدەریی و، جەلیی و، مەردۆخیی و، قەرەداغیی و،... چەندین بنەماڵەی دیکەی گەورە و بچووک، خزمەتەکانی بنەماڵەی تەختەیی مەردۆخیی لە هەر شوێن و کتێبخانەیەکی کوردستاندا شوێنی تایبەتییان هەبووە و، بەرێزە و لە جێگەی بەرزدا پارێزراون.

بەڵام کاتێ لەناو زانایانی ئەو بنەماڵەدا جارێکی دیکە چاو دەگێڕینەوە دەبینین مامۆستا شێخ محەمەد وەسیمی یەکەم جێگەیەکی دیار و پلەیەکی گەلێ باڵای هەیە، بەتایبەتی دەتوانین بەیەکێک لەسەر تۆپ و پێش قافڵەی خزمەتگوزارانی زمانی کوردیی دابنێین و، ئەو خزمەتانەی ئەو لە ڕێگەی کتێب و نامیلکەکانییەوە بەزمانی کوردی کردوون -لە سەردەمی خۆیدا- بێ وێنەیە و، هیچ مامۆستایەکی دیمان - ئەوەی زانرابێت - نەگەیشتووەتە پلەوپایەی ئەو. با پێکەوە ناوی ئەو کتێبانەی بخوێنینەوە کە بەزمانی کوردی دایناون:

١- هۆنراوەیەک بەگۆرانی دەربارەی ساڵی کەبیسە.

٢- هۆنراوەیەک بەزاراوەی گۆرانی لە زانیاریی بەیاندا.

٣- ژیانی پێغەمبەر - دروودی خودای لەسەر بێت - بەکوردیی.

٤- هۆنراوەیەک لە پەند و ئامۆژگاریدا بەکوردیی.

٥- هۆنراوەیەک لە زانراوی حساب و قەواعیدیدا بەکوردیی.

٦- شەمایلی پێغەمبەر - دروودی خودای لەسەر بێت - بەکوردیی.

٧- هۆنراوەیەک دەربارەی یاوەرانی بەدر بەکوردیی.

٨- هۆنراوەیەک لە ناوی سوورەتەکانی قورئاندا بەکوردیی.

---

(*) پێش ئەوەی باسی (بنەماڵەی سنەیی مەردۆخیی) بنووسم ئەم باسەم لە شێوەی وتارێکدا ئامادە کردبوو، ئێستەیش وەک خۆی بڵاوی دەکەمەوە.

٩- هۆنراوەیەک لە تەجویدی قورئاندا بەگۆرانی.

١٠- هۆنراوەیەک لە نەحوو صەرفدا بەکوردیی.

ئەمە تا ئێرە ناوی ئەو کتێبانەن کە مامۆستای ڕۆحانیی - خودا لێی خۆش بێت - لە کتێبی (خاندان مردوخ) وەری گرتوون[1]. بەڵام وا دیارە ئەمانەیش تەواوی کتێب و بەرهەمە کوردییەکانی ئەم مامۆستا نین و لەوانەیە گەلێ لەمەیش زیاتری هەبووبێت و، ڕەنگیشە هێشتا مابن و دوورەدەست بن و، لەوانەیشە زۆریان تێدا چووبن.

وەک دەڵێن: «مشتێ نموونەی خەروارێکە» و، ئەم مامۆستا مەزنە کە لەو سەردەمە کۆنەدا - بەپێی تەمەنی ئەدەبی کوردی - (ساڵی ١١١٨ک لە دایک بووە و، ١١٧١ک کۆچی دوایی کردووە) کە دەکەوێتە پێش نالی و گەلێ لە شاعیرانی کورد گۆمانەوە، خۆی و بەرهەمەکانی جێگەی ڕێز و بایەخێکی تایبەتین، کەچی -بەداخەوە- کە سەرنجی کتێبخانەی کوردیی دەدەین و بۆ بەرهەمەکانی ئەم مامۆستا دەگەڕێین، ئەنجامێکی دڵخۆشکەرمان دەست ناکەوێت و، نابینین کەسێک لای بەخێر و ڕێزی لەم مامۆستا کردبێتەوە و، بەرهەمەکانی، ئەگەر مابن، لە کون و قوشبنی لەبیرچووندا مۆتەکەی لەناوچوون و لەناوبردن هەڕەشەیان لێ دەکات.

لە ماوەی گەڕانم بەناو دەستخەتەکانی (دار العراق للمخطوطات)دا ڕێکەم لە چەند دانراوێکی عەرەبی و کوردی و فارسی ئەم مامۆستا مەزنە کەوتووە و، دەمەوێ لێرەدا نموونەیەک لە هۆنراوە کوردییەکانی بکەم بەدیاریی دەستم و یادێکی بکەمەوە و، ناوی وەبیری خوێندەواران و دڵسۆزانی ئەدەب و کەلەپووری کوردیی بێنمەوە، بەڵکو گیانی لێکۆڵینەوەی کارامە و لێوەشاوەکان ببزوێ و کارێک بۆ خۆی و بەرهەمە نایاب و بەنرخەکانی بکەن.

(١) بڕوانە: مشاهیر کرد، بەرگی یەکەم، ل: ٢٣٧.

## کورتەیەک لە ژیانی مامۆستا شێخ محەمەد وەسیم:

مامۆستا شێخ محەمەد وەسیم کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مستەفای تەختەیی مەردۆخییە. ئەم مامۆستا ساڵی ١١١٨ک لە گوندی تەختە لە دایک بووە، سەرەتای خوێندنی لە گوندی تەختە و دەوروبەری بەسەربردووە، دوایی بۆ خوێندن موسڵ و بەغدا گەڕاوە و، دوای تەواوکردنی خوێندن گەڕاوەتەوە ناوچەی خۆی و لەوێ خەریکی دەرسوتنەوە بووە. ماوەیەک دوای ئەوە ڕووی کردووەتە کوردستانی عێراق و، لە قەڵاچوالانی پایتەختی ئیمارەتی بابانەکان گیرساوەتەوە و، دوایی بە (عەللامەی قەڵاچوالان) ناسراوە.

ئەم مامۆستا -وەک گوتمان- لە ژیانیدا جگە لەوەی بەدەرسوتنەوەی فەقێ و پێگەیاندنی مەلایانەوە خەریک بووە، زۆر کتێبی جۆراوجۆریشی داناوە. مامۆستا ڕۆحانیی ناوی (٢٢) لە دانراوەکانی نووسیوە. وا دیار نییە هیچ لە دانراوەکانی چاپ بووبن.

ئەم مامۆستا بەڕێزە دوای تەمەنێکی زۆری پیرۆز کە لە خزمەتی ئایین و ڕۆشنبیریدا بەسەری بردووە ساڵی ١١٧١ک بەنەخۆشیی چاوەقووڵە لە قەڵاچوالان کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێ بەخاک سپێرراوە[١]. لەم هەلەدا وەک بیرخستنەوەیەک و یادکردنەوەیەک لەم مامۆستا بەڕێزە باسی ئەو دانراوانەی دەکەین کە لە (د.ع)دا لەنگەریان گرتووە و، نوسخەیان لەوێ دەست دەکەوێت و، ئەوەندەی بگونجێت دەقەکانیان - دوای ئەوەی دەیانخەینە سەر ڕێنووسی باوی کوردی - بڵاودەکەینەوە.

١- بیان اسامی علوم الآخرین از گفتهء شیخ محمد وسیم قدس سره

ئالیات، لوغەت، صەرف، ئیشتیقاق
نەحو بەلاغەت عیلمی پێنجەمین
ئەقسامش مەعانی، بەیان و، بەدیع
تەواریخ هەشتەم، ئەییام نۆهەمین
ئەمثال، (أنساب القبائل)، عەرووض
حیوار سێزدەهەم، ئینشا چاردەمین

(١) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو. ل: ٢٣٨.

لەفظێـو عـەرەبی (حـقـايق اللفظ)
مـەوضـووع و غـايات هەن ئینۆ گـردین
بەحـەیشـیـاتی مـەبانی جـیـا
(فـاعـلمـهـا واحـمـد رب العـالمین)

٢- بیان علوم شرعیه از علوم آخرین:

ئەمـجـار بزانە عـیلمـان شـەرعـیـان
کـەلام وەریـنان و دمـایـیـان
تەفـسـیـر و، تەئویل، ڕەبط و، قـیـرائەت
تەجوید و،وقووف،خەط،(خواص الآیات)
عـیلمـو حەدیثی، ئوصـوولـیش، تەعـبـیر
فـیـقـه و، ئوصـوولش، خـیلاف نەیەتە ویر
صـۆفـیـەی قـەدیم، صـۆفـیـەی جـەدید
(طب الـنـفـوس)ن نۆزدەهەم بۆت دید

٣- بیان علوم اولین که فلسفشان گویند:

عـیلمی فـەلسـەفی هەنی چل و نۆ
[اذین عـرض ببـا أو خـدمت بۆ!]

بیان نظریات:

نەظەریی هەفت یوقـاطیغور باس یەکەم
ئیـسـاغـۆجیی دوو، بورهانەن سێـیـەم
خـیطابەت چارەم، جـەدەل پەنجـەمین
شیـعرەن شەشەمین، سەفسەطە هەفتەم

بیان الهیات:

ئیـلاهیـیـاتی مـەبدەئی ئەووەل
یەکـەم عـیللەت، مـەعلوولەن دووەم
مـەوجـوودات کـائینات سـێـمین
مـوجـەڕەداتـان بـواچە چـارەم

أصول رياضية:

ئەصلێــو رياضی هەیئــەت، [ اکــرم]
ئەبعــاد و ئەجــرام، هەندەســە چارەم
مـەسـاحـە، جەبر و، مـوقـابەلە شـەش
ضەرب و قـیسمەت و مۆسیقا هەشتەم

فروع رياضي:

فـــــــەرعـی ریـاضـی هـەنـی یـازدە:
مـەجەسطیی، رەصـەد، زیج تەقـویم چارەم
نوجووم، ئوسطورلاب، روخامات، تەکسیر
ئەعداد، شـەعـبەدە، جەر و ئەثقال یازدەم

اسامي طبيعيات:

طەبیــعــیــاتی ئەمــجــار هەنی شـــەش
مـــــورەککەبات و، (اســـمـــاء العــالم)
عەقل و، نەفس، عـونصـور، (کائنات الجو)
(عـلم المواليـــــد) بـواچە شـــــەشـــــەم

فروع الحكمة:

(فــــروعـــيـــات الحكمـــــه) هەنی نو
(کلیـات الطب) جــوزئیـیـات دووەم
قـەیافـە، کـیـمـیـا، سـیـمـیـا
مەناظیر و، سیحر، نەیرەنجات هەشتەم
(طلســمــات) و (دعـــوه الكواكب)
ئەمــجــار بزانە عــیلمــیـان پەنجــەم

علوم حكمت عملي:

تەهذیب و، تەدبیر، سیاسەت ئەمجار
(حکمـــــه الاشـــراق) چهل و نۆهەم

نەظەریی هەفت، ئیـــــلاهی چوار
ئەصلێـــو ریاضی هەشت مـــەداد یار
فـــەرعـــێـــو ریاضی یازدەنی ئەمـــجـــار
طەبیـعـیـیـاتی شـەش هەنی ئاشکار
(فـــروعـــیـــات الحکمـــە) هەنی نۆ
ئەی عـــیلمی یەرێ خـــاص بزانە تۆ
(حکمـــە الاشـــراق) چهل و نۆهەم
(عـــلم الاوائـــل، والـــلـــە یـعـــلـــم)
چاردە و نۆزدە سی و سێ ئـاخـــرین
هەشتـــادو دوین جـەمـعـێـو هەر دوین

بیان گفته علوم فلسفي درچند مسئلة باعلوم اسلامية مخالفند:

جـەمـعـێـوە کـەثیـر (عـالم الاسـلام)
جـەهدشـان کـەردەن جـەی وەرتەر تەمـام
ویست ویەک فێشـتەر هەنیچ نەدینشان
مـوختـەلیـفی با فـەلسـەفـە و ئیسلام
تەدقـیـقـمـان مکەرد ئێـمـە و تاکو چل
مـــوخـــالیـــفـــەنی (والله العـــلام)
چاچلە شـــازدە کـــوفـــرەنی صـــەریح
پەنج هەم(بالتزام) بیست و یەک تەمام
نۆزدە بیـــدعـــەتی کـــافـــری تەمـــام
باقی حـەقـقـەن حـەق (باقي والسلام)
ئیـــجـــمـــالت زانا تـەفـــصـــیل بزانە
جـەی مـەسـئـەلانە غـافـڵ مـەمـانە
ئەوەڵ ئا شـــازدە کـــوفـــرەن بشـــمـــارە
تا نەگـنی جـــەی را (ئەدرە کـــە نارە)

بيان آنچه كفراست از مسائل فلسفي وتهافتات ايشان:

(انكار النبي) بواچە یەکەم
دووەم تەهافوت (قدم العالم)
ئینکار و حەشری جیسمانیی سێیەم
(إنكار العلم الجزئيات ) چارەم
(نسبة الايجاد ئوقياس) پەنجەم
(إلهية الكواكب) شەشەم
(دعوة الكواكب، تسبيح قرانين)
تیمثال و تەئثیر (بالايجاد) هەفتەم
(استحالة الخرق والتيام)
غەیر و غەزالیی شمارۆ هەشتەم
(استحالة التكوير) نۆهەمین
نەفس بەشەریی قەدیمەن دەهەم
(وجوب التركيب من الهيولى
والصور) ئەگەر بواچا یازدەم
پێغەمەری باش یەرێ خواصیی
وەرنە نمەشیۆ هەنی دوازدەم
(القاء قولي) موتەخەییلێ
ماچا قورئانەن ئینە سێزدەهەم
(استحالة الحركة والسكون)
ئەو مەلائیکان هەنی چاردەهەم
ئەجیننە نەفس بەشەریی بییەن
جە بەدەن بەرشین ئانا پازدەهەم
وەحی و ئیلهام مەنام خەیاڵەن
مواچا ئینا بین بەشازدەهەم
ئەی شازدە کوفری صەریحەن ئیللا

کــە مــەنام خــەیاڵەن (والله یعلم)
پەنج هەنیچ کوفرین (بالتزام) و ضیمن
شــازدە تا ببــۆ بەویست و یەکــەم
(زمــان مــقــدار الحــرکــة) یەکــەم
صــانیــعیی و خودای مــەجازەن دووەم
(نفس الســمــاوات) مــاچا مــزانۆ
(حــال الکائنا) بشــمــارە سێــیــەم
(کــون الطبــایع) عــیللەی فــاعــیلە
پــەی وجــــــوودیــان بــواچە چــارەم
(مــتــرکب الجــسم منِ الهــیــولي
والصــور) کــوفــرەن (بالتــزام) پەنجــەم
نــوزدە هــیچ هەنــی بیــدعـــەت بزانە
جــەی مــەسئــەلانە غــافڵ مــەمــانە
فــاعــیل مــوختــار نییــەن حــەق یەکەم
صــیــفــەتیش زائیــد نیــیــەنی دووەم
(واجب الوجــود) مــوجــەڕەدەن سێ
مــەحــاڵەن کــەثیــر (عن واحــد) چارەم
عــوقــوولی مــوئــەثــیــری هەنی پەنج
(تأثیــر القــوی کــواکب) شــەشــەم
فەلەک ذی نەفسەن، مونطەبیع هەشتەم
(کــون الســمــاوات أحــیــاء ناطق)
کەون و تەشــەببوە (غــرض الافــلاك)
(فــي الحــــرکـــــات) بــواچە نۆهــەم
(صــحــة الاحکام) دە عــەقڵ عــاشیــر
عــیللەی صــوەریی عــونصــوران دەهەم
یازدەمــینی واجب (اسنــاد الحــوادث)

(کلهـــــا الی اللـه) واچه دوازدەم
نەفسی ناطیقەی بەشەری موجەڕڕەد
مــــواچانی هەن (انا) ســێـــزدەهەم
نەفس ناطیـــقـــه جیـــسم نوورانەن
نیـــیـــەن مـــواچا هەنی چاردەهەم
تەعەییون وجودین نە ئیعتیباری
جـــه تەهافـــوتان بواچه پازدەم
عەرەض بەعەرەض قائیمەن ماچا
توچی بواچه ئینات شـــازدەهەم
مەحاڵەن مەکان خەلای مەوهووم بۆ
هەم بوعدی مەفرووض ئینه هەڤدەهەم
مەحاڵەن کە جیسم مورەککەب ببۆ
جـه جەواهیری فـــەرده هەژدەهەم
(جـــوازه... عـــقلي علی الله!)
نۆزدەهەم بیـــدعـــەت (والله یعلم)

تمام شد اسامی علوم الأولین والآخرین در سنه ء هزار و صد وهشتادو چهار.

أخلاق از گفتهء شیخ محمد وسیم:
حیکمەت و عیففەت شەجاعەت و عەدل
(أصل الاخـــلاق)ن یەک تا وە چەهارەم
فـــەرعـــیـــشـــان هەنی فـــره بشنەوه
جـــه یەک تاکـــو چل (والله یعلم)
ئەووەل عیبادەت، ئیخلاصەن دووەم
سـێـیـەمین دوعـا ، شـوکـرەن چەهارەم
پەنجەمین صەبرەن، شەشەم هەن رەضا
هەفتەم تەوەکول، حەیا هەن هەشتەم
نۆهەمین عـیـفـەت، دەهەمین ئەدەب
عـــالی هیـــمـــمـەتی واچه یازدەهەم

دوازدەمین عەزمەن، سێزدەم جیدد و جەهد
چاردەهەم ثەبات، عـــــەدالەت پازدەم
شازدەهەم عەفوەن، عیلمەن هەڤدەهەم
هەژدەم خولق و ریفق، شەفەقەت نۆزدەم
خەیرات مەبەرڕات بیستەمین ئەمجار
سەخا هەم ئیحسان هەن بیست و یەکەم
بیـــست و دووەمین تەواضـــوع نیـــاز
ئەمجار ئەمانەت هەن بیست و سێیەم
وەفـا بەوەعـدە عـەهدەن بیـست و چار
صیدق و ئادابش هەن بیست و پەنجەم
بیست و شەشەمین (انجاح الحاجات)
واچە (تأنّي) هەن بیـــست و هەفتــەم
تەیەقـقـوظ و وەهم ئاگـاهی سی و سە
مـــیـــۆ فـــەراســـەت سی و چەهارەم
سی و پەنجەمین (كـتـمـان الاســرار)
فورصەت غەنیمەت هەن سی و شەشەم
ریعایەت کەردیو حەقان سی و هەفتەم
(صحبة الاخيار) هەن سی و هەشتەم
سی و نۆهەمین هەن (دفع الاشـــرار)
(ترتیب! الخـــدم، حـــشم) چهلەم
تمم بالخير.

ایضاً أخلاق از گفتهء شیخ محمد وسیم -قدس سرة-:
حیکمەت و شەجاعەت، عیففەت و عەدالەت
یەکـــەم و، دووەم، ســـێـــیـــەم و، چەهارەم
ئەصلێــو خـــولوق و خـــاصـــان ئینەنی
گـــردین فـــەرعـــانشـــان خـــاص بزانە هەم

انواع حکمت هفت است:

ئەنواعێو حیکمەتی هەنی هەفتەنی
یەکەم زەکا دووەمین هەن (سرعة الفهم)
سێیەم صەفای ذیهن ئەنجار بزانە
چەهارەمین هەن (سهولة التعلم)
حوسنی تەعەققول پەنجەم، پەس شەشەم
تەخەففوض، ئەمجار تەذەککور هەفتەم

انواع شجاعت یازدة است:

ئەنواع شەجاعەتی هەنی یازدە
کیبر نەفس یەکەم، نەجدەت هەن دووەم
سێیەم (علو الهمة) چەهارەم ثەبات
پەنجەمین حیلمەن، سوکوونەن شەشەم
هەفتەم شەهامەت، تەحەممول هەشتەم
نۆهەم تەواضوع، حەمییەت دەهەم
یازدەهەم ریققەت، شەجاعەت تەمام
نەوعیش ئینەنێ (والله یعلم)

انواع عفت دوازده اند:

ئەنواعێو عیففەتی هەنی دوازدە
ئەووەڵین حەیا، پەس ریفقەن دووەم
سێیەم حوسن و هەدی، موسالەمە چار
پەنجەمین [دەعە!]، پەس صەبرەن شەشەم
هەفتەم قەناعەت، هەشتەمین ویقار
نۆهەمین وەرع، ئینتیظام دەهەم
یازدەم خەیرییەت، ئاخر و گردین
سەخا بواچە گەر هەن دوازدەم

انواع عدالت دوازدة اند:

ئەنواعــێــو عــەدالەتی هەنی دوازدە
هەنی بواچە صـــەداقــەت یەکـــەم
دومــینـی ئولفـەت، سـێـیـەمین وەفـا
چەهارەم شەفەقەت، (بعده) پەنجەم:
صیلێو ڕەحمییەن، موکافات شەشەم
(حسن الشراکة) هەفتەم و، هەشتەم:
هەن (حسـن القضـا ) (بعـده) نۆهەم:
تەوەددود، تەسلیم ئەمجار هەن دەهەم
یازدەم تەوەکول، عیبأدەت دوازدەمین
جـەمـعــەن چل و دوو (والله یعلم)

تمام شد أخلاقها از گفتهء مرحوم جنت مکان شیخ محمد وسیم تختوی (سنه ١١٨٤).

## مەنظوومەی (اسطرلاب)

دانراوی مامۆستا شێخ محەمەد وەسیمی یەکەم:

سەرەتاکەی:

قبل الصلوات والتحـیات
بر سید خلق وخیر سادات
الحـــمـــد لذاته تعــالی
والـشـکـر لأنـعـم تـوالـي
کـــزدَرگـــه بندکـــان والا
اعلی شـــان عـــمـیم الآلا
شد امر که بنده ابن احمد
بر اسـطرلاب شـــرح بندد

ئەم نوسـخـە ناتەواوە، بەگوێرەی دەسـتـخـەتی پێـشـووی دەبێ مـحـەمـەد ناوێک سـاڵی ١٢٢٢ نووسیبێتیەوە.

دەستخەتی ١٦٩٩٢یش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە، ئەم نوسخە - هەرچەندە ئەمیش ناتەواوە - لە نوسخەی پێشوو زیاترە و بەخەتێکی ورد نووسراوەتەوە، بەڵام بەداخەوە کاتێ جزوبەند کراوەتەوە تەڕبووە و لاپەڕەکان نووساون بەیەکەوە و گەلێکی باش ناخوێنرێتەوە.

ئەم نوسخە ١٤ لاپەڕەیە، لاپەڕەی ٤٦ بەیت و زیاتر و کەمتری تێدایە.

دەستخەتی ٣٢٧٠٩ نوسخەیەکی تەواوی ئەم کتێبەیە بەخەتێکی وردی جوان ساڵی ١١٨٤ نووسراوەتەوە. ناوی نووسەرەوەی پێوە نییە، لە دەستخەتەکانی کتێبخانەی (سنوی)یە کە پێشکەش بە(د.ع)یان کردووە. مۆری سنەویی زادە عەبدولفەتاحی پێوەیە.

دەستخەتی ٢/١٧٦٦٠ د.ع نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە. هەروەها دەستخەتی ٢/٥٨٢١ نوسخەیەکی دیکەیەتی.

### ٢٢١٠٢ سنن الصلاه للشيخ محمد وسيم السنندجي:

ئەم دەستخەتە - لە تەک چەند دانراوی دیدا - لە سەرەتاوە کتێبی (سنن الصلاة)ی ماموّستا شێخ محەمەد وەسیمی سنەیی تێدایە کە سەرەتاکەی ئاوایە:

«وبعد: يقول العبد الأثيم ابن احمد محمد الوسيم، وهو تلميذ شيخه ابي يحيى زكريا التختوي، تلميذ شيخه المعمر محمد الدمشقي الكاملي، وهو تلميذ شيخه احمد بن محمد بن محمد الحجر الهيتمي الانصاري المكى رحمه الله تعالى، وهو الشيخ الامام بقية مجتهدي الانام المعول عليه في الاعصار والايام، عمدة متعقبي كلام امام المذهب وشيخه الهمام، ابي زكريا يحيى النواوي الشيخ شيخ الاسلام، رضى الله عنه: إن شيخ شيخ شيخه المذكور -رحمه الله- نقل في شرحه للمقدمة أن من صلى أربع ركعات ينبغي أن يراعي من السنن نحو ستمائة ما بين أبعاض وهيئات، فلاحظناها عدا، وسوّدنا منها سردا، فأنافت على ما قال، وبقي بعد للاستقصاء مجال. فلما رأينا مقتصراً باعثاً لسهولة ضبطها، المعين لمراعاتها بيضناها هدية للطالبين الراغبين، جعله الله تعالى وسيلة اهتداء الطالبين . إن شاء الله رب العالمين، ولما كانت صلاة المنفرد أتم لكونها باختياره مقيماً... اخترنا بيان سننها، والمراد السنن الداخلة من أول الإحرام، الى آخر السلام، فنسأل الله التوفيق والعصام، وجعله لوجه ذي الجلال والإكرام. ونقول من سنن الصلاة...»

نموونە لە دانراوێکی دیکەی شێخ محەمەد وەسیمی سنەیی

ئەم پێشەکییەم بۆ ئەوە نووسی کە بڵێم: هەر لە (د.ع)دا دەستخەتی ژمارە (٨٨٨٩)م دی کە هەمان پێشەکی بێ جیاوازی تێدایە، بەڵام دوای تەواوبوونی ئەم پێشەکییە دەست دەکات بەشەرحێکی درێژی ئەم کتێبە و ناوی کەسیش نابات و دیار نییە شەرحەکە هی دانەر شێخ محەمەد وەسیمە یان نا؟ساڵی ١٢٥٠ شێخ محەمەدی بەرزنجیی نووسیویەتیەوە.

هەر دوا بەدوای ئەمەیش تەرجەمەی فارسیی هەمان کتێب نووسراوە، لە کۆتاییەوە دەڵێ: سوونەتەکان -تێکڕا- دەگەنە ١٦٨٦ سوننەت. خاوەنی تەرجەمەکەیش نەزانراوە، تەنها ئەوەندە لە سەرەتا و کۆتایی تەرجەمەکەوە -لەلاوە- نووسراوە (شیخ محمد امین ام استاد کوی). دەستخەتەکە ساڵی ١٢٥٠-١٢٥٢ بەخەتی محەمەدی بەرزنجی نووسراوەتەوە.

دانراوی یەکەم - کورتە عەرەبییەکە - زنجیرەی سوننەتەکانی لە سەر و خواری سوننەتەکانەوە و - لە پەراوێزیشەوە - بەژمارە و بەپیتی هیجا دیاریی کردووە. ئەم نوسخە دەستێکی چەپەڵ دوا پەڕەی - ڕەنگە لەبەر شاردنەوەی دزیی بێ - لێ کردووەتەوە، بەوەیش گەلێ شتی لە کیس داوین.

دەستخەتی ژمارە ٢٢٣٤ش نوسخەیەکی دیکەی ئەم کتێبەیە -مەتنەکە- بەڵام تەنها پەڕەی یەکەمی؛ چونکە بازرگانیکەر بەدەستخەتەوە ئەو پەڕەی لکاندووە بەبەشێکی کتێبێکی ناتەواوەوە، کە کتێبی (عباب)ە بۆ ئەوەی کتێبێک دروست بکات!!

## ٣/١٦٧٩٦ محەمەد وەسیمی یەکەم

لەم دەستخەتەدا نوسخەیەکی دی هۆنراوەی (فيء الزوال)ی شێخ محەمەد وەسیمی یەکەم هەیە.

ئەم دەستخەتە ساڵی ١١٨٤ محەمەد ناوێک لە شارۆچکەی مەرگە نووسیویەتیەوە.

سەیر ئەوەیە جیاوازیی نێوان ئەم دوو نوسخە وەک عاسمان و ڕێسمانە و، تەنها مانا و ناوەرۆکەکەیان وەک یەک وایە، ئیتر جیاوازییەکی زۆر لە قافیە و ڕستە و وشەدا هەیە.

١٠٥٥٤ د.ع

دانراوی لەناو کۆمەڵە دەستخەتی سەرەوەدا لە لاپەڕەیەکدا نووسراوە:

من کـلام شـيخ محـمـد وسـيم:
به (بسم الله حـمد وصلاة وسـلام)
بۆ بزانه وەقت بەسـايەی ئەقـدام
ئەصـەح ئينەنەک (صلاة الوسطى)
عـەصـرەن بزانه ئەرهەنی ئوسـتـا
ئەووەڵ و وەقـتـەش ئانەنەک بـبـۆ
سـايەی شـەخـصی ویش چون (بمدرۆ)
جـه ياگـەی هەمـوار غـەير و ئانيـه
وەقت ئيـسـتـيـوای ممانۆ سـيـه
قـامـەت پای بەپای ویش هەفـتـەن
ئەغلـەب بزانه خاص تەمام (مـفـتـەن)
ئەمما ئيـسـتـيـوا تەفـاوتش هەن
جـه گـرد مـانگيـوه ڕەنگی هەنيـەن
سه مـانگەی هامين دوو قەدەم چار شەش
پايز هەشت يازده دوازده بێ غـەش
دوازده يازده هەشت پەی زمـسـتـان
شـەش و چار و دوو بەهارەن يەکسـان
جـه (فيء الزوال) چون بـبـۆ زياد
قـەدر نيـمـەڕۆن بێ کـەم و زياد
چون بـبـۆ زياد بەقـەدەر قـامـەت
بوانه پەی عـەصـر ئەذان و قـامـەت
يەک دوو سـه پەنج هەفت ده قـەدەم
(فيء الزوال)ەن مـەولای موحـتـەرەم

دەستـخەتی ٤٠٢٤١/٣/ د.ع ش نوسخـەيەکی ديکەی ئەم دانراوەی مامۆستا شێخ محەمەد وەسيمی سنەييه، له کۆتاييەوە هەندێک جياوازيی لەگەڵ ئەم دەقەدا هەيه، وەک ئەم دوو بەيتەی دوايی:

ئیـــقلیم و ئیـــقلیم تەفـــاوتیّش هەن
بەعـــەرض، ئەمما طوول تەفـــاوت نیـــەن
بیەن...
... مـەشـریق تا مـەغـریب (واللە اعلم)

ئەم نوسخە بەخەتی عەبدوڕەحیمی کوڕی مەلا عەبدوللەتیفی جوانڕۆییە، ساڵی ١١٨٥ نووسیویەتیەوە.

لە دەسـتـخـەتی ژمـارە (٢٢٢٥٣ د.ع)دا کـە کـەشکۆڵی ئەحـمـەدی براڵەیە سێ بەیت شیعری فارسی مامۆستا شێخ محەمەد وەسیم هەیە دوور نییە کە ئەم بەیتانە دوا شیعر و دوا نووسراوی ئەم مامۆستا بەڕێزە بن، بۆیە لێرەدا وەک خۆیان تۆماریان دەکەم:

حضرة مرحوم مغفور مبرور شیخ محمد وسیم طاب ثراه آیام طاعون این سە بیت را وصیت فرمودە. (امرا فرمودە!):

دراین دودم ار مـرگ حـضـر داشت روا نیـست
آندم کە اجل راست قضا و آنکە کە قضا نیست
گـــر هـست آجل هیچ حـــذر ســـود ندارد
ور نیـست اجل هیچ در وفـوت و فنا نیـست
(لایسـتـقـدم ویسـتـأخـر) قـرآن چو بخـوانی
دانی کـە دراین یک سر مـو کذب خطا نیـست
تمت شـد از دست حـقـیـر سـراپا تقـصـیـر
احـمـد بن مـحـمـد برالە در سنەء ١٢٤٥

## محەمەد وەسیمی دووەم

### ٤٤٧

دەربارەی ئەم مامۆستایش لە دەستخەتەکاندا شتێکی زۆرم لە دانراو و بەرهەمەکانی نەدۆزییەوە، دیارە بەختیان یار نەبووە بگەنە جێگەیەکی دیار و پارێزراو، ئەگەر مابن و لە شوێنی باشدا بن لەوانەیە لەمەولا دەربکەون.

ئەوەی لە شوێنەواری باشدا بن لەوانەیە لەمەولا دەربکەون.

ئەوەی لە شوێنەواری ئەم مامۆستا دیومە دوو سێ دەستخەتە:

یەکەمیان: حاشیەی محەمەد وەسیمە بەسەر شەرحی تەهذیبی شێخ عەبدولقادری موهاجیری برایەوە، ئەم کتێبە بەژمارە ٣٦٥٠٦ د.ع پارێزراوە و، ساڵی ١٣٠٠ نووسراوەتەوە، دوور نییە ئەمە دەستخەتی دانەر بێت.

دووەم: نوسخەیەکی دیکەی هەمان حاشیە بەژمارە ٢١٣٠٧ د.ع پارێزرواوە و، ساڵی ١٣٠٠ محەمەدی وەسانیی و کاک ئەمینی برای ساڵی ١٣١٥ لە شاری سلێمانیی نووسیویانەتەوە.

سێیەم: دەستخەتی ژمارە (٣٧١٤ د.ع)ە کە بریتییە لە کتێبی (الحكمة الادريسية والطريقة التدريسية) مامۆستا محەمەد وەسیم ساڵی ١٢٧٣ نووسیویەتیەوە.

لەم هەلەدا دەقی پێشەکی نوسخەی ٣٦٥٠٦ی حاشیەکەی مامۆستا شێخ محەمەد وەسیم لێرەدا وەک خۆی دەنووسم؛ چونکە دەقێکی بەبایەخ و پڕ زانیارییە بۆ ئێرە و ژیانی ئەم مامۆستایانە.

دەقەکەیش دوای (الحمد و صلاة وسلام) ئاوا دەستپێدەکات:

«وبعد: فيقول من الى الله يبتهل ويلتجي، محمد الوسيم بن المرحوم الشيخ محمد سعيد الفاضل التختي السنندجي: إن قسم الكلام من كتاب التهذيب الذي صنفه العلامة الثاني المحقق التفتازاني، لما كان واقعاً على أحسن نظم وأبدع ترتيب، بحيث يكاد أن يمتنع الاتيان بمثله كما لايخفى على أهله كان المحصّلون المترددون الى والدنا الماجد راغبين في تحصيله عنده، ومنهم الاخ الاكبر الماهر الشيخ عبدالقادر، وكان في أثناء تحصيله يراجع شرح المقاصد ويأخذ منه معاني دقيقة يكتبها حواشي على هذا المتين بلفظ موجز مبين، وبعد

اتمام تحصيله جعلها شرحاً له، وهو كما ترى شرح بديع يشهد بحسنه اشتهاره في أكثر الامصار، وتداوله على أيدي أولي الأبصار.

وبعدما توفى الوالد الماجد حشره الله في زمرة العلماء الراسخين، وجلس الأخ مكانه يشيّد قواعد التدريس وبنيانه، راجع الشرح مرة ثانية، فوقع له في بعض عباراته جرح وتعديل، ولبعض مواضعه تبديل وتسهيل، وإني طالما كنت شايقاً الى أن أكتب على الشرح حواشي تبين مواضعه المشكلة، وتحل مسائله المعضلة، لكن كلما عطفت اليه العنان عاقتني حادثة من حوادث الزمان، فلم تزل الحوادث تتزايد، والدهر يكايد، الى أن تموجت أمواج المحن والفتن، بحيث صارت سبباً بجلاء الأخ الأستاذ من الوطن، فهاجر الى الله ورسوله راجياً قبول مسؤوله، ولما بلغ قصبة سليمانية استبشر بقدومه أهلها وجبالها وسهلها، فأخبروا بذلك سلطان سلاطين الاسلام، فأدرّ عليه شهرية تكافي أمره مع مزيد البر والانعام، ادام الله شوكته الى قيام الساعة وساعة القيام.

ثم إني بقيت منفرطاً من الأحبة والاخوان، مضطرب البال بالبلبال والأحزان، مشتكياً شكاية المطروح في الطريق... المفترق من الرفيق مترنما في شأنه وشأني بـ:

وطالما كنا كغصني بان لكن نما وزدت في النقصان

ولم أزل أترنّم بهذا المقال الى أن أنشدني الدهر بلسان الحال فقال:

بعد ما تفرقوا وخرجوا هذا جزاء أمرئ أقرانه درجوا.

ثم وهكذا بقي التعليق في حيز التسويف والتعويق، الى أن أشار اليّ والي الولاية، منبع الفهم والدراية، الزكي المروج للعلماء الألمعي، المشتاق الى صحبة الأذكياء أدامه الله وأحسن حاله، وأحسن من حاله مآله، بالجلوس للتدريس والافادة حسبما كان منّا قانوناً وعادة، واشتغل إذ ذاك أجل ابنيّ الذين هما قرّة عينيّ وفقهما الله على العلم والعمل حسبما يحب ويرضى، بتحصيل الشرح، فأعادني بالترغيب والتشويق على ما كنت عليه من ارادة كتابة ذلك التعليق، لكن كنت مترددا، فتارة يختلج في صدري أن أعلق الحواشي من غير مراجعة كتاب، معتمداً في ذلك على مجرد ما يسمح به نظري الفاتر وذهني القاصر، كما هو عادتي في أكثر ما وقع مني من التدوين، وتارة يخطر ببالي أن أراجع

الكتب في ذلك تعديلاً وجرحاً، وأتكلم فيها حرفاً حرفاً، ولما رأيت أن الأول يفضي الى الخروج من سبيل الجمهور، والثاني الى الإطالة وانقباض الصدور... اخترت في ذلك أن أقتصر على المحاكمة بين هذا الشرح وشرح المقاصد، فانه كما أشرنا اليه أصله ومنه استخراجه وفصله، فشرعت فيما اردت أرجح هذا تارة وذاك أخرى، وتارة أرى أن رأيا ثالثاً أليق وأحرى، كيف ولقد أجاد في المقال من قال: فهُمْ رجال ونحن رجال، فجاء بحمدالله وحسن توفيقه تعليقاً يليق أن تعلقه الحور على النحور، ودرة يتيمة خلت عنها البحور، ودقيقة كريمة خفيت عن الصدور بعد الصدور، ثم الى الله تصير الأمور، ووقع الفراغ سنة ألف ومائتين وثلاثة وسبعين من الهجرة، والحمدلله رب العالمين.»

ئەم چەند دێڕەی خوارەوەیشم لە پەنای دوو پەڕە کاغەزدا دی کە لە نووسراوەکانی مامۆستا شێخ محەممەد وەسیمن و، نووسینیان لەم دەرفەتەدا لە جێی خۆی دایە:[1]

یقول عند القراءة:

أقَرأُ عن النبيين سيَّما سيدهم نبينا محمد صلى الله عليه وسلم، وأمم إجابتهم سيما سالفي الأمة المرحومة، الأفضل فالأفضل عند الله، والأحب فالأحبِّ الى رسول الله، والأقرب فالأقرب إليه فإلينا، وأوجبهم حقاً علينا سيما والدينا وأهلينا وأحبائنا. اللهم تقبل منهم ومنا.

وعند إردة الغرس: أغرسُ عن النبيين... الخ. وعند التصدق أتصدقُ... الخ من افادة الشيخ محمد وسيم تغمده الله بغفرانه.

## دەبێ ئەم پارچە شیعرە شیعری نالی بێت؟

٤٤٨

کاتێک لە گەشتێکی لەسەرخۆدا بەگولزاری ڕەنگینی کەشکۆلی (شێخی حیسامەدین)دا دەگەڕام چەند پارچە شیعرێکی شاعیری مەزنی کورد (نالی)م بینی، هێنامن ورده ورده لەگەڵ دیوانە چاپەکەدا بەراوردم کردن، هەموویان لەگەڵ هەندێک جیاوازیی -کەم و زۆر-دا لە چاپەکەدا هەبوون، یەک پارچە نەبێت کە لەسەری نووسراوە: (نالی) و لە دیوانەکەدا نەمدۆزییەوە.

(١) بەلام لێم ڕوون نییە کام لەو دوو مامۆستا شێخ محەممەد وەسیمەیە، یەکەم یان دووەم؟

ئەم پارچە شیعرە لەوە دەچێت لە بۆنە و موناسەبەیەکی تایبەتی و دیاریی و ناسراوی ئەو سەردەمەدا گوترابێت، بەڵام بەداخەوە لە دەستخەتەکەدا هیچی دەربارە ڕوون نەکراوەتەوە و، ئێمەیش هیچی لێ نازانین و، پارچە شیعرەکەیش هەر ئەو نوسخەیان دیوە کە لە دەستخەتی ناوبراودایە، جا بۆ ئەوەی ئەم پارچە شیعرەیش بناسرێت و بکەوێتە بەرگوێ و چاوان و، ئەگەر لوا جارێکی دی دیوانی نالی چاپکرایەوە ئەم پارچە شیعرەیش جێگەی خۆی بگرێت... لەم دەرفەتەدا بڵاوی دەکەینەوە و هیچی لەسەر نانووسین و ڕایشی دەربارە دەرنابڕین، بەڵکو نوسخەی دیی دەربکەوێت و باشتر ڕوون ببێتەوە کە هی کێیە و چۆن و بۆچی گوتراوە.

نالی

ئەی زومرەیی خاریجە سەرم بێ بە فیداتان
بۆ غیرەت و بۆ هیممەت و بۆ شەرط و وەفتان
بێفایدەیە لافی عەجەم، بۆچی کە ئێوە
کاری سەری صەد نێزە دەکا زەخمی نیگاتان
گەر لەشکری ئینگلیسە و گەر فەوجی عورووسە
صاحێب ظەفەرن «صەد قەل و بەردێک»ە لەلاتان
ئیمامی عەلییە یاوەری ئەم فەوجە غەریبە
سەرهەنگی عومەر، حەزرەت سەرتیپ و سوپاتان
دەک من بە فیدای یاوەر و سەرعەسکەری وابم
قوربانی سەر و گەردن و سەرهەنگی وەهاتان
سستیی مەکەن ئەی مەجمەعی ئەصحابی هیدایەت
یارەب لەمنی خەستە کەوێ تیری قەزاتان
خاڵین لە خەلەل هەریەکە مومتاز و ڕەشیدن
ئەهلی عولەما و حاجی و ئەصنافی گەداتان
شێری ظەفەری دەوڵەت و ئەربابی نەجاتن
دانە و گوهەری ڕۆمن و ئێرانە بەهاتان
پەردەی دڵی دوشمن دەدڕێ هەیبەتی ئێوە
تێغی عومەر و خەنجەری خوێنڕێزی جەفاتان

شــەمــعی دڵی ویرانەی هەر مــوئمــینە، ئەمما
بەرهەمــزەنی ئیــمــانی جــوە بەرقی صــەداتان
چون ئەو کــچــە زۆر طالیــبــە بۆ دینی مــحــەممەد
دەس هەڵمــەگــرن، غــیــرەتە، ئێــوە بن و خــوداتان
کــاری چییــە وا کــەم هونەری، بەهجــەت ئەفــەندی!
شــابەندەری کــوونیی قــەرەچی پف لە حــەیاتان
عــەیبی نیــیــە وا تەجــرەبە کــەن خــێــرە بەدینم
ئەووەڵ بەســەری ئەو دوە شــمــشــیــری غــەزاتان
مــومکین نیــیــە تەعــریفی وەفــاتان بەحــیکایەت
خــاریجــە لە تەحــریری قــەڵەم وەصف و ثەناتان
هەرچەند بەجــیــســمــانیی ئەمن غــایبم، ئەمما
بەخــودا دڵەکــەم ثابیــتــە هەر لەحظە لە لاتان

## شێخ ڕەزا و وەسمان پاشا

٤٤٩

گەلێ جار گوتوومە و نووسیومە و دەیشلێمەوە: هەرگیز لەوانە نەبووە و نییە کە بزانین چەندێ بەرهەمی شاعیران و ڕۆشنبیرانمان تێدا چوون و هەواڵێکیان لێ نازانین و، کەم ڕۆژیش هەیە بەڵگەیەکی نوێی ئەم قسەم دەست نەکەوێت.

شێخ ڕەزای تاڵەبانیی کە لە شاعیرە کۆنەکانمان ناژمێررێت و، کەم شاعیریشمان هەیە شیعرەکانی وەک ئەو بەسەر زاری مەلا و ڕۆشنبیر و ڕەشە خەڵکەکەوە بووبێت و، کۆڕ و کۆمەڵی پێ ڕازابێتەوە، هەروەها کەم لە شاعیرانیشمان هەیە بۆی لوابێت وەک ئەو بایەخ بەدیوانەکــەی بدرێت و، بەئەندازەی ئەو زانا و شــارەزا و ڕۆشنبــیــری لێــهــاتوو بۆی داهاتبێتەوە و، لێکۆڵینەوەی لەسەر کردبێت... کەچی دەبینین گەلێ جار هێشتا دیوانەکە -واتە چاپە نوێکە-ی لە چاپخانەدایە لەپڕ لەمەلاو لەولاوە پارچە شیعری بڵاونەکراوە و، باس و خواستی نەبیستراو سەرهەڵدەدەن و، جارێکی دیکە دەسەلمێتەوە کە هێشتا دوا قۆناغی کۆکردنەوەی سەرجەمی شیعرەکانی شێخ ڕەزا - ئەگەر لەوانە بێت لێکۆڵەرەوان بیگەنێ - دوورە و زۆری بەبەرەوە ماوە.

جا ئەمە بۆ شێخ ڕەزایەک بێت کە ئەوە حاڵیەتی دەبێ بۆ شاعیرێکی کۆنی دوورە دەستی بۆ نەلوا و کە بناسرێت حاڵی چی بێت؟

ماوەیەکی زۆر نەبوو لە جوغزی باسی شێخ ڕەزا و بەرهەمی دوورکەوتبوومەوە، لابەلای ماموستایەک دەستخەتێکم دی کە ساڵی ١٣٠٩ک نووسراوەتەوە، ماموستای نووسەرەوەی دەستخەتەکە لە سەرەتای دەستخەتەکەوە -وەک گەلێ لە ماموستایانی ئەدەبدۆستمان - چەند تاک و پارچە شیعری جیاوازی ئەم و ئەوی نووسیوەتەوە.

لەناو ئەو پارچە شیعرانەدا ناونیشانێک سەرنجی ڕاکێشام کە نووسراوە: (شیخ رەضا بعثمان پاشا نوشتە) واتە: شێخ ڕەزا بۆ وەسمان پاشای نووسیوە.

دوای ئەم ناونیشانە پارچەیەک شیعری نووسیوە کە لە دیوانە چاپەکاندا هەیە، بەڵام لە چاپەکاندا سێ بەیتە و لە دەستخەتەکەدا چوار. لە دوای ئەوەیشەوە نووسراوە: (درجواب) واتە: لە وەڵامیدا، کە دەبێ شیعری وەسمان پاشا بێت و وەڵامی شێخ ڕەزای پێدابێتەوە.

ئەم ناونیشان و شیعر و باسانە سەرلەبەر ئەوەی کە تا ئێستە دەربارەی ئەم شیعرەی شێخ ڕەزا نووسراوە هەڵدەوەشێننەوە و، چەند مەبەستی تازە دێننە کایە وەک:

یەکەم: د. موکەڕەم تاڵەبانی دەڵێ: «جارێ خانم - واتە عادیلە خانمی خێزانی وەسمان پاشای جاف - گفت دەداتە شێخ ڕەزا کە هێسترێکی بۆ بنێرێت. بەڵام هێستر لە پێش ناردنی دەتۆپێت. دەیەوێت سەر بنێتە سەر شێخ ڕەزا و لێی دەپرسێت ئایا هێستری زیندووی دەوێت یان هێسترە مردووەکە، شێخ ڕەزا بەم شیعرە وەڵامی دەداتەوە:»(١)

ئەم هۆی وتنەوەی د. موکەڕەم سەرانسەر پێچەوانەی ناونیشانەکەیە و، لەوێ دەڵێ: شێخ ڕەزا بۆ وەسمان پاشای نووسیوە.

دووەم: وا دیارە بەیتی یەکەمی ئەم پارچە شیعرە ساغ نەکراوەتەوە و، تا ئێستە بەهەڵە بەسەر هەموو ئەوانەدا ڕۆیشتووە کە خەریکی لێکۆڵینەوەی دیوانی شێخ ڕەزا بوون؛ چونکە ئەوان نووسیویانە:

ئێستری زیندوو، بڵێم بۆم چاکە، یا مردووم دەوێ
ئیحتیاجیم زۆرە (خانم) با بڵێم: هەردووم دەوێ

جارێ دارشتنی نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە ڕووی زمانەوە زۆر لاوازە؛ چونکە کورد کەرەستە و ئامراز و دەستەواژە و ڕستەی تایبەتی خۆی بۆ گەلێ ناو و شوێن و کەس

(١) بڕوانە: شێخ ڕەزای تاڵەباتی، د. موکەڕەم تاڵەبانی. دەزگای ئاراس، ٢٠٠١، ل: ١٣٣.

هەیە، هەریەکەیان لە شوێنی خۆیدا بۆ کەس و جێگەی خۆی بەکاردێنێت و، لەوە دەرچوو لە ڕێبازی زمانی کوردی دەردەچێت و نادروست دەبێت.

بۆ نموونە کورد بۆ مرۆڤ کە گیانی سپارد (مردوو) بەکاردێنێت. بۆ گیانلەبەر -چوارپێ و پەلەوەر-ی گۆشتخوراو کە سەرنەبڕێت و بەچەقۆدا نەگەیەت (مردارەوەبوو) بەکاردێنێت. بەڵام بۆ ئەو گیانلەبەرانەی گۆشتیان ناخورێت وەک: سەگ و، بەراز و، ورچ و، گورگ و، کەر و، هێستر و... تاد (تۆپیو) بەکاردێنێت. جا بڕوا دەکرێت شێخ ڕەزای بلیمەت ئەوەندە نەشارەزای زمانی کوردی بێت بڵێت (هێستری مردوو!)؟

دوای ئەمەیش دەبێ هێستری تۆپیو بەکەڵکی چی بێت تا شێخ ڕەزا بڵێت هەردووکیان -زیندوو تۆپیو-م دەوێت؟! لە کوردەواریدا کەر و هێستری تۆپیو نموونەی لاشەی بێ سوود و کەڵکن و، کە نموونە بەیەکێکی ڕژد و چرووک بێننەوە، دەڵێن: بۆ کەری تۆپیو دەگەڕێ ناڵەکەی بکێشێتەوە!

ئەی ئەمە لە چییەوە هاتووە؟ بەگوێرەی ئەو دەقەی لەبەر دەستی منداییە ئەوانەی پێشتر خەریکی دیوانی شێخ ڕەزا بوون لەم بەیتەدا دوو وشەیان بۆ نەخوێنراوەتەوەوە و بەئارەزووی خۆیان (زیندوو) و (مردوو)یان لە شوێن داناون و، مانای بەیتەکەیان تووشی ئاڵۆزیی و سەردەرگومیی کردووە و، وشەکانیش وەک لە دەقی شیعرەکاندا نووسیم (ڕەند) و (دەیلەم)ن، واتە: شێخ ڕەزا دەڵێ: هەر هێستر بێت ئیتر ئەگەر تۆڕ و ڕەند و گورج و تازەگیراو بێت، یان دەیلەم و باریی و لۆسە و پەککەوتوویش بێت، چونکە ئیحتیاجییم زۆرە هەر دەمەوێت. دوای ئەمەیش دەبێ ئەوەیش لەبیر نەکەین کە وشەی (خانم)یش بەناڕەوا خراوەتە ناو بەیتەکە و، باری بۆنەکەی پێ ڕاستکراوەتەوە.

بەسەر ئەوەیشدا ناڕۆم خۆشبەختانە پارچەیەکی دیکە شیعری شێخ ڕەزام بەزمانی فارسی دۆزیوەتەوە، کە بۆ وەسمان پاشای نووسیوە و تا ئێستە بڵاونەکراوەتەوە و، ئامادەم کردووە بۆ بڵاوکردنەوەی، بەڵام ئەویان وەڵامی وەسمان پاشای لەگەڵدا نییە.

## شیخ رضا بعثمان پاشا نوشته

ئێستری ڕەند و دەیلەم بۆم چاکە هەردووم دەوێ[١]
ئیحتیاجم زۆرە ڕاستت پێ بڵێم هەردووم دەوێ
بێچوەکانم سەر لە صبحەینێ هەموو دەورم دەدەن
یەک دەڵێ: پارەم نەماوە. یەک دەڵێ: بێچووم دەوێ
با وجوودی ئەو هەموو تەکلیفە (کرری)[٢] کردووم
کوڕ خەیاڵی ژن دەکات و، کچ دەڵێ: من شووم دەوێ
ڕای خۆمم من دا بەدەستی بەخشش و ئیحسانی تۆ
هەرچە تۆ بینیرێ بۆم ئەو چاکە ئەمما زووم دەوێ

در جواب

بۆ کچێکی طالیبی شوو وەختە لەتلەتبێ دڵم
ئیحتیاجم زۆرە یا شێخ وەک کونی موورووم دەوێ
چونکە باڵا بەرز و شیرین تەرز و ڕەعنا کچ نییە
موشتەریی خۆمم وەلێ بێمەصرەف و دەرچووم دەوێ
هەر وەکوو بیستوومە ڕەنگی ڕەنگی ئینسانی نییە
هەر چلۆنێ بێ ظەریفە چونکە بۆ (دەم دووم) دەوێ
من قەبووڵم ناشیرین بێ، وەک کونی موورووش نەبێ
تۆ بەئیحسان بۆم بنێرە من وەکوو کەندووم دەوێ
ڕەنگی جلق و، لووتی فلق و، چاونەشۆریش بێ ڕەزام!
تەرکی عەقڵە گەر بڵێم: هەر خاڵوچاوڕشتووم دەوێ
بۆ عیلاجی سەردەمی زستان، وەک گەلاجا تێخزێم
بان تەپی و، دیوار رزیی و، بێ دار و بێ پەردووم دەوێ
چونکی ئاغا بووم لەمەوپێش ئێستەکێ کەوتوومەوە
من بەزاوای خۆت قەبووڵکە، قەت مەڵێ: باربووم دەوێ!

---

(١) ئەم نیوە بەیتە بەم شێوەیش هێشتا لەنگە.

(٢) ئەم وشەم بەدروستیی بۆ نەخوێنرایەوە وەک خۆی ڕوونووسم کرد، لەوانەیە (کەڕی) بێت.

## (گوڵزار)ی ئەمین یومنی

٤٥٠

ئەمین یومنی بەیەکێک لە شاعیرە هەڵکەوتووەکانی سەردەمی خۆی دەناسرێت و، بلیمەت و زانایەکی کەموێنەی چەرخی خۆی بووە، زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی و فەرەنسی - سەرەڕای زمانی زکماکی خۆی کوردی - زانیوە.

لە ئەدەبی فارسی و تورکیدا دەستی باڵای هەبووە، شایەتیی ئەمین زەکی بۆ ئەو لەسەر ئەوەی کە دیوانی (حافظ)ی کردووە بەپێنج خشتەکیی بەجۆرێک کە کەس نەیتوانیوە وەک ئەو بیکات، بەسە بۆ پایەبڵندیی لە زمانی فارسیی و شارەزایی و توانای لەو ئەدەبەدا. ئەم مامۆستا بەڕێزە گەلێ دانراوی هەبووە تەنها پێنج خشتەکییەکەی دیوانی (حافظ)ی ساڵی ١٣٣٩ لە ئەستەمبوڵ بە ٨٦٥ لاپەڕە چاپکراوە.

دانراوەکانی دی بەزۆری هەر ناویان هەیە و ئەمین زەکی دەفەرموێ:

- دوای ئەوەی ناوی هەندێ لە دانراوەکانی بەتورکی و فارسی دەنووسێ- شوێنەواری دیشی بەزمانەکانی عەرەبی و فارسی و کوردی و تورکی هەیە نە توانیمان بیانبینین، نە توانیمان ناویان بزانین. لە چاوی ئەم قسەی مامۆستای خوالێخۆشبووەوە دەڵێم: خۆشبەختانە من بۆم لوا هەواڵی یەکێک لە دانراوە فارسییەکانی مامۆستا ئەمین یومنیی بزانم و بیشیبینم و، هەلم بۆ ڕەخسا بەمێژووی ئەدەب و زانایانی کوردی بناسێنم.

باسێکی دەستخەتەکە:

ئەم دەستخەتە لە بنەڕەتدا ١٦٦ لاپەڕە بووە، بەڵام بەردەستی نەفام و منداڵ و نەزان و قەدرنەزانی شتی وا کەوتووە و بایەخی نەدراوەتێ و، بەقەڵەم یاریی منداڵانەی تێدا کراوە و، لێی کووژێنراوەتەوە و لێی لەناوبراوە، بەوبۆنەوە لە سەرەتاوە ٣١ لاپەڕەی لێ لەناوچووە، ئەوەی کە ماوە لە لاپەڕە (٣٢)وە دەستپێدەکات و، بەم جۆرە پێشەکیی و سەرەتای دانەر لەناوچووە کە دەکرا سوودی باشیان لێ وەربگیرێت.

بەوە باشە کە دانەر لە کۆتاییەوە هەندێ زانیاریی بەسوودی بۆ تۆمارکردووین کە دەڵێ:

ز هجرت هزار و دویست و دو میم
چهار دگر نیز باوش ضمیم
شب چهار شنبه ز شعبان دوح
یکی الف کمتر ازان هر دوح

کە پایان رسانیدم این داستان
بماند مرا یادگار از جهان
چو هر بیت او گشته همچون گلی
دل عالمیرا کند بلبلی
بـ(گلزار یمنی)ش کردیم نام
بسی رنج بردیم با اهتمام
بگلزار من گل شکفته هزار
هزار دگر نیز و نیم از هزار
کە چون بو کنی هر گلی را ازو
مفرح ببخشد بقلب تو بو
بەبیچارە (یمنی) بکردید یار

...........................

واتە: شەوی چوار شەمەی پازدەی شەعبانی ساڵی ١٢٨٤ ئەم داستانەم تەواو کرد تا بەیادگار لە جێهاندا بۆم بمێنێتەوە. چونکە هەر بەیتێکی وەک گوڵێک وایە و دڵی زانا وەک بولبولی لێ دێت بۆی... ناومنا (گوڵزاری یومنی) گەلێ ڕەنجم لەتەکدا کێشا و بایەخم پێدا، تا گوڵزارەکەم ٢٥٠٠ گوڵی تیا شکوفت. کە هەر هەر گوڵێکی بۆنکەیت جۆرە خۆشییەک بەدڵت دەبەخشێ.

بۆ ئەوەیش کە خوێنەر لە ناوەرۆکی ئەم گوڵزارە ئاگادار بکەین لەو شوێنەوە کە ماوە، ناوەرۆکەکەی، وەک مامۆستا یومنیی خۆی سەرباسی بۆ داناوە، تۆمار دەکەین:

٣٣- در چگونگی آغاز داستان می باشد

لەم سەرەتادا باسی ئەوە دەکات کە دەیەوێ یادگارێکی پوختی بێ قسەی پووچ و بێ بایەخ دوای خۆی بەجێ بێلێت و، چووە بۆ (قسطنطینیە) و کتێبەکەی پێشکەشی سوڵتان عەبدولعەزیز کردووە. کتێبەکەی کردووە بەپێنج بەشەوە.

٣٥- در مدح سلطان دوران عبدالعزیز خان خلدالله ملکه

٣٧- در مدح شهزادەء عالي تبار یوسف عزالدین

٣٩- در مدح حضرت صدارتپناهی

٤٠- در مدح ناظر خارجیە محمد فؤاد پاشا

١٠٢- باب سيم در آموختن كسب و معرفت.

١٠٢- حكايت

١١٧- حكايت

١٢١- حكايت

١٢٧- حكايت

١٢٩- حكايت

١٣٠- حكايت

١٣١- حكايت

١٣٢- حكايت

١٣٤- حكايت

١٣٨- حكايت

١٤٣- حكايت

١٤٦- حكايت

١٤٩- حكايت

١٥١- روايت

١٥٤- حكايت

١٥٥- حكايت

١٥٦- حكايت

لە (١٥٧ەوە تا ١٦٣) کەوتووە.

١٦٠- در بيان حال مصنف واستغفار وختم كتاب

ماوەتەوە ئەوەی کە بڵێین ئەم دەستخەتە بێناز کەوتووە نوسخەی دانەرە و بەخەتی خۆیەتی و، لەم دەستخەتەیشەوە دەردەکەوێت کە ماموٚستا یومنیی لەتەک ئەوەدا شاعیرێکی گەورە بووە، خەتخۆشێکی کارامەیش بووە و، خۆشنووسیی ئەو زیاتر لە نووسینی سەرباس و ناونیشانەکاندا دەردەکەوێت.

ئەوەیش کە هەرگیز نابێ لەبیری بکەم ئەوەیە کە ئەم دەستخەتەم لەلای برای بەڕێزم ماموٚستا ئیسماعیل کەریم مستەفا سپیندارەیی بینیی و ماوەی ئەوەی دام ئەم دەستخەتەیش بەدەستخەتخانەی کوردیی بناسێنم.

## چەند زانیارییەکی مێژوویی لە دەستخەتێکدا

### ٤٥١

چەند جار لەمەوپێش بابەتی مێژووییم دەستکەوتووە و، هەر بابەتێکیشم دەستکەوتووە زۆر لێی نەوەستاوم و، چاوەڕێی ئەوەم نەکردووە هەموو بابەتەکان یەک بخەم و بەراوردیان بکەم و پوختەکەیان بڵاوبکەمەوە؛ چونکە ترسی تێداچوون و لەناوچوونیانم لەچاو گرتووە. ئەم جارەیش بەبابەتێکی نوێوە دێمەوە ئەم بوارە و کۆمەڵێک ڕووداوی مێژوویی جۆراوجۆر دەخەمە پاڵ بابەتەکانی دی، تا بزانین ئەنجام دەگەینە چیی و چیی دیمان دەست دەکەوێت.

لەم هەلەدا ئەوەندە دەڵێم: بابەتەکان بەزمانی فارسیین و، هەندێکیان پێوەندییان بەمێژووی کورد و ناودارانی کوردەوە نییە و، سوودێکی ئەوتۆیان لێ وەرناگیرێت، بەڵام من ئەوانەیشم لەتەک بابەتە سەر بەکوردەکەدا کرد بەکوردیی و هەموویانم بەو زنجیرەی کە مامۆستای نووسەرەوە نووسیویەتی، نووسی.

باسێکی کورتی دەستخەتەکە:

دەستخەتەکە پاشماوەی بەیاضێکی کۆنە سەرەتا و کۆتایی نەماوە و، ئەوەی کە لە دەستدایە (٣٥) لاپەڕەیە، لاپەڕەی هەشت بەیت شیعر و زیاتر و کەمتری تێدایە، شیعرەکان بەزۆریی فارسیین، هەندێکیان شوێنەواری مامۆستایانی کوردن. کورتەی ناوەڕۆکەکەی ئاوایە:

لەلاپەڕە (٣)دا سێ بەیتی کوردی هەیە لەسەریان نووسراوە گۆرانی کە ئەمانەن:

دەردەزان زانۆ حاڵ دەرد چێشەن[١]
بێ دەرد (هلفکر!)[٢] بێدەردیی وێشەن
ئێمە و دەماوەند شەرتێکمان کەردەن
هەر ئەو تەم من غەم تاوەڕۆی مەردەن[٣]

---

(١) ئەم نیوە بەیتە لەنگ و ناتەواوە و ڕەنگە تەواوییەکەی ئاوا بووبێت: دەردەزان زانۆ..

(٢) ئەمەیشم بەڕێنووسی دەستخەتەکە نووسی، لەوانەیە (هەر لە فکر) بێت.

(٣) ئەم نیوە بەیتە لە شیعری شاعیرانی دیکەیشدا هەیە بەڵام بەم شێوە:

من و دەماوەند عەهدێکمان کەردەن
من غەم و ئەو تەم تا وەڕۆی مەردەن

دڵی من بیـــەن وه کـوتەی قـەصـاب
هەر هێند زام دارۆ نەدارۆ حـیـســاب

دوای ئەمـانە بەزۆریی چوار خشـتـەكیی و تاكی شیـعری فـارسی جۆراوجۆری تێـدایە، لاپەڕەكـانی (٩ و ١١ و ١٢ و ١٣ و ١٤ و ١٥) ئەو بابەتە مـێژوویـیانەیان لەخۆگـرتووە كە لێرەدا دەیاننووسین.

لە لاپەڕە (١٠)دا پارچەیەک شیعری بێ نوختەی شاعیرێكی تێدایە بەناوی (خاكسار) پارچە شیعرەكەی لە ستایشی پاشای ڕەواندزدا نووسیوە.

لاپەڕە (١٦)یش دوو پارچە شیعری فارسی خاكساری تێدایە. تا لاپەڕە (٢٥) شیعر و بابەتی جـۆراوجـۆری تێــدایە، لەو لاپەڕەدا لە شـوێنێكیــدا دەڵێ: كـوڕی پێنەچیی نووسیویەتیەوە لە ساڵی (١٢٦٠)دا.

لە لاپەڕە (٢٦)دا نـامـەیەكی فـارسی نووسـراوە لەسـەری نووسـراوە كـە وەڵامی نامـەی میرزا عەبدولوەهابی (منشي المماليک)ە لە ئینشا و نووسینی جەنابی مەولانا خالید.

دوای ئەم نامـە تا كـۆتایی دەسـتـخەتەكە كە لاپەڕە (٣٥)ە بەچوار خـشـتـەكی و تاكـە شیعری فارسی دەڕوات و، ئیتر دەستخەتەكە بەناتەواوی تەواو دەبێت.

### چەند زانیارییەكی مێژوویی:

* مـێـژووی هاتنی ئەمـیـر نیظام بۆ لاجان و گـرفـتـاربوونی پادشـای ڕەواندوز بەدەسـتی ڕۆمییان ١٢٥٢.
* مێژووی دانیشتنی شا لە تاران ١٢٥٢.
* مێژووی سەفەری محەمەد شا بۆ هەرات ١٢٥٣.
* مێژووی مردنی سوڵتان مەحموود و دانیشتنی[٤] سوڵتان عەبدولمەجید خانی كوڕی لە جێگەی ئەو ١٢٥٥.
* مێژووی مـردنی سولەیمان پادشـای سلێمـانی و دانیـشـتنی ئەحمەد پاشای كـوڕی خودا تەمەنی درێژ بكات ١٢٥٥.
* كـوژرانی عـەباس ئاغـای دیبـوكری بەدەستی عـەبدوڵڵا خـانی مـوكریی سـتـەمكار ڕۆژی چوارشەممەی ١٦ ر ١٢٥٦.

(٤) واتە: دانیشتنی لەسەر كورسی دەستەڵات.

* لە کار خستنی عەلی پاشای وەزیری بەغدا و دانیشتنی نەجیب پاشا لە وەزارەتی بەغدا ٦ ش ١٢٠٨.
* مردنی محەمەد پاشای ئینجە بەیرەقداری فەرمانڕەوای موسڵ کۆتایی مانگی ذیلحەجە ١٢٥٦ (یان ١٢٥٩).
* کوێرکردنی بوداق خان ١٢٠٤.
* مێژووی چاوەقووڵەی یەکەم لە ئەربیل ١٢٤٣.
* چاوەقووڵەی دووەم لە ئەربیل ٦ ن ساڵی ١٢٤٦.
* دانیشتنی نادر شاه ١١٤٨.
* دانیشتنی شاه طەهماس ٩٣٤.
* دانیشتنی شاه محەمەد سوڵتان ٩٥٥.
* دانیشتنی شاه ئیسماعیلی دووەم ٩٨٤.
* دانیشتنی شاه عەباس ٩٨٧.
* دانیشتنی شاه صەفی ١٠٣١.
* دانیشتنی شاه عەباسی دووەم ١٠٥٣.
* دانیشتنی شاه سولەیمان ١٠٧٩
* دانیشتنی شاه سوڵتان حسەین ١١٠٥.
* کوژرانی نادر شا و دانیشتنی عادل [یان عەلی] شا ١١٦٠.
* ونبوونی ئیبراهیم شا ١١٦٢.
* شکانی حەسەن عەلی خان لە مەریوان ١١٦٣.
* کوژرانی ئەو ؟ ١١٤٦.
* کوژرانی محەمەد خانی سوڵتانی بانە ١١٤٣.
* کوژرانی محەمەد عەلی سوڵتان ١١٦٨.
* کوژرانی سوبحانوێردی خان ١١٤٨.
* هاتنی شێخ عەلی خان و شکستی محەمەد پاشا ١١٧٢.
* مردنی کەریم خان ١١٩٣.
* شکستی ذولفەقار عەلی مورادخان، هاتنی نەصروڵلا میرزا ١١٥٨.

* کوژرانی عەباس قولی خان بەدەستی! ١١٨٨.
* عوثمان پاشا! ١١٩٨.
* کەوتن و مردنی عەلی مورادخان ١١٩٩(٥).
* جەنگکردنی خەسرەوخان لەگەڵ ئەڵلا قولی خاندا و کوژرانی ئەڵلا قولی ١١٩٩.
* شکستی عەلی مورادخان ١١٥٨.
* هاتنی شەفیع خان ١١٨٤.
* کوژرانی ئاغا محەمەد خان ١٢١١.
* گرتنی کرمان بەدەستی ئاغا محەمەد ١٢١٩.
* گرتنی ئەصفەهان ١١٣٣.
* فەتحی -ڕزگارکردنی- قوسطەنطەنییە ٨٥١.
* گرتنی هەمەدان ١١٣٤.
* گرتنی بەغدا لە لایەنی هۆلاکۆ خانەوە ٦٥٤.
* ڕووخانی تۆپاڵ پاشا ١١٦٦.
* شکستی (یکان) محەمەد پاشا ١١٥٨.
* شکستی ئەحمەد پاشای (دینە!) ١١٣٩.
* کوژرانی عوثمان پاشا و قۆچ! کۆر ١١٤٤.
* کوژرانی سەلیم پاشای بەبە ١١٧١.
* کوژرانی محەمەد پاشای خانە پاشا ١١٧٥.
* مردنی ئەحمەد پاشای بەبە ١١٩٢.
* کوژرانی محەمەد پاشا و عومەر پاشای برای لە مانگی ڕەمەزان و زیندانی کردنی ئەحمەد پاشا بەدەستی محەمەد پاشا ١١٩٢.
* کوژرانی خانە پاشا و هاتنی سلێمان پاشای وەزیری بەغدا بۆ سەر مەحموود پاشا و ئاشتبوونەوە ١١٨٧.
* لە کارخرانی مەحموود پاشا لە یەکی مانگی ڕەجەبی ١١٤٢دا.
* بەحاکمبوونی ئیبراهیم پاشا لە مانگی ڕەجەبدا ١١٩٧.

---

(٥) لێرەدا هەندێک تێکەڵاوی لە مێژووەکاندا هەیە.

* کوژرانی مەحموود پاشا لە دەوروبەری سابڵاغ ١١٩٧.
* کوژرانی خالید پاشای بەبە لە شاری موسڵ ١١٩٨.
* بەحاکمبوونی عەبدوڕەحمان پاشا سەرەتای مانگی ڕەمەزان ١١٢٤[٦].
* بەحاکمبوونی عوثمان پاشای بەبە لە مانگی ڕەجەبی ١١٢١.
* هاتنی ئەحمەد پاشای وەزیری بەغدا بۆ سەر سەلیم پاشا لە سرووچک ١١٠٦.
* چوونی سولەیمان پاشای والی بەغدا بۆ سەر تەمر پاشای مللی ١٢٠٥.
* چاوەقووڵەی گەورە ١١٠٠.
* شکستی سلێمان بەگی بەبە ١١١٠.
* تالآنی بانە بەدەستی حەسەن بەگ ١١٤٦.
* کوژرانی شیرە بەگی برای سەلیم پاشای بەبە ١١٧٢.
* چاوەقووڵەی بچووک ١١٧١.
* سووتاندنی شارۆچکەی بانە بەدەستی خدر ئاغا ١١٧٤.
* ڕووخان و وێرانبوونی تەبرێز بەبوومەلەرزە ١١٩٦.
* چاوەقووڵەی دوایی ١١٨٧.
* داچوونی کاشان ١١٩٣.
* کوژرانی باپیر ئاغا و خزمانی لە شاری مەراغە لە یەکی مانگی سەفەری ١١٩٨دا.
* شکستی ئەحمەد پاشای وەزیری بەغدا ١١٣٩.
* بەحاکمبوونی مەحموود پاشای کوڕی مەحموود پاشای کۆیە (یان کوێر) ١٢١٤.
* دانیشتنی عەلی پاشای وەزیری بەغدا ١٢١٧.
* مردنی ئیبراهیم پاشای بەبە لە شاری موسڵ ١٢١٧.
* کوشتن و دیلکردنی داسنێ ١٢١٧.
* کوژرانی محەمەد پاشای کۆیە (کورا) بەدەستی عەبدوڕەحمان پاشای بەبە لە دەوروبەری بەغدا ٩ی سەفەری ١٢٢٠.

---

(٦) لە نێوانی ئەم مێژووە و مێژووەکانی پێشەوەیدا تێکەڵی هەیە و، ئەگەر مەبەست لە عەبدوڕەحمان پاشا عەبدوڕەحمان پاشای بابان بێت ئەوە دیارە هەڵەیە.

* شکستی عەبدوڕەحمان پاشای بابان بەدەستی عەلی پاشای وەزیری بەغدا لە دەوروبەری بازیان ١٢٢٠.
* کوژرانی محەمەد عیسا ئاغا لەگەڵ براکانیدا و هەندێ دارودەستەی و عەبدوڵڵا ئاغای غەفوور لەگەڵ براکانی و برازاکەی دوای جەژنی ڕەمەزان ١٢٣٧.
* مێژووی گەچکاریکردنی شوورای کۆیە ١٢٣٥.
* سووتاندنی بازاڕی کۆیە و هاتنی ئیبراهیم خانی فەرمانداری سابڵاغ ١٢٣٦.
* هاتنی جەعفەر قولی خان کوڕی محەمەد پاشای کوڕی خالید لە شاری کۆیسنجەق ١٢٣٧.
* ڕۆیشتنی عەلی پاشای وەزیری بەغدا بۆ سەر سنجار ١٢١٢.
* کوژرانی ئەحمەد بێگی شا درزادە ١٢٢٢.
* کوژرانی عەلی پاشای وەزیر و مردنی سەلیم (ئیسلامبول) ١٢٢٢
* جەنگکردنی عەبدوڕەحمان پاشا لەگەڵ سولەیمان پاشای کەهیەی بەغدا و کوشتنی و گرتنی و بردنی ئەو بۆ (دار السلطنە)ی تاران و بەوەزیربوونی سولەیمان پاشای [خویش!] عەلی پاشا و هاتنی [ریش!][7] ئەفەندی و ڕۆیشتنی عەبدوڕەحمان پاشا بۆ سەر بەغدا و ١٢٢٢.
* گیران و کوژرانی سولەیمان پاشای وەزیر ١٢٢٥.
* مردنی عەبدوڕەحمان پاشا ١٢٢٨.
* ڕاکردنی کەهیای جێگری داود پاشا...[8] لە شارەزوور ١٢٢٦.
* مێژووی (ایچقلە)ی کوێسنجەق ١٢٢٢.
* تاڵانکرانی زەهاو و ڕاکردنی محەمەد پاشای عەجەم ١٢٨٨.
* گەمارۆدانی مووسڵ و گرانی ١٢٥٦.
* مردنی سولەیمان پاشای ئیبراهیم پاشا لە کرماشان ١٢٣٩.
* کوژرانی سولەیمان پاشای بەبە لە قەڵاچوالان بەدەستی فەقێ ئیبراهیمی شێخ بزەینی ...١١٧٧

---

(٧) ئەوانەی نێو کەوانەکانم بۆ ساغنەبووەتەوە.

(٨) لێرەدا وشەیەک هەیە بە (باحیطە) دەچێت.

## پارچە (ملمع)ێکی خاوەن نەزانراو

### ٤٥٢

شیعری تێهەڵکێشکراو -ملمع-[١] لە کۆنەوە لەناو شاعیرانی کورددا باوە و باو بووە و، گەلێ پارچە شیعری لەم جۆرەمان هەیە، کە خاوەنی هەریەکێکیان توانا و شارەزایی خۆی لە ڕووی ئەوەوە چەند زمان دەزانێ... دەردەبڕێ و، ئەوە تۆمار دەکات کە توانای هەیە. بەو زمانانە شیعر بڵێت.

ئەمە بابەتێکە لە ئەدەبی کوردیدا باس و خواستێک هەڵدەگرێت و، تا ئێستەیش -بەدروستیی- نەزانراوە یەکەم کەس لەم بوارەی داوە کێ بووە و، چەند شاعیرمان بەم شێوە شیعریان گوتووە، بۆیە دۆزینەوە و تۆمارکردنی هەر پارچە شیعرێک لەم بابەتەدا یارمەتیدانێک دەبێت بۆ ئەو هەوڵەی لەمەولا بدرێت بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم بابەتە. لەمەوپێش چەند جار شیعری لەم بابەتەم -بۆ یەکەمجار- بڵاوکردووەتەوە و، ئەمجارەیش ئەم پارچە شیعرەم دۆزیبەوە، هەرچەند نازانم خاوەنەکەی کێیە، وەک خۆی و بەرێنووسەکەی خۆی، دەیخەمە پاڵ ئەوانی دیکە، بەڵکو لە داهاتوودا شتی دیکەی دەربارە بزانرێت، یان خاوەنەکەی بناسرێت و بابەتەکەیش بەمە دەوڵەمەندتر ببێت.

باسێکی سەرچاوەکەی:

ئەم پارچە شیعرەم لە دەستخەتی ژمارە (٤٢٥٤٨ د.ع) وەرگرت کە دەستخەتێکی گەورەیە لەسەر شێوەی (بیاض) نووسراوەتەوە بەعەرەبی و، فارسی و، تورکی و، کوردی.

شیعر و بەرهەمی گەلێ لە شاعیرانی بەو زمانانە تێدایە بۆ نموونە شیعری ئەم شاعیرانەی تێدا دەخوێنینەوە:

حافظي شيرازي، عبدالباقي العمري، السيد علي البندنيجي، ابو نواس، ابن ملا مختار، الامام الشافعي، داود پاشا، فضولي، ابن الفارض، الشيخ عثمان الخطيب الموصلي، الامام علي، شجاع كرماني، حزني افندي، فوزي، نسيمي...

جگە لەوانەیش چەند مێژوویەکی تێدایە لەوانە مێژووی تاعوونی بەغدا کە لە ١٠ی دوایی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٤٦دا پەیدابووە و ڕۆژانە ١٥ هەزار کەس مردووە و، لە

---

(١) ملمع: واتە جوانکراو و ڕازێنراوە. بەڵام تێهەڵکێشراو لەبارترە؛ چونکە ڕازاندنەوەکە بەتێهەڵکێشکردنی وشەگەلە لە چەند زمانێک.

کۆتایی مانگی زیلحەجەدا کۆتایی هاتووە. لەم باسەدا بەدرێژی باسی داود پاشا و قاسم پاشا و علی رضا پاشا و چەند کەسی دی دەنووسێ. دوایی دەڵێ: ساڵی ١٢٤٨ عەلی پاشا صولحی لەتەک محەمەد پاشای ڕەواندزدا کرد.

دواتر چەند نامەیەکی مەولانا خالید و وەلامیانی تێدایە. هەروەها شیعری تورکی و فارسی نووسەرەوەی دەستخەتەکەی تێدایە، لە شیعرەکاندا ناوی خۆی نابات.

دواتریش چەند مێژوویەکی تێدایە لەوانە:

* وەفاتی محەمەد پاشای ڕەواندز و گرتنی محمره ١٢٥٣.
* هاتنی (سرخوش) عەلی پاشا.
* ڕۆیشتنی عەلی ڕەضا پاشا بەسەفەری ڕەواندز! ١٢٥١.
* گرتنی (قنطره) ڕەنگە مەبەستی پردێ بێت.١٢٥٢.
* گرتنی ئەربیل. ١٢٥٢.
* مردنی محەمەد ڕەشید پاشا ١٢٥٢.

لە شوێنێکدا دەڵێ ساڵی لە دایکبوونی خاوەنی دەستخەتەکە - کە دەبێ خۆی نووسەرەوەکەیشی بێت - ساڵی ١٢١١ بووە. لەو کاتەدا کە ئەمەی نووسیوە تەمەنی ٣٥ ساڵ بووە . ناوی خضر بووە. دەبێ خضری حەیدەری نەبێت؟

شیعری کوردیی زۆر تێدا نییە، لەوانەیە هەندێک لە خاوەن شیعرەکان، کە شیعرەکانیان بەزمانەکانی دییە، کورد بن. بۆ نموونە شیعری تورکی (حوزنی ئەفەندی) تێدایە، کە شیعری کارێزیی پێ کردووە بەپێنج خشتەکیی. شیعرەکەی کارێزیی کوردییە. بڕوا ناکرێ شاعیرێکی تورک شیعری کوردیی بکا بەپێنج خشتەکیی.

بۆ نووسینەوەی شیعرەکانیش وام بەباشزانی -ئەگەر کرێکارانی چاپخانەی بەدەنگمەوە بێن و بەگوێم بکەن- بەڕێنووسی دەستخەتەکە خۆی -کە ڕێنووسی عەرەبییە- بینووسم و سەر و بۆری بۆ بکەم؛ چونکە چوار زمان تێکەڵاو کراوە و ئەگەر بمانەوێ بەدروستیی بینووسین دەبێ زیاتر لە چوار ڕێنووس بەکاربهێنین، بۆ نموونە وشەگەلی وەک (وبحمرة اللبهاء) و (فلاگرین) کە مەبەستی لە یەکەم ئاڵیی لەبها، لێوەکانە و، مبەستی لە دووهەم گریانە و، ئەگەر بیانخەیتە سەر ڕێنووسی کوردیی دەبێ بنووسێت: (وەبیحومرە تیللەبهاء) و (فەلەئەگریەننە). دیارە ئەمە ئاسان نییە و بەئاسان ناخوێنرێتەوە، بۆیە ئەو کارەمان پەسەند کرد و ئەمیانمان خستە لاوە.

